# زلهێزەکان

## لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە تا کۆتایی جەنگی سارد
## (١٩١٤-١٩٩١)

سامان حسێن ئەحمەد

هەولێر - ٢٠١٢

● **زلهێزەکان له جەنگی یەکەمی جیهانییەوە تا کۆتایی جەنگی سارد (١٩١٤ـ١٩٩١)**

● **نووسین:** سامان حسێن ئەحمەد

● **نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر**

● **بەرگ:** جێگر عەبدولجەبار

● **نرخ:** (٣٠٠٠) دینار

● **چاپی یەکەم:** ٢٠١٢

● **تیراژ:** ١٠٠٠دانه

● **چاپخانه:** چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

● **له بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٥٥١) ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٦٩١)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێڕست

# پێشەکی

مێژووی هاوچەرخی زلهێزەکان بەشێکی زۆر گرنگە لە مێژووی جیهان و یەکێکە لە بابەتە زۆر زیندوو و پڕ بایەخەکان، کە سوودێکی گەورە بە خوێنەر دەبەخشێت، بەتایبەتیش بە خوێندکارانی بەشی مێژوو لە زانکۆکاندا، چونکە ئەم بابەتە و تەواوی ئەو گەشەسەندن و رووداوانەی، کە لە مێژووی ئەو زلهێزانەدا روویان داوە، پەیوەندیی راستەوخۆیان بە مێژووی هاوچەرخی بەشی هەرە زۆری گەلانی جیهانەوە هەیە و لە نێویشیاندا گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە کوردیشەوە. هەر بۆیە خوێندنەوە و بە ئاگایی لەم بابەتەدا رێخۆشکەر و یارمەتیدەرێکی باش دەبێت بۆ خوێنەر تا بتوانێت لە تەواوی کایەکانی مێژووی هاوچەرخی بەشی هەرە زۆری گەلانی جیهان و ناوچەکە و کورد تێبگات، ئەمە جگە لەوەی کە تێگەیشتن لەم بابەتە وشیارییەکی باش بۆ تێگەیشتن لە رووداوەکانی سەردەم و هێزە شاراوەکانی پشت ئەو رووداوانە دەبەخشێت و ئاستی وشیاریی مێژوویی سیاسیی فراوان دەکات.

لەم سۆنگەیەوە بیرۆکەی نووسینی ئەم بابەتە دەرکەوتووە و لێرەوە هەوڵمان داوە ئەم بابەتە لەبارەی مێژووی زلهێزەکانەوە بنووسین، تا بتوانین کەلێنێکی بچووك لە کەلێنەکانی کتێبخانەی کوردی لەم بوارەدا پڕ بکەینەوە و بەدیوێکی تریشدا کەرەستەیەك لەبارەی ئەم قۆناغەی مێژووی هاوچەرخی جیهانەوە بەردەستی خوێندکارانی بەشی مێژووی زانکۆکانی کوردستان بخەین و بەم کارەشمان بەشێك لەو کەموکوڕییانە پڕ بکەینەوە کە خوێندکارانی ئەم بەشە لەبارەی کەمی سەرچاوە بە زمانی کوردییەوە هەیانە. کەواتە بەشێکی زۆری مەبەستی ئێمە لەم کارەدا لێرەوە سەرچاوەی گرتووە، هەر بۆیە کارەکەمان زیاتر لە شێوەی گێڕانەوەی رووداوەکاندا دەردەکەوێت نەك شیکردنەوە و لێکدانەوەی مێژوویی، مەبەستی سەرەکیش لەم کارە خستنەڕووی پوختەیەکی زۆر کورتی مێژووی سیاسیی وڵاتە زلهێزەکانە لەو سەردەمە مێژووییەدا، کەمتر بەناخی پەیوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکاندا رۆچووینە.

بەشێوەیەکی گشتی بابەتەکانی ئەم کتێبە بەسەر حەوت بەشی سەرەکیدا دابەش کراوە، بەم جۆرە:

لە بەشی یەکەمدا باس لە بارودۆخی جیهان و زلهێزەکان کراوە بەر لە جەنگی یەکەمی جیهان و لەو رووەشەوە باسی هۆکارەکان و چۆنێتی دەرکەوتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و دواتریش رووداوەکانی جەنگمان باس کردووە. لە بەشی دووەمیشدا چووینەتە سەر باسی کۆنگرەی ئاشتی و کۆمەڵەی گەلان، کە تیایدا بەشێوەیەکی قۆناغبەند باس لە هەنگاوەکانی کۆنگرە و پەیماننامەکان و بەشێکی زۆر لە بەندەکانی کراوە، دوای ئەوەش وردەکاری لەسەر کۆمەڵەی گەلان و ئەرك و ئامانج و دەزگا جیاجیاکانی کراوە. بەشی سێیەمی ئەم کتێبەش تایبەتە بە روونکردنەوەی بارودۆخی زلهێزەکان لە نێوان هەردوو جەنگی یەکەمی جیهان و دووەمدا، لەوێدا بە جیا باس لە بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی هەریەك لە زلهێزەکانی ئەو سەردەمە کراوە و هەر لەم بەشەشدا ئاماژە بە قەیرانی دارایی ساڵی ١٩٢٩ کراوە و شیکراوەتەوە. بەشی چوارەمی کارەکەش بۆ قەیرانەکانی بەر لە جەنگی دووەمی جیهان تەرخانکراوە و لەمیانەیدا هەریەك لە قەیرانی مەنشوریا و هێرشی ئیتالیا بۆ سەر حەبەشە و پەلهاوێژییەکانی ئەڵمانیا روونکراوەتەوە و دوای ئەویش باسی جەنگی نێوخۆیی ئیسپانیا و کاریگەرییەکانی لەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی ئەو کاتەدا کراوە. سەبارەت بە بەشی پێنجەمیش، تایبەتە بۆ باسکردنی هۆکارەکانی جەنگی دووەمی جیهان و رووداوەکانی ئەو جەنگە بە وردی، تا کۆتایی هاتنی جەنگ. لە بەشی شەشەمیشدا تیشك خراوەتە سەر جیهان لە دوای جەنگی دووەمی جیهان و باس لە ئەنجامەکانی ئەو جەنگە و تەواوی ئەو کۆنگرە و پەیماننامانە کراوە، کە لە دوای جەنگەوە لە لایەن وڵاتە براوەکاندا بەسەر وڵاتە دۆڕاوەکاندا سەپێنراوە، هەر لەم بەشەشدا باس لە دامەزراندنی دامەزراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان کراوە و ئامانج و ئەرك و دامودەزگاکانی روونکراونەتەوە. بەشی حەوتەم و کۆتاییش بۆ جەنگی سارد تەرخانکراوە و لە میانەی ئەم بەشەشدا بە کورتی باس لە هۆکارەکانی جەنگەکە و چۆنێتی بەرێوەچوونی و گرنگترین کێشەکان و ئەنجامەکانی جەنگ کراوە.

بەو هیوایەی لە رێگەی ئەم کارەوە بتوانین خزمەتێکی بچووك بە کتێبخانەی کوردی بکەین لەم رووەوە.

# بەشی یەکەم

## جەنگی یەکەمی جیهان:

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، یەکێك لە گەورەترین رووداوە مێژووییەکانی جیهان رووی دا، کە لە مێژوودا بە جەنگی یەکەمی جیهان ناسراوە، دەکرێت بڵێین بەر لەم رووداوە، مرۆڤایەتی جەنگی بەم جۆرە فراوان و گشتگیرەی بەخۆیەوە نەبینی بوو، لەم جەنگەدا چەندین وڵات لە چەندین کیشوەری جیهان بەشداربوون و نوێترین جۆرەکانی چەکی تێدا بەکارهاتووە، نزیکەی ٦٥ ملیۆن مرۆڤ سووتەمەنییەکەی بوو، رووداو و ئەنجامەکانی بەسەر تەواوی جیهانەوە کاریگەربوون، ئەم جەنگە لە نێوان دوو جەمسەری سەرەکیدا رووی دا، کە جەمسەرێکیان ئینگلتەرا و فەرەنسا و رووسیا و هاوپەیمانەکانیان بوون و بە هاوپەیمانان ناسرابوون، جەمسەرەکەی تریشی بە وڵاتانی میحوەر ناسرابوون، کە لە ئەڵمانیا و ئیمپراتۆریای نەمسا و مەجەر و دەوڵەتی عوسمانی و بولگاریا پێکدەهات.

ئەگەرچی دەستپێکی ئەم جەنگە لە ساڵی ١٩١٤دا بوو، بەڵام لە راستیدا کەوتنەوەی ئەم جەنگە گوزارشتی لە دۆخێکی نێودەوڵەتی دەکرد، کە رەگ و ریشەکەی دەگەڕایەوە بۆ دوادوایی سەدەی هەژدە و لە سەدەی نۆزدەشدا کۆمەڵێك گۆڕانکاری بەسەر لایەنی سیاسیی و ئابووری ئەوروپادا هات، کە دواجار کاریگەریی گەورەیان بەسەر سیستەمی سیاسی وڵاتانی ئەوروپا و دەرکەوتنی چەند هێزێکی گەورەوە بوو و لە ئەنجامیشدا جۆرێکی نوێیان لە پەیوەندی لە نێوان هێزە گەورەکان هێنایە کایەوە، یەکێك لەو گۆڕانکارییانە، دەرکەوتنی شۆڕشی پیشەسازی و ئەو وەرچەرخانە گەورەیە بوو، کە بەسەر شێوازی بەرهەمهێناندا هات لە ئەوروپا و بووە هۆکاری زیادبوونی بەرهەم لەو وڵاتانەدا، کە ئەمەش وایکرد ئەو وڵاتانە بۆ ساغکردنەوەی کەلوپەلە نوێیەکانیان و درێژەدان بە بەرهەمهێنانیان، هەروەها وەگەڕ خستنی ئەو سەرمایە زۆرەی کە تا دەهات لە ئەوروپا کەڵەکە دەبوو و گواستنەوەیان بۆ بازاڕەکانی

دەرەوەی ئەوروپا، پێویستیان بە بازاڕی نوێ و کەرەستەی خاو بێت، لەم پێناوەشدا رووبکەنە ناوچەکانی تر و بەتایبەت ناوچەکانی رۆژهەڵات و لە ئەنجامی ئەمانەشدا لە سەدەی نۆزدەوە سیستەمی کۆلۆنیالیزمی نوێ دەرکەوت، کە بریتی بوو لە وەبەرهێنانی ئەو سەرمایە زیادەیەی لە ئەوروپا هەبوو لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا، کە سەرەنجام ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا چەند زلهێزێك لە ئەوروپا دەرکەون، کە سنووری ئابوورییان تا ئەوپەڕی رۆژهەڵات فراوان بێتەوە و لەوێدا ململانێیەکی قورس لەسەر ناوچە کۆلۆنیالییەکان بکەن، ئەوە بوو هەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە ئاراستەی وڵاتانی ئەوروپی بەرەو ناوچەکانی رۆژهەڵات چوو، بەتایبەتیش ململانێیەکی زۆر لەسەر ناوچەکانی ئەفریقا کەوتەوە، بۆ نموونە فەرەنسا لە ساڵی ١٨٣٠دا جەزایری داگیرکرد و دواتریش لە فراوانخوازییەکانی لەو ناوچەیەدا بەردەوام بوو، لە ساڵی ١٨٨١یشدا گەیشتە تونس، هەروەها بریتانیاش لە ساڵی ١٨٨٢دا میسری داگیرکرد، لە دوای یەکێتی ئیتالیاش، ئیتالیا وەك یەکێك لە هێزە نوێیەکان لەو ناوچەیەدا دەرکەوت و هەوڵی دا فراوانخوازییەکانی لە چەند ناوچەیەکی ئەفریقا ئەنجام بدات، بەڵام لە شەڕی عەدوای ساڵی ١٨٩٦دا تا رادەیەك هەنگاوەکانی بەربەست کران، بە شێوەیەکی گشتی ئەم وڵاتانە لەو ناوچەیەدا زۆرجار بەرژەوەندییەکانیان دەکەوتنە ململانێ و پێکداهەڵپژان و لە نێوان ساڵانی ١٨٠٠-١٨٩٩دا بەهاتنە ناوەوەی ئەڵمانیا ئەوەندەی تر کێشەکانیان لەسەر ئەم ناوچانە ئاڵۆزتر بوو، ئەمە جگە لەوەی کە لە ناوچەکانی کیشوەری ئاسیاش بە هەمان شێوە ململانێی قورس لە نێو ئەم وڵاتانەدا هەبوو، بۆ نموونە زۆر دەمێك بوو فەرەنسا و رووسیا و بریتانیا لەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی لە کێبەرکێی قورس و بەردەوامدا بوون، کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەڵمانیاش هاتە ناو کێشەکەوە، ململانێکە هێندەی دی قورستر بوو، هاوکات لە رۆژهەڵاتی دووریش لەسەر ناوچەکانی چین و دوورگەکانی ئەو ناوچەیە، ململانێیەکی قورس لە نێوان ژاپۆن و رووسیا دەستیپێ کردبوو، ئەڵمانیاش لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە خۆی خزاندبووە ناو ئەو ململانێیانەوە، ئەمەش جۆرێکی نوێ لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان هێنایە ئاراوە، کە لە ئاڵۆزی و گرژبوونی بەردەوامدا بوو، چەندین جار تا ئاقاری کەوتنەوەی شەڕ دەڕۆیشت، جگە لە شۆڕشی پیشەسازی، لە چارەگی کۆتایی سەدەی نۆزدە بەدواوە، دوو رووداوی گەورە لەسەر شانۆی سیاسیی ئەوروپا روویان دا، ئەوانیش یەکێتی ئیتالیا و یەکێتی ئەڵمانیا بوون، کە زۆر بەخێرایی بوون بە دوو دەوڵەتی بەهێزی سەر شانۆی سیاسی لە ئەوروپا و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا توانیان سنووری ئابوورییان بەجۆرێك فراوان بکەن، کە لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتدا لەگەڵ

زلهێزەکانی تردا بکەونە ململانێوە و سەرەنجامیش ئەمە ئەوەندەی تر ململانێکەی قورستر کرد، چونکە ئەمان پێشتر هیچ شوێنێکی کۆلۆنیالیان نەبوو، بۆیە سەرشێتانە کەوتبوونە هەڵپەی پەیداکردنی ناوچەی کۆلۆنیالی، لەم پێناوەشدا بە توندی کەوتنە ململانێوە لەگەڵ زلهێزە کۆنەکاندا و لێرەشەوە بارودۆخی نێودەوڵەتی تا دەهات گرژ و ئاڵۆزتر دەبوو، کە سەرەنجام وردە وردە هۆکارەکانی کەوتنەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی زەقتر دەکردەوە.

## یەکەم: هۆکارەکانی جەنگی یەکەمی جیهان

### ١. گۆڕانی هاوسەنگی هێزە جیهانییەکان:

یەکێك لە هۆکارەکانی جەنگی یەکەمی جیهان، ئەو گۆڕانکارییە بوو، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا بەسەر هاوسەنگی هێزە جیهانییەکاندا هات، تایبەت لە رووی ئابوورییەوە، ئەوە بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە وەك پێشتریش ئاماژەی پێکرا، چەند وڵاتێکی نویَ دەرکەوتن لەوانە ئەڵمانیا و ئیتالیا لە ئەوروپا و ژاپۆن لە ئاسیا و هەروەها ئەمەریکا، کە پێشتر ئەم وڵاتانە لە ریزی وڵاتە بەرهەمهێنەرەکاندا نەبوون، بەڵام لێرە بەدواوە وردە وردە بەرهەمەکانیان دەکەوتنە بازاڕەکانەوە و کێبەرکێی وڵاتە بەرهەمهێنەرە کۆنەکانیان دەکرد، بەتایبەت فەرەنسا و بریتانیا.

ئەڵمانیا دوای بەدەستهێنانی یەکێتییەکەی لە ساڵی ١٨٧١دا و دەستگرتنی بەسەر ناوچە دەوڵەمەندەکانی ئەلزاس و لۆریندا، دەستی کرد بە دامەزراندنی کارگەی گەورە و زۆر بەخێرایی پرۆسکی کاریگەرییەکانی شۆڕشی پیشەسازی گرتییەوە و رۆژ بە رۆژ بەرهەمەکانی بە بازاڕەکانی ئەوروپادا بڵاو دەبوونەوە و پێگەی لە نێو وڵاتە پیشەسازییەکاندا فراوان دەبوو، هاوکات ئەڵمانیا پلانێکی زۆر فراوانی بۆ بەرفراوانکردنی پیشەسازیی رێگەوبان و گواستنەوە و بەندەرەکان داڕشت، بەجۆرێك لە ساڵی ١٩٠٠ بەدواوە، ئەڵمانیا خاوەن دووەم هێزی دەریایی بوو لەدوای بریتانیا، جگە لەوەی هەر لەو مێژووە بەدواوە بەرهەمەکانی ئەڵمانیا بە تەواوی لە بازاڕەکانی ئەوروپا و تایبەتیش لە بەلجیکا هۆڵەندا، بازاڕیان پەیداکرد، هاوکات لە نێو خودی بریتانیاش وردە وردە تەنگیان بە بەرهەمە بریتانییەکان هەڵچنی، ئیدی ئەڵمانیا توانی ئەو هاوسەنگییە ئابوورییەی کە پێشتر هەبوو، وردە وردە بشێوێنێت و ببێت بە یەکێك لە وڵاتە سەرمایەدارییە گەورەکان و بێتە نێو ململانیَ کۆلۆنیالییەکانەوە، بە رادەیەك کێبەرکیَ لەگەڵ

بریتانیادا بکات و تەنگی پێهەڵبچنێت، کە بازرگانی بریتانیا لە ساڵی ١٨٨٠دا نزیکەی ٢٣٪ی بازرگانی جیهانی دەگرتەوە، کەچی لە ساڵی ١٩١٤ بۆ ١٧٪ ئەو بازرگانییە دابەزیبوو، لە بەرانبەریشدا بازرگانی ئەڵمانیا هەر لەو ماوەیەدا لە رێژەی ٩٪ەوە بۆ ١٢٪ زیادی کردبوو، کە بەشێکی زۆری ئەم زیادبوونەش لەسەر حسابی زلهێزەکانی پێشووتر بوو بە تایبەتیش بریتانیا، کە ئەو کەمبوونەی لەچاو ئەڵمانییەکان دەزانی. هاوکات ئەو ململانێیە لەپێناو بازاڕ وردە وردە بەرەو دەرەوەی ئەوروپاش رۆیشت و ناوچەکانی ئەمەریکای باشوور و رۆژهەڵات و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیشی گرتەوە و بەمەش تا دەهات ململانێ و کێبەرکێکان لەنێو ئەو زلهێزانەدا توندتر و فراوانتر دەبوو.

### ٢. ململانێ کۆلۆنیالیستییەکان:

یەکێکی تر لە هۆکارە هەرە گرنگەکانی جەنگی یەکەمی جیهان، ئەو ناکۆکییەی نێوان زلهێزەکان بوو، کە لەو ماوەیەدا تا دەهات بۆ بەدەستهێنانی کۆلۆنیالییەکان توندتر دەبوو و لە سەرەتای سەدەی بیستەمیشدا گەیشتە لوتکە، چونکە ئەو وڵاتە تازە پێشکەوتووانەی باسکران، کە تا دەهات پێگەی ئابووریيان فراوان دەبوو، لە قۆناغێکی دیاریکراودا وای لێدەهات پێویستیان بە ناوچەی کۆلۆنیالی بوو، بەڵام ئەو ناوچە کۆلۆنیالییانەی کە هەیانبوو، لەگەڵ ئەو ئاستی گەشەسەندنەی کە بەسەر پێگەی ئابوورییەکەیاندا دەهات، نەدەگونجا، ئەمە لەکاتێکدا بوو، کە زلهێزە کۆنەکانی وەك فەرەنسا و بریتانیا و رووسیا، وەك پێشتر باس کرا دەمێك بوو لەو بوارەدا رۆڵیان دەگێڕا، ناوچەیەکی کۆلۆنیالی فراوانیان لە ئەفریقا و ئاسیا لەبەردەستدا بوو، بۆیە ئەو وڵاتە کۆلۆنیالیستە تازە پێگەیشتووانە بەهەموو جۆرێك هەوڵیان دەدا وڵاتە کۆلۆنیالەکان جارێکی تر بەشێوازێکی تر دابەش بکرێتەوە، تەنانەت ئەگەر بەرێگەی توندوتیژی و سەربازیش بێت، چونکە لەو کاتەدا هەریەك لە ئەڵمانیا و ئیتالیا بە توندی هاتنە نێو ململانێکانەوە لە ئەفریقا و ئاسیا، کێشەکانی ئیتالیا زۆر بە ڕوونی لە ئەفریقا دەرکەوتن، هاوکات ئەڵمانیاش سەرباری ئەوەی کە لە ئەفریقا و ناوچەکانی رۆژهەڵاتی دوور ململانێیەکی زۆری دەستپێ کردبوو و چاوێکی زۆریشی بڕیبووە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، لەگەڵ سوڵتانی عوسمانیدا بەڕادەیەکی زۆر نزیك بووبووەوە، کێشەی ئەڵمانیا لە ناوچەیەدا ئەوکاتە زیادیکرد کە جیاوگی راکێشانی هێڵی ئاسنی بەغدا-بەرلینی لە دەوڵەتی عوسمانی بەدەستهێنا. ئەڵمانیا چالاکترینیان بوو لەو بارەدا وڵاتی هەرە لەپێش بوو، دووبارە داخوازی دابەشکردنەوەی کۆلۆنیالەکانی دەکرد و لەم سۆنگەیەشەوە وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا

به ئاشکرا دەیگوت: "ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا خاوەن هێز و چالاکی و ئابوورییەکی فراوان و گەشەیەکی خێرای دانیشتووانە، بۆیە مافی خۆیەتی بەشێکی وای هەبێت، کە لەگەڵ ئەم گرنگییەیدا بگونجێت لەکاتی دابەشکردنی یان دووبارە دابەشکردنەوەی کۆلۆنیالەکاندا". لە بەرانبەریشدا وڵاتە کۆلۆنیالیستە کۆنەکان بە هەموو جۆرێك هەوڵیان دەدا پارێزگاری لە دۆخەکە بکەن و بەرەنگاری هەموو هەوڵەکانی زلهێزە تازە پێگەیشتووەکان ببنەوە بۆ فراوانخوازی و دووبارە دابەشکردنەوەی کۆلۆنیالەکان، کە ئەمەش رۆژ بە رۆژ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی بەرەو گرژی و ئاڵۆزی زیاتر دەبرد.

## ٣. هاوپەیمانێتییە نێودەوڵەتییەکان:

لە کاتێکدا کە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە گرژی بەردەوامدا بوون، هەر لە دوای یەکێتی ئەڵمانیاوە ئیدی سیاسەتێکی نوێ لە نێو وڵاتە زلهێزەکاندا دەرکەوت، کە بە سیاسەتی هاوپەیمانێتی گرتنی نێودەوڵەتی ناسراوە، ئەم سیاسەتە یەکێك بوو لە هەنگاوە گرنگەکانی بەرەو دوو جەمسەربردنی زلهێزەکانی جیهان. هەر لە دوای ئەوەی کە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٧٠-١٨٧١ شکستێکی گەورەی بەسەر فەرەنساو هەردوو ناوچەی ئەلزاس و لۆرینی خستە ژێر دەستی خۆی و سزایەکی زۆری بەسەر فەرەنسادا سەپاند، ئیدی هەر یەکە لەم دوو وڵاتە بەچاوی گومانەوە دەیانڕوانییە ئەویتریان، لە لایەك ئەڵمانیا لەوە دڵنیا بوو، کە فەرەنسا ئەمەی بیرناچێت و بەردەوام لە چاوەڕوانی هەلێکدایە بۆ تۆڵە سەندنەوە، لەولاشەوە فەرەنسا بەردەوام لە هەوڵی خۆبەهێزکردن و گێڕانەوەی پێگە نێودەوڵەتییەکەی خۆیدا بوو، واتا ئەم دوو دەوڵەتە بەردەوام بەچاوی گومانەوە دەیانڕوانییە یەکدی و لێرەشەوە هێدی هێدی بوون بە ماکی دوولەتبوونی زلهێزەکان و جەمسەرگرتنیان بەدەوری هەر یەکێك لەم دوو هێزەدا بەپێی بەرژەوەندییەکانیان، بۆیە هەر لە ساڵی ١٨٧٢ەوە چەند هاوپەیمانێتییەك بەپێی بەرژەوەندی فەرەنسا و ئەڵمانیا لە نێوان زلهێزەکاندا بەسترا، لەوانەش:

### یەکەم: کۆمەڵەی سێ ئیمپراتۆرەکە ١٨٧٢-١٨٨٧:

ئەم هاوپەیمانێتییە لە ساڵی ١٨٧٢دا لە نێوان هەرسێ ئیمپراتۆر (ولیامی یەکەم)ی ئەڵمانیا و (ئەلکساندەری دووەم)ی رووسیا و (فرانسوا جۆزێف)ی نەمسا بەسترا، کە ئامانجی سەرەکی پاراستنی دۆخی سیاسی بوو لە هەر سێ ئیمپراتۆرییەتەکە و بەرەنگاربوونەوەی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان بوو، بەڵام لە کۆنگرەی بەرلینی ١٨٨١دا تا رادەیەك لاوزی کەوتە

ئەم هاوپەیمانێتییەوە، چونکە رووسیا لەوە نیگەران بوو کە بۆسنە و هەرسك بخرێتە ژێر بەڕێوەبردنی نەمساوە، لەبەر ئەوەی دەیەویست لەژێر بەڕێوەبردنی سربیای هاوپەیمانیدا بئ ، جگە لەوەی رووسیا خۆی بەپارێزگاریکاری گەلە سلاڤییەکان دەزانی و ئەمەی پێ خۆش نەبوو، بەڵام جارێکی تر ئەم هاوپەیمانێتییە بە چەند بڕگەیەکی نوێوە، نوێکرایەوە کە گرنگترین ئەو بڕگانە ئەوە بوو ئەو سێ وڵاتە گفتوگۆی پێشوەخت لەسەر هەر پێشهاتێك بکەن کە لە دەوڵەتی عوسمانی روویدات، بەڵام لە ئەنجامدا لە ساڵی ١٨٨٧ بەهۆی تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان رووسیا و نەمساوە لەسەر ناوچەکانی باڵکان ئەم هاوپەیمانێتییە کۆتایی پێهات.

### دووەم: هاوپەیمانێتی دووقۆڵی ئەڵمانی-نەمسایی ١٨٧٩:

دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٨٧دا ئەڵمانیا و رووسیا نێوانیان بەرەو گرژی چوو، رووسیا سوپای لەسەر سنووری ئەڵمانیا مۆڵکرد، رۆژنامەکانی کەوتنە هێرشکردنە سەر ئەڵمانیا، رووسیا لە فەرەنسا و ئیتالیا نزیك کەوتەوە، لە هەمان کاتیشدا نەمسا هیچ ئومێدێکی بە هاوپەیمانێتی سێ قۆڵی نەمابوو، بۆیە دەیەویست دووقۆڵی لەگەڵ ئەڵمانیا لە دژی رووسیا رێك بکەوێت، ئیدی لە تشرینی دووەمی ١٨٨٩دا رێککەوتنێکی دووقۆڵی لە نێوان نەمسا و ئەڵمانیادا مۆرکرا، کە تیایدا هاتبوو هەر جۆرە دەستدرێژییەك بۆسەر هەر لایەك لەم دوو وڵاتە، دەستدرێژیکردنە بۆ سەر هەردوو لا، واتا ئەگەر رووسیا هێرشیکردە سەر هەر لایەکیان، ئەوا پێویستە لایەکەی تریش شەڕ لە دژی رووسیا رابگەیەنێت، بەڵام ئەگەر لایەك لەم دوو وڵاتە هێرشی کردە سەر وڵاتێکی تر، ئەوا پێویستە لایەکەی تر بێ لایەنی رابگەیەنێت. ئەم هاوپەیمانێتییە لە ساڵی ١٨٨٣ و دواتریش لە ساڵی ١٩٠٢دا نوێکرایەوە و تا ساڵی ١٩١٨ و تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهان هەر بەردەوام بوو. لە راستیدا ئەم هاوپەیمانێتییە ماکی یەکلاکەرەوەی دووبەرەیی ئەوکاتەی زلهێزەکان بوو، چونکە بەرەی ئەڵمانی-نەمسایی تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهان جێگیرکرد.

### سێیەم: هاوپەیمانێتی سێ قۆڵی ١٨٨٣:

ئەم هاوپەیمانێتییە لە نێوان ئەڵمانیا و نەمسا و مەجەر و ئیتالیادا بەسترا، کە مەبەستی سەرەکی گۆشەگیرکردنی فەرەنسا و زاڵکردنی ئەڵمانیا بوو لەسەر شانۆی سیاسیی ئەوروپا، ئەمانە لەسەر ئەوە رێککەوتن، کە هەریەك لە ئەڵمانیا و نەمسا-مەجەر هاوکاری ئیتالیا بکەن ئەگەر

فەرەنسا هێرشی بۆ هێنا، ئیتالیاش یارمەتی ئەڵمانیا بدات ئەگەر فەرەنسا هێرشی بۆ هێنا و هەرکاتێکیش رووسیا و فەرەنسا هێرشیان کردە سەر هەر لایەك یان دووان لە ئەندامانی ئەم هاوپەیمانێتییە، ئەوا پێویستە هەر سێ لایەنەکە بکەونە شەڕەوە. لە راستیدا ئیتالیا هەرچەندە دوژمنایەتییەکی مێژوویی لەگەڵ نەمسادا هەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی فەرەنسا لەوسەر و حەدەدا تونسی داگیرکردبوو، ئیتالیاش بەمە نیگەران بوو، بۆیە بەشداری ئەم هاوپەیمانێتییەی کرد. ئەم رێککەوتنە تا دەستپێکی جەنگی یەکەمی جیهان، بەردەوام بوو.

### چوارەم: هاوپەیمانێتی بریتانیا و ئتیالیا و نەمسا ـ مەجەر لە ساڵی ۱۸۸۷دا:

لەو ماوەیەدا کە زلهێزەکانی ئەوروپا لە هاوپەیمانی گرتندا بوون، بریتانیا سیاسەتێکی گۆشەگیرانەی پیادەدەکرد و نەیدەویست لە کێشەکانی نێوان فەرەنسا و ئەڵمانیا تێوەبگلێت، ئەو بەردەوام لەگەڵ ئاشتیدا بوو بۆ پاراستنی بازرگانییەکەی، بەڵام ئەو هاوپەیمانێتیانە وردە وردە دەبوونە ترس لەسەر بەرژەوەندییەکانی بریتانیا، چونکە ئەو پێگەی کۆلۆنیالیانەی لە هەموو شوێنێکدا هەبوو، بەرژەوەندییەکانی پەرتەوازە کردن، لەلایەکی تریشەوە هەستی بە هەڕەشەی ئەو هاوپەیمانێتیانە لەسەر ئارامی بریتانیا کرد، بۆیە لە قۆناغێکی دیاریکراودا ئیدی نەیتوانی بە تەنها رووبەڕووی ئەو مەترسییانە ببێتەوە، کە دووچاری بەرژەوەندییەکانی دەبوون. هەر لەبەر ئەوانە بەناچاری کۆتایی بەم گۆشەگیرییە هێنا و سەرەتای هەنگاوەکانیشی بەستنی پەیماننامە بوو لەگەڵ ئیتالیا، کە تیایدا دانی بە بەرژەوەندییەکانی ئیتالیا دانا لە تەرابلوس، لە بەرانبەریشدا ئیتالیا دانی بەداگیرکردنی میسر دانا لەلایەن بریتانیاوە، دواتریش نەمسا هاتە نێو ئەم هاوپەیمانێتییەوە و کە لەدواییشدا دەرکەوت ئەم هاوپەیمانێتییە لە دژی رووسیا و فەرەنسا بووە و پشتیوانییەك بووە بۆ ئەڵمانیا، چونکە تا ئەوکاتیش بریتانییەکان هەر فەرەنسا و رووسیایان بە رکابەری سەرەکی خۆیان دەزانی، لەبەر ئەوەی ئەو سێ وڵاتە رکابەرییەکی مێژووییان لە ناوچەکانی رۆژهەڵات هەبوو، هەربۆیە سەرەتای هاوپەیمانێتییەکانی بریتانیا لەبەرەی دژ بە فەرەنسا و رووسیا بوو، بەڵام دواجار رەوتی رووداوەکان و سەرکێشییەکانی ئەڵمانیا و ترسەکانی بۆسەر بەرژەوەندییەکانی بریتانیا، هاوکێشەکەیان بەپێچەوانەوە گۆڕی.

### پێنجەم: هاوپەیمانێتی رووسی-فەرەنسی ١٨٩١-١٨٩٤:

ئەگەرچی لە سەرەتادا فەرەنسا هەوڵی دەدا خۆی لە هاوپەیمانێتییەکان بەدوور بکرێت، چونکە نەیدەویست جارێکی تر لەگەڵ ئەڵمانیادا بکەوێتە کێشەوە، بەڵام پسمارك توانی بە تەواوی گەمارۆی فەرەنسا بدات، بۆیە ئەو خۆبەدوورگرتنەی فەرەنسا لە سایەی ئەو هەموو هاوپەیمانێتییە نێودەوڵەتییەدا توانای بەردەوامی و فەرەنسا دەبوو بەدوای هاوپەیمانێکدا بگەڕێت، کە لە بەرژەوەندییەکانی ئەوەوە نزیك بێت، ئەویش تەنها رووسیا بوو، چونکە لەو کاتەدا رووسیا رکابەری نەمسا بوو، بەم جۆرەش لەگەڵ ئەڵمانیا و نەمسادا لەبەریەك بوون، فەرەنساش لەبەرئەوەی دوژمنی ئەڵمانیا بوو، کەواتە دەبوو لە دوژمنی ئەڵمانیا نزیك بکەوێتەوە، کە لەو کاتەدا رووسیا بوو، بۆیە فەرەنساش لەگەڵ رووسیادا هاوپەیمانێتییەکی بەست، کە بەپێی ئەو هاوپەیمانێتییە، دەبوو رووسیا هاوکاری فەرەنسا بکات ئەگەر هاتو ئەڵمانیا یان نەمسا-مەجەر بەیارمەتی ئەڵمانیا هێرشیان کردە سەر فەرەنسا، هاوکات فەرەنساش یارمەتی رووسیا بدات ئەگەر ئەڵمانیا یان نەمسا-مەجەر بەیارمەتی ئەڵمانیا هێرشیان کردە سەر، کە یارمەتییەکەش خۆی لە یارمەتی سەربازیدا دەبینییەوە. کەواتە ئەم هاوپەیمانێتییە باسی لە یارمەتی سەربازی دەکرد.

### شەشەم: رێککەوتننامەی ئیتالی-فەرەنسی ١٩٠٠:

ئەم رێککەوتنە لە ساڵی ١٩٠٠دا لە نێوان ئیتالیا و فەرەنسادا بەسترا، کە بەپێی ئەم رێککەوتنە، ئیتالیا دانی بە بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا دانا لە مەراکیش، لەبەرانبەریشدا فەرەنسا دانی بە بەرژەوەندییەکانی ئیتالیا دانا لە تەرابلوسی رۆژئاوا، هەردوو لاش لەسەر ئەوە رێککەوتن کە لە کاتی هەر رووبەڕووبوونەوەیەکی هەر لایەکیان بۆ هێرشی لایەنی سێیەم، پێویستە بێلایەنی بپارێزن.

### حەوتەم: ویفاقی دۆستانەی نێوان بریتانیا و فەرەنسا ١٩٠٤:

لێرە بەدواوە ئیدی نزیکبوونەوەی فەرەنسا و بریتانیای کۆنەکابەر لەبەرانبەر ئەڵمانیا دێتەپێش، چونکە وەك پێشتر باسکرا، ئەڵمانیا هەر لە ساڵی ١٨٧١ەوە دوژمنی سەرەکی

فەرەنسا بوو، هەروەها لەو سەروبەندەشدا بوو کە ئەڵمانیا بوو بە دەوڵەتێکی پیشەسازی گەورە و وردە وردە کێبەڕکێی لەگەڵ بریتانیا لە ناوچە کۆلۆنیالییەکانیدا دەکرد، بەمەش تا دەهات ئەڵمانیا دەبوو بە دوژمنی هەردوولا و لێرەشەوە هەریەکە لە بریتانیا و فەرەنسا دەیانویست بەرژەوەندییە کۆلۆنیالییەکانیان لەگەڵ ئەڵمانیا بە تەواوەتی یەکلا بکەنەوە، هەربۆیە لە ٨ی نیسانی ١٩٠٤دا رێککەوتنێکیان مۆرکرد کە تیایدا هاتبوو:

أ. ئەو کێشانە چارەسەربکرێن، کە لەنێوانیاندا هەبوو لەسەر راوەماسی لە نیوفاونلاند، هەروەها سنووری نێوان هەندێك لە ناوچە کۆلۆنیالییەکانی هەردوولا رێك بخرێت.

ب. چارەسەرکردنی کێشەکانیان لە سیام و مەدغەشقەر و نیوهێردس.

ت. بریتانیا دان بە بەرژەوەندیی فەرەنسییەکاندا بنێت لە مەراکش و فەرەنساش دان بە بەرژەوەندییەکانی بریتانیادا بنێت لە میسر.

بەم جۆرەش بریتانیا و فەرەنسا کۆتاییان بە کێشە و ململانێکانیان هێنا و لێرەشەوە ماکی جەمسەری دووەمی جەنگی جیهانیش دەرکەوت، کە هاوپەیمانەکان بوون.

### هەشتەم: رێککەوتنی بریتانی-رووسی ١٩٠٧:

دوای سێ ساڵ لە رێککەوتنی فەرەنسا و بریتانیا، کاتی یەکلاییکردنەوە و کۆتاییهێنان بە کێشەکانی نێوان رووسیا و بریتانیا هات، چونکە بریتانیا بەرێککەوتنی لەگەڵ فەرەنسا، بوو بە رکابەری ئەڵمانیا و نەمسا، رووسیاش هەر وەکو باس کرا، دەمێك بوو رکابەر و دوژمنی ئەو بەرەیە بوو، لەبەر ئەمەش دەبوو ئەو دوو وڵاتەش لێکتر نزیك بووبوونایەوە، بۆیە لە ساڵی ١٩٠٧دا، رێککەوتنێك لەنێوان رووسیا و بریتانیاشدا بەسترا، کە تیایدا سەرجەم کێشەکانی خۆیان لە ئاسیا چارەسەرکرد، تایبەت ئەوەی پەیوەست بوو بە ئێرانەوە، کە بۆ سێ ناوچە دابەشکرا، باکوور بۆ رووسیا و باشوور بۆ بریتانیا و ناوەڕاستیش بێلایەن، لە لایەکی تریشەوە رووسیا دانی بە بەرژەوەندییەکانی بریتانیا دانا لە کەنداوی فارس، بریتانیاش بەڵێنی دا ئاسانکاری بۆ رووسیا بکات لە کردنەوەی گەرووەکان لە بەردەم کەشتییە جەنگییەکانیدا، هاوکات هەر لەو سەرحەددەدا بوو کە رووسیا و ژاپۆنیش رێککەوتن و فەرەنسا و ژاپۆنیش رێککەوتنیان مۆرکرد.

لە ساڵی ١٩٠٧دا زلهێزەکانی ئەوروپا بە تەواوەتی بەسەر دووبەرەی دژیەکتردا دابەشبوون، کە ئەویش بەرەی هاوپەیمانی سێ قۆڵی (ئەڵمانیا و نەمسا-مەجەر و ئیتالیا) و لەولاشەوە

بەرەی ویفاقی دۆستانەی (رووسیا و فەرەنسا و بریتانیا) بوو، لەکاتێکدا هەڵوێستی ئیتالیا لەتەك هاوپەیمانی سیێ قۆڵیدا بەتەواوەتی جێگیر نەبوو، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٠٢دا کێشەکانی خۆی لەگەڵ فەرەنسا کۆتایی پێهێنا و لەسەر ئەوە رێککەوتن کە فەرەنسا لە رۆژئاوادا دەست والآ بێت لە بەرانبەر ئەوەی ئیتالیا لە لیبیا دەست والآ بێت، ئەمە جگە لەوەی کە ئیتالیا لە ساڵی ١٩٠٩شدا لەگەڵ رووسیا لەسەر ئەوە رێککەوتن کە بارودۆخی ناوچەی باڵکان وەك خۆی بمێنێتەوە و ئیتالیا هەڵوێستی دۆستانە لەبەرانبەر بەرژەوەندییەکانی رووسیا لە گەرووەکانی تورکیادا بنوێنێت بەرانبەر بەوەی رووسیا دان بە بەرژەوەندییەکانی ئیتالیادا بنێت لە لیبیا. لە راستیدا ئەم رێککەوتننامە و هاوپەیمانێتییانەی، کە باس کران، بەڕوونی رەنگدانەوەی دۆخی گرژ و پڕ گومانی ئەوکاتەی زلهێزەکانە و لە ناواخندا خۆسازدانە بۆ رووبەڕووبوونەوە و پێکداهەڵپژانیان لەنێو یەکتریدا، کە ئەمانەش هێندەی تر بوونە مایەی توندکردنی هەڵوێستی ئەو وڵاتە زلهێزانە لە بەرانبەر یەکتریدا بەو نیازەی ئەگەر هەریەکێك لەو وڵاتانە لەگەڵ بەرانبەرەکەیدا بکەوێــتە جەنگەوە، ئەوا هاوپەیمانەکەی هاریکاری دەکات، کە ئەمەش زیاتر زەمینەسازی کەوتنەوەی جەنگی دەکرد.

### ٤. پەرەسەندنی گیانی سەربازی و کێبەڕکێی خۆپڕچەککردن:

دوای ئەوەی لەدوای جەنگەکانی یەکێتی ئیتالیا و یەکێتی ئەڵمانیاوە لە ساڵی ١٨٧٠-١٨٧١ بەدواوە، تا رادەیەك ئەو دۆخە جێگیری و بێ جەنگییەی کە لە دوای کۆنگرەی ڤیەنناوە هاتبووە ئاراوە لە ئەوروپا کۆتایی پێهات. ماوەی نێوان ١٨٧٠-١٩١٤ ئەگەرچی سەردەمی ئاشتی و بێ جەنگی بوو، بەڵام ئاشتییەکی پڕ مەترسی و چەکدارانە بوو، لەو ماوەیەدا وڵاتانی ئەوروپا، تایبەت زلهێزەکان، لە رووی سەربازییەوە کەوتنە خۆڕێکخستنەوە و خۆپڕچەککردن و بڕیاری سەربازی زۆرەملێیی لەبەشی هەرەزۆری ئەو وڵاتانەدا دەردەکرا و تا دەهات ژمارەی سەربازەکان زیاتر دەبوون، بە رادەیەك لەو ماوەیەدا ئەوروپا لە چەشنی سەربازگەیەکی پڕچەکی لێهاتبوو، کە ئەمەش پەیوەندییەکی زۆری بە سیاسەتی هاوپەیمانیگرتنەوە هەبوو، کە پێشتر باسکرا، چونکە ئەو وڵاتانە لە ترس و گومان لەبەرانبەر رکابەرەکانیان هاوپەیمانێتیان دەبەست، بۆیە دەبینرێت لەبەشی هەرە زۆری هاوپەیمانەکاندا ئەگەری جەنگ و رووبەڕووبوونەوەی سەربازی باس کراون، لەبەر ئەمەش ئەوان بەردەوام هەوڵیان دەدا توانای سەربازیشیان لە ئاستێکی بەرزدا بێت، تا بتوانن رووبەڕووی ترسی وڵاتە نەیارەکانیان ببنەوە، ئەم بارودۆخەش وایکرد لە بەشی زۆری ئەو وڵاتانەدا گروپە

سەربازییەکان وردە وردە بەسەر لایەنی سیاسیی و ئیداری وڵاتدا زاڵ بن و وڵات لە چوارچێوەیەکی سەربازییانەدا ئاراستە بکەن، بەمەش ئەو ماوەیەی مێژووی ئەورووپا بریتی بوو لە ماوەی ململانێ و کێبەرکێیەکی سەربازییانە و خۆپڕچەککردنێکی ترسناک بە رادەیەك ئەگەر سەیری ئامارە سەربازییەکانی ئەو سەردەم بکەین، بڕی زیادبوونی تێچوونە سەربازییەکان لە نێوان ساڵانی ١٨٧٥-١٩١٤دا لە ئەڵمانیا و بریتانیا سێ بەرانبەر زیادی کرد، لە فەرەنساش دوو بەرانبەر بەرزبووبۆوە و لە رووسیاش خەرجی سەربازی یەك لەسەر سێی بودجەی وڵاتی پێکدەهێنا، ئیتالیاش بەدەست زۆری خەرجییە سەربازییەکانەوە دەیناڵاند. پەرەسەندنی رۆژ لە دوای رۆژی ئەم خۆپڕچەککردنە بەردەوامە وایلێهات کە لە دوادوایی سەدەی نۆزدەدا هەوڵێکی نێودەوڵەتی زۆر دەربکەوێت بۆ سنووردارکردنی ئەم بارودۆخە، بەڵام لەبەر ئەوەی دۆخەکە تادەهات دژوارتر دەبوو، ئەمجۆرە هەوڵە هیچ ئاکامێکیان نەبوو، یەکێك لەو هەوڵانە، هەوڵەکەی (نیکۆلای دووەم)ی قەیسەری رووسیا بوو، کە لە ساڵی ١٨٩٨دا وڵاتە ئەوروپییەکانی بە مەبەستی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە بۆ لاهای بانگهێشت کرد، لە ساڵی ١٨٩٩شدا ئەم کۆنگرەیە بە ئامادەیی ٢٦ وڵات بەسترا بەبێ ئەوەی هیچ رێککەوتنێکی لێ بکەوێتەوە، هەر لە لاهای و لە ساڵی ١٩٠٧یشدا کۆنگرەیەکی تر بۆ هەمان مەبەست بە ئامادەبوونی نوێنەری ٤٤ وڵات بەسترا، کە ئەمیش نەیتوانی هیچ ئاکامێك بەدەست بهێنێت، دواتریش لە ساڵەکانی ١٩٠٨ و ١٩١٢ چەند هەوڵێکی تر درا بۆ هەمان مەبەست، بەڵام ئەوانیش بێ ئەنجام بوون و خۆپڕچەککردن و خۆسازدانی سەربازی لە وڵاتە زلهێزەکاندا تا دەهات زیاتر برەوی دەسەند و کێبەرکێکانیان توندتر دەبوون بە رادەیەك لە سەرەتای ساڵی ١٩١٤دا هەریەکێك لە زلهێزە ئەوروپییەکان بە ملیۆنەها سەرباز و بڕێکی زۆر لە چەك و جبەخانەیان هەبوو، کە ئەمەش ئەوەندەی تر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی گرژ و ئاڵۆز دەکرد و لەوکاتەدا زلهێزەکانی بەرەو ئاقاری شەڕ دەبرد.

### ٥. رۆڵی رۆژنامەگەری و پڕوپاگەندە:

لەکاتی ئەوگرژبوونە و ئاڵۆزییەی کە تا دەهات لە نێو وڵاتە زلهێزەکاندا زیاتر دەبوو، رۆژنامەگەری و پڕوپاگەندەش رۆڵێکی باشیان بینی لە زیاتر تێکچوونی پەیوەندییەکان و بەرەوشەڕبردنی جیهان، چونکە زۆرجار رۆژنامەکان لەو وڵاتانەدا هەواڵی دژ بەبەرژەوەندییەکانی یەکتریان بڵاو دەکردەوە و پڕوپاگەندەی خراپیان چ بە مەبەست و چ بێ

مەبەست، بڵاودەکردەوە، جگە لەوەی هەندێك جاریش خودی حکومەتەکان دەکەوتنە شەڕی ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەیان لە دژی یەکتر بڵاودەکردەوە، کە هەموو ئەمانە کاریگەربوون لەوەی درزی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان فراوانتر بکەن و لەوکاتەدا زلهێزەکان بەرەو جەنگ بەرن.

## ٦. بزووتنەوە نەتەوایەتییەکان:

یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە کاریگەر بوو لە ڕێخۆشکەرییەکانی جەنگی یەکەمی جیهان، دەرکەوتنی کێشە نەتەوەییەکان و دەڵەتی نەتەوەیی بوو، چونکە لەوکاتەدا لەلایەکەوە نزیکەی ٢٥ وڵاتی سەربەخۆ لە ئەوروپادا هەبوون کە هیچ یەکێکیان دانیان بە سەروەرێتی ئەویتریاندا نەدەنا و لە هەوڵی پاراستنی سەربەخۆیی تەواوی خۆیاندا بوون لە هاوپەیمانێتی بەستن و ڕاگەیاندنی جەنگ و هتد، ئەمە جگە لەوەی کە لە هەوڵی فرەوانبوونی ئابووری خۆیاندا بوون، کە ئەمانە بواری ململانێی نێوانیانی خۆشتر کردبوو، لەلایەکی تریشەوە لەوکاتەدا چەند ڕەگەزێك لەئارادا بوون کە هەوڵیان دەدا یەکێتی گشتگیر و پانڕەگەزی دروست بکەن و لێرەشەوە ترس لەسەر گەلان و میللەتانی تر دروست بکەن، وەك ئەوەی کە ئەڵمانییەکان هەوڵی دروستکردنی یەکێتی جەرمەنەکانیان دەدا، ڕووسەکانیش بۆ دامەزراندنی یەکێتی سلاڤیەکان تێدەکۆشان، کە ئەمانە هەمووی بۆ زلهێزەکانی تر لەو سەردەمەدا نەخوازراو بوون و بە ترسیان دەزانی لەسەر بەرژەوەندییەکانی خۆیان، ئەمە جگە لەوەی کە لەو سەردەمەشدا گیانی نەتەوایەتی و هەوڵە ڕزگاریخوازییەکان لای بەشی زۆری گەل و نەتەوە ژێردەستەکان لە بوژانەوە و گەشەسەندندا بوون، ئەمەش بوو بوو بە ڕێگەیەکی تر بۆ زیادبوونی ململانێی زلهێزەکان، چونکە لێرەوە هەریەکە لەو زلهێزانە ڕێگەی بۆ خۆش بووبوو بۆ خۆهەڵقورتاندن لە کێشەکانی زلهێزەکانی تر و مەترسی خستنە سەر بەرژەوەندییەکانی یەکدی، ئەمەش ئەوەندەی تر پەیوەندییەکانیانی گرژتر دەکرد، بۆ نموونە کێشەی پۆڵەندییەکان و کرواتییەکان و گەلانی ژێر دەسەڵاتی نەمسا و ڕووسیا و دەوڵەتی عوسمانی.

سەرەنجام لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە ئەنجامی ئەم هۆکارانەدا پەیوەندی نێوان وڵاتە زلهێزەکان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئاڵۆز و گرژتر دەبوو، ناکۆکییەکان قوڵتر دەبوون، کە ئەمانە هەمووی کێڵگەی تێکچوونی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بوون لەوکاتەدا و وڵاتانی جیهانیان زیاتر بەرەو شەڕ دەبرد. هاوکات هەر ئەو ململانێیانە بەر لە جەنگی یەکەمی جیهان، چەندین جار قەیرانی سیاسیی ئەوتۆیان دەخستەوە کە زۆرجار تا ئاقاری شەڕ دەڕۆیشت، بەڵام لەبەر ئەوەی بارودۆخە مێژووییەکە نەگەیشتبووە ئاستی جەنگ، بۆیە ئەم قەیرانانە تەنها وەك چەند قەیرانێکی سیاسیی مانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆڵی گەورەیان گێڕا لە زیاتر ئاڵۆزترکردنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان.

## دووەم: قەیرانە سیاسییەکانی پێش جەنگی یەکەمی جیهان

دوای ئەوەی لە ئەنجامی ئەو زنجیرە هاوپەیمانێتی و ڕێککەوتننامەیەی کە پێشتر باس کرا لە ساڵی ١٩٠٧ بەدواوە، زلهێزەکانی ئەوروپا بەسەر دوو سەربازگەی گەورەدا دابەش بوون، بەر لەوەی جەنگی یەکەمی جیهان بکەوێتەوە، بە چەند ساڵێك چەند قەیرانێکی سیاسیی لە نێوان زلهێزەکاندا کەوتەوە کە پشێوییەکی گەورەی لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەدا نایەوە بە جۆرێك هێندەی نەمابوو هەریەکێك لەم قەیرانانە زلهێزەکانی ئەو سەردەمە بەرەو جەنگێکی گەورە بەرێت و ببێتە دەستپێکی جەنگی یەکەمی جیهان، بەڵام لەبەر ئەوەی زەمینە مێژووییەکە نەگەیشتبووە ئەو شوێنە، بۆیە ئەمانە تەنها وەك چەند قەیرانێکی سیاسیی پێش جەنگی یەکەمی جیهان مانەوە، بەڵام ڕۆڵێکی زۆریشیان بینی لە زیاتر گرژکردنی پەیوەندییەکان و بەرەو جەنگ بردنی جیهان کە بریتی بوون لەو قەیرانانەی لای خوارەوە:

### ١ـ قەیرانی مەراکیشی یەکەم (١٩٠٤–١٩٠٥):

ناوچەکانی ئەفریقا یەکێك بوون لە ناوچە هەستیار و پڕ کێشەکانی پێش جەنگی یەکەمی جیهان و گۆڕەپانی ململانێ و کێشەیەکی توندی نێوان زلهێزەکان بوون، بەتایبەتیش ئەڵمانیا و فەرەنسا، دوای ئەوەی فەرەنسا لە ساڵی ١٨٣٠دا جەزائیری داگیرکرد و لە ساڵی ١٨٨١یشدا چووە ناو تونسەوە، لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا بەردەوام بوو لە هەوڵەکانی بۆ داگیرکردنی مەراکیش (مەغریب) کە تا ئەوکاتە سەربەخۆیی خۆی پاراستبوو، لەم پێناوەشدا فەرەنسا زنجیرەیەك ڕێککەوتننامەی لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا بەست، کە ئەوانیش مەبەستی داگیرکردنی مەراکیشیان هەبوو، لەگەڵ هەوڵەکانی فەرەنسادا ناکۆك دەبوون، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٠٢دا فەرەنسا توانی لەگەڵ ئیتالیا ڕێك بکەوێت و ڕازیبوو لەسەر ئەوەی ئیتالیا لیبیا داگیر بکات بەرانبەر بەوەی چاوپۆشی لە ویستەکانی فەرەنسا بکات لە مەغریب، لە ساڵی ١٩٠٤یشدا، بەپێی ڕێککەوتنەکەی لەگەڵ بریتانیا، توانی بریتانیا ڕازیبکات بەوەی کە فەرەنسا لە مەغریب دەستواڵا بێت بەرانبەر بەوەی کە بریتانیا لە میسر دەستواڵا بێت، هەر لەم ڕێککەوتننامەیەشدا ڕەچاوی بەرژەوەندییەکانی ئیسپانیا لە مەغریب کرا و لە ساڵی ١٩٠٤یشدا لەگەڵ ئیسپانیادا ڕێککەوتن و سنووری نفوزی خۆیان لە ناوچەکانی مەراکیش

دەستنیشان کرد، بەتایبەتی لە بەندەری تەنجە. سەبارەت بە رووسیاش هەر خۆی هاوپەیمانی فەرەنسا بوو کە بەپێی پەیماننامەی ساڵی ١٨٩٤، پەیماننامەی سەربازی لە نێوانیاندا هەبوو، ئەمە جگە لەوەی کە رووسیا بەرژەوەندییەکی ئەوتۆی لە مەغریب نەبوو، بۆیە هیچ رێگرییەکی لەبەردەم فراوانخوازییەکانی فەرەنسا لەوێ نەدەکرد. کەواتە فەرەنسا سەرجەم ئەو لایەنانەی رازیکرد کە بەربەست بوون لەبەردەم ئەم هەنگاوەیدا.

هەر لە سەروبەندی ئەم کارانەشدا، فەرەنسا وەك دەستپێکی چوونە ناو مەغریبەوە، قەرزێکی زۆری دا بە مەغریب تا لە رێگەی ئەم قەرزەوە بتوانێت دەست لە کاروباری مەغریب وەربدات و دواتریش داگیری بکات، کە لە ساڵی ١٩٠٤دا بڕی ئەم قەرزە گەیشتە ٦٢ ملیۆن و نیو فرەنك، لەپای ئەمەش لە ٦٠٪ی داهاتی گومرگی مەغریب وەك بارمتەی ئەم قەرزە درا بە فەرەنسا و ئیدارەیەکی فەرەنسی تایبەت بەم قەرزانەش لە مەغریب دانرا، هەر بۆ ئەم مەبەستەش لە ساڵی ١٩٠٥دا، شاندێکی فەرەنسی بە سەرۆکایەتی (رینیە تالاندییە) گەیشتە مەغریب و دەستی بە گفتوگۆکانی کرد سەبارەت بە دووبارە رێکخستنەوەی ئیدارە و دەزگاکانی پۆلیس و دارایی و ئابووری لە مەغریب، کە لە پێشنیارەکانیدا هاتبوو پێویستە مەغریب دووبارە لە ژێر چاودێری فەرەنسا و لەو ناوچانەی لەژێر سایەی ئیسپانیا، لە ژێر چاودێری ئیسپانیا رێك بخرێتەوە و بانکی مەغریب لەژێر چاودێری بانکە فەرەنسییەکان دابمەزرێت و جیاوکی هێڵی ئاسنی و بەندەرەکان و دارستان و کانزاسازی و چەند لایەنێکی تریش بدرێتە کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکانی فەرەنسا، واتا مەغریب بکرێت بە نیمچەداگیرکەیەکی فەرەنسی. سوڵتانی مەغریبیش کە ئەوکات (مەولانا عەبدولعەزیز) بوو ١٨٩٢-١٩٠٨، هێندەی نەمابوو بەم پێشنیارە رازیبێت، بەڵام لەو کاتەدا ئەڵمانیا خۆی خستە ناو کێشەکەوە و بەمەش قەیرانی مەراکیشی یەکەم دەرکەوت.

ئەڵمانیا ئەگەرچی دەیزانی کە فەرەنسا زوو بێت یان درەنگ دەست بەسەر مەغریبدا دەگرێت، بەڵام مەبەستی لەم دەستتێوەردانەدا دوو ئامانجی سەرەکی بوو: یەکەمیان ئەوە بوو فەرەنسا لەوە ئاگادار بکاتەوە کە ئەڵمانیاش زلهێزە و ناکرێت پشتگوێ بخرێت و بیگەیەنێتە ئەو باوەڕەی تەنها بە هاوپەیمانێتیبەستن و رێککەوتن لەگەڵ بریتانیادا ناتوانێت هەموو شتێك بکات، دووەمیشیان ئەوە بوو کە شکستێکی دیپلۆماسی بە فەرەنسا بگەیەنێت، لەو کاتەشدا کە رووسیای هاوپەیمانی فەرەنسا سەرقاڵی شەڕی ژاپۆنییەکان و شۆڕشی ساڵی ١٩٠٥ بوو، بۆیە ئەڵمانییەکان ئەوەندەی تر لەسەر ئەم کارەیان پێداگربوون.

راوێژکاری ئەڵمانیا (بێرنارد فۆن بولۆڤ) هەر لە ساڵی ١٩٠٤ەوە و لە کاتی بەستنی پەیمانی دۆستانەی نێوان فەرەنسا و بریتانیا، پێشنیاری بۆ ئیمپراتۆر کردبوو، کە کەشتی جەنگی بنێرنە کەنارەکانی مەغریب، بەڵام ئیمپراتۆر کە ئەوکاتە (ویلیەمی دووەم) بوو ١٨٨٨-١٩١٨، بەمە رازی نەبوو، دوای ئەوەی شاندەکەی فەرەنسا گەیشتە مەغریب، جارێکی تر (فۆن بولۆڤ) پێشنیاری کردەوە بۆ ئیمپراتۆر کە لەو گەشتەیدا بۆ ناوچەکانی دەریای ناوەڕاست دەیکات، سەردانی مەغریب بکات، ئەوە بوو ئیمپراتۆر بەمە رازیبوو، لە ساڵی ١٩٠٥دا گەیشتە بەندەری تەنجە و گوتارێکی پێشکەش کرد و تیایدا ئاماژەی بەوە کرد کە هاتووە بۆ سەردانی سوڵتانی هاوڕێی و ئامادەشە بەرگری لە سیادە و سەربەخۆیی مەغریب بکات و دژ بە بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا بووەستێتەوە، ئەمەش وای لە سوڵتانی مەغریب کرد کە پێشنیارەکانی شاندە فەرەنسییەکە رەت بکاتەوە و داوای ئەوە بکات کە ئەو پێشنیارانە بدرێتە کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی. ئەڵمانیاش راستەوخۆ پشتگیری لێکرد، بەڵام فەرەنسا بەمە رازی نەبوو و بەمەش قەیرانی مەراکیشی یەکەم دەستیپێکرد. ئەڵمانییەکان جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی بۆ ئەم کێشەیە ببەسترێت، چونکە پێیان وابوو بەشی هەرە زۆری زلهێزەکان پشتگیری لە سەربەخۆیی مەغریب دەکەن، ئەمەش دەبێتە سەرکەوتنێکی دیپلۆماسی گەورە و بێ ئەوەی هیچ تێچوونێکی ماددی تێبچێت، لە بەرانبەریشدا وەزیری دەرەوەی فەرەنسا، (دێل کاسیە)، داوای لە حکومەتی فەرەنسی کرد کە لە بەرانبەر ئەم فشارانەی ئەڵمانیا خۆڕاگر بن، بەڵام وەزیرەکانی تری فەرەنسا کەوتنە قەیرانەوە و لەنێو خۆیاندا بوون بە دووبەرە، بەرەیەکیان لەگەڵ خۆڕاگریدا بوون و بەرەیەکیشیان لەگەڵ ئەوەدا بوون کە بە کۆنگرەی نێودەوڵەتی رازیبن، (فۆن بولۆڤ)ی راوێژکاری ئەڵمانیش ئەمەی قۆستەوە و فشاری زیاتری خستە سەر فەرەنسییەکان و هەڕەشەی بەکارهێنانی سوپای لە فەرەنسا کرد ئەگەر مەغریب داگیر بکات، ئەمەش ئەوەندەی تر دۆخی ناوخۆیی فەرەنسای ئاڵۆزکرد و وایکرد کە (دێل کاسیە) نەتوانێت باوەڕ بە فەرەنسییەکان بهێنێت کە ئەمە تەنها فێڵێکی ئەڵمانییەکانە بۆ لەخشتەبردنی فەرەنسییەکان، بۆیە لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٥دا دەستی لەکارکێشایەوە، کە هەر ئەمە بۆخۆی سەرکەوتنێکی دیپلۆماسی گەورە بوو بۆ ئەڵمانییەکان و دواتریش فەرەنسییەکان بە بەستنی کۆنگرەی نێودەوڵەتی رازیبوون. ئەمەش سەرکەوتنێکی تر بوو بۆ ئەڵمانەکان.

له ١٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٠٦دا له دوورگەی سەوزی ئیسپانیا کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی بۆ کێشەی مەراکیش بەسترا، که به کۆنگرەی سەوز ناسرا، لەم کۆنگرەیەدا جگه له نوێنەری ئەڵمانیا، فەرەنسا، نوێنەری هەریەکه له بریتانیا و رووسیا و ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر و ئیسپانیا و بەلجیکا و ئیتالیا و هۆڵەندا و وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و پۆرتوگاڵ و مەغریبیش ئامادەبوون. گفتوگۆکانی ئەم کۆنگرەیه تا نیسانی هەمان ساڵی خایاند و نوێنەرانی مەغریب و نەمسا-مەجەر پشتگیرییان له ئەڵمانیا دەکرد و نوێنەرانی وڵاتەکانی تریش به تایبەت رووسیا پشتگیرییان له فەرەنسا دەکرد، سەرەنجامی کۆنگرەکەش گەڵاڵەنامەی جەزائیر بوو که تیایدا جەخت لەسەر سەربەخۆیی و یەکێتی خاکی مەغریب کرایەوە و هەروەها تیایدا هاتبوو که مافی ئازادی بازرگانی بۆ هەموو وڵاتان له مەغریب یەکسان بێت و بڕیاری هەندێك چاکسازیش درا که پێشتر له پێشنیارەکانی شاندەکەی فەرەنسادا هەبوو و پاراستنی بەندەرەکانی مەغریب درایه فەرەنسا و ئیسپانیا و بڕیاریش درا بانکێکی مەغریبی دامەزرێت که هەموو وڵاتانی بەشداربووی کۆنگرەکه پشکیان تێدا بێت، به مەرجێك هەر وڵاتێك یەك پشك بێت، بەڵام فەرەنسا سێ پشکی هەبێت، هەروەها ئەرکی پاراستنی سنووری جەزائیر و مەغریب درا به فەرەنسا، که بەشی زۆری ئەم خاڵانه له پێشنیارەکانی شاندەکەی فەرەنسادا هەبوون، کەواته ئەگەرچی بەستنی کۆنگرەکه سەرکەوتنێکی دیپلۆماسی گەورەبوو بۆ ئەڵمانیا، بەڵام ئەنجامەکانی شکست بوو بۆی و بگرە سەرکەوتنیش بوو بۆ فەرەنسا، چونکه بەشی زۆری خاڵەکانی پێشنیارەکانی شاندەکەی فەرەنسا رەچاو کرابوو، لەلایەکی تریشەوە هاوپەیمانێتییەکەی بریتانیا و فەرەنسا، که ئەڵمانیا دەیویست له رێگەی ئەم کێشەیەوە گورزی لێ بووەشێنێت، ئەوەندەی تر بەتین بوو، ئەمه جگه لەوەی که ئاشتبوونەوەی رووسیا و بریتانیای لێکەوتەوە، ئەمیش گورزێکی تر بوو بۆ ئەڵمانیا.

## ٢ـ قەیرانی باڵکانی یەکەم (١٩٠٨-١٩٠٩):

یەکێکی تر لەو ناوچه زۆر ئاڵۆز و پڕ کێشانەی بەر له جەنگی یەکەمی جیهان، ناوچەکانی باڵکان بوو، که ناوچەیەکی گرنگ و پڕ ململانێی نێوان زلهێزەکان بوو بەتایبەت رووسیا و نەمسا. وڵاتانی باڵکان که له یۆنان و سربیا و رۆمانیا و بولگاریا و مۆنتینگرۆ و ئەلبانیا و بۆسنه هەرسك پێکدەهات و هەر له سەدەی چواردەوە له ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو، بەڵام دوای ئەوەی له سەدەی نۆزدەدا هەستە نەتەوایەتییەکان لەگەشەسەندندا بوون له ئەوروپاوە بەرەو ناوچەکانی باڵکان تەشەنەی دەکرد، ئیدی زنجیرەیەك شۆڕشی یەك لەدوای یەك لەو ناوچانه

لە دژی دەوڵەتی عوسمانی دەرکەوتن. رووسیاش بە بیانووی پاراستنی مەسیحییە ئەرتەدۆکسییەکان و رەگەزی سلاڤی لە باڵکان، هەر لە سەرەتاوە پشتگیری بەشێکی زۆری ئەو بزووتنەوانەی دەکرد، کە سەرەنجامی ئەو بزووتنەوانەش ئەوە بوو لە ساڵی ١٨٣٢دا یۆنان سەربەخۆیی خۆی بەدەستهێنا و لە ساڵی ١٨٢٩شدا سربیا و رۆمانیا دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمیان بەدەستهێنا و لە هاوینی ١٨٧٨یشدا لە کۆنگرەی بەرلین، بڕیاردرا کە سەربەخۆیی تەواو بدرێت بە سربیا و رۆمانیا و ئۆتۆنۆمیش بە بولگاریا لە ژێر حوکمی (ئەلیکساندەر دۆباتێنریکی) لایەنگری رووسی، هەروەها سەربەخۆیی بە مۆنتینگرۆ و بەڕێوەبردنی بۆسنە و هەرسکیش درا بە ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر بە مەرجێك بەشێك بن لە دەوڵەتی عوسمانی، رووسیا وەك پێشتر باس کرا، زۆردەمێك بوو ناوچەکانی باڵکانی بە ناوچەی نفوزی خۆی دەزانی و بەردەوام هەوڵی دەدا لەوێوە بگاتە گەروەکانی فۆسفۆر و دەردەنیل، بۆ ئەمەش هەر لە سەرەتاوە رووبەڕووی بەرژەوەندی زلهێزەکان بووبووەوە، بە تایبەتی بریتانیا، لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەش بەدواوە، دوای ئەوەی ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر ناوچەیەکی زۆری بەهۆی یەکێتی ئەڵمانیا و یەکێتی ئیتالیاوە لەدەست دا و رووی فراوانخوازییەکانی لە ناوچەکانی باڵکان کرد، ئیدی رووسیا رووبەڕووی ململانێی نەمسا-مەجەریش بووەوە لە ناوچەکەدا، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٧٨دا ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر مافی ئیدارەکردنی بۆسنە و هەرسك بەدەست هێنا، ئەوەندەی تر کێشەی رووسیا لەگەڵ نەمسا قوڵ بۆوە، بەڵام لە ساڵی ١٨٩٨دا بە ناچاری رووسیا و نەمسا رێککەوتن لەسەر ئەوەی کە دۆخی باو لە باڵکاندا بپارێزرێت، کەچی دوای دە ساڵ ئەم رێککەوتنە لەلایەن ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەرەوە شکێنرا و جارێکی تر کێشەکانی نێوان رووسیا و نەمسا سەریان هەڵدایەوە و قەیرانی یەکەمی باڵکانی لێکەوتەوە.

کێشەکە زیاتر لەوێوە دەستیپێکرد، کە لە ساڵی ١٩٠٣دا لە بەلگرادی پایتەختی سربیا کودەتایەك رووی دا و لابردنی ئەو پاشایەی لێکەوە کە لایەنگری نەمسا بوو، و پاشایەك هاتە سەر حوکم کە سەر بە رووسیا بوو، دوای ماوەیەکی کەم دەسەڵاتەکانی نەمسای لە سربیا نەهێشت، بۆیە نەمسا-مەجەر لە ترسی کەمبوونەوەی بەرژەوەندییەکانی لە ناوچەکە و لەلایەکی تریشەوە یەکگرتنی سلاڤیەکان لەژێر سایەی سربیا دەیەویست سربیا ئابلۆقە بدات و نەهێڵێت هەمان ئەو رۆڵە بگێڕێت کە سەردینیا لە ئیتالیا گێڕای و بیری لەوە کردەوە کە بە زنجیرەیەك هاوپەیمانێتی لەگەڵ رۆمانیا و بولگاریا و دامەزراندنی دەوڵەتی ئەلبانیا ئابلۆقەی سربیا بدات و نەهێڵێت بەرەو ناوچەی ئەدریاتیك بکشێت. کەواتە سربیا لە ناوچەکەدا بوو بە

یەکێك لە دوژمنەکانی نەمسا-مەجەر و هاوپەیمانی رووسیا، لەو سەروبەندەدا بوو، کە وەزیری دەرەوەی ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر و سەرۆکی سوپاکەی بوون بەو کەسانەی کە سیاسەتی توندیان بەرانبەر بە سربیا هەبوو، کەواتە تا دەهات کێشەکە ئاڵۆزتر دەبوو، هەر لەوکاتەشدا بوو کە لە ساڵی ١٩٠٧ رووسیا کێشەکانی خۆی لەگەڵ بریتانیا کۆتایی پێهێنابوو و جارێکی تری چاوی بڕیبووەوە ناوچەکانی باڵکان، کەواتە لەو ماوەیەدا کێشەکە بەڕادەیەکی زۆر لەبرەوسەندندا بوو، بۆیە لە ساڵی ١٩٠٨دا بە مەبەستی هێورکردنەوەی ئەو دۆخە هەردوو وەزیری دەرەوەی رووسیا و نەمسا-مەجەر رێککەوتننامەیەکیان کرد و تیایدا وەزیری دەرەوەی نەمسا رازیبوو کە پشتگیریی رووسیا بکات بۆ کردنەوەی تەنگەبەرەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەڕووی کەشتییە جەنگییەکانیدا لە بەرانبەر ئەوەی بۆسنەو هەرسك بدرێت بە نەمسا و لێرەشەوە گورزێکی گەورە بە لوتبەرزییەکەی سربیا بکەوێت، کە دەمێك بوو دەیویست ئەو ناوچانە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. کودەتای ساڵی ١٩٠٨ی ئیتیحادوتەرەقی لە دەوڵەتی عوسمانی رێخۆشکەرەیەکی زۆری ئەم رێککەوتنەی رووسیا و نەمسا-مەجەر بوو.

بەڵام رووسیا بۆ ئەوەی ئەو وڵاتانە رازیبکات، کە پەیوەندییان بە تەنگەبەرەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە هەیە، پێویستی بە کاتی زۆر بوو، کەچی نەمسا چاوەڕێی ئەمەی نەکرد، بەڵکو لە ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٨دا رایگەیاند کە بۆسنە و هەرسك لەژێر سایەی ئەودان.

ئەم کارەی نەمسا ناڕەزایەتییەکی نێودەوڵەتی خستەوە، چونکە دەوڵەتی عوسمانی لەمە رازینەبوو، هەروەها سربیەکانیش بەم کارە نیگەران بوون، رووسیاش بەو بیانووەی کە هاوسەنگی هێز لە باڵکان تێکچووە، نیگەرانی خۆی لەم دۆخە دەربڕی، فەرەنسا و بریتانیاش دەیانگوت ئەمە شکاندنی پەیماننامەی بەرلینە و پێی رازی نەبوون، بۆیە ئەم کارەی نەمسا بارودۆخەکەی بەرەو ئاڵۆزی برد، بە تایبەتی رووسیا زۆر بە توندی بەرپەرچی ئەم هەنگاوەی نەمسای دایەوە و وەزیری دەرەوەی بە ئاشکرا ئاماژەی بەوە کرد رەنگە کێشەی سەربازی لەنێوان نەمسا و رووسیا لە ئەنجامی ئەم دۆخەدا بکەوێتەوە، هاوکات هەردوو سەرۆك ئەرکانی ئەڵمانیا و نەمساش بە حکومەتەکانی خۆیان راگەیاند کە کاتی رووبەڕووبوونەوەی فەرەنسا و رووسیا هاتووە، کەواتە دۆخەکە بوو بەقەیرانێکی سیاسیی گەورە لە نێوان رووسیا و نەمسا لەوکاتەدا، ئەڵمانیاش جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر نەمسا لەگەڵ رووسیا بکەوێتە جەنگەوە ئەوا پشتگیری نەمسا دەکات، بەڵام لە بەرانبەردا فەرەنسا و سربیای هاوپەیمانانی رووسیا هەڵوێستێکی توندیان نەبوو بۆ پشتگیریکردنی رووسیا، بۆیە لەو

قەیرانەدا هەڵوێستی نەمسا لە رووسیا بەهێزتر بوو، ئەمەش رووسیای ناچارکرد مل بۆ رەوشەکە بدات و بە هەنگاوەکانی نەمسا رازیبێت، کە سەرکەوتنێکی دیپلۆماسی گەورە بوو بۆ نەمسا، بەڵام لەلایەکی ترەوە بووە مایەی نزیکبوونەوەی وڵاتانی ویفاقی سێ قۆڵی، هەروەها بووژانەوەی هەستی دژەنەمسایی لە سربیا و دامەزراندنی چەند رێکخراوەیەکی تایبەت بە دژایەتیکردنی دەسەڵاتی نەمسایی لە بۆسنە، کە یەکێك لەوانە کۆمەڵەی دەستی رەش بوو و هۆکاری راستەوخۆی جەنگی یەکەمی جیهان کوشتنی یەکێك لە بنەماڵەی هابسبۆرگ بوو لەسەر دەستی ئەندامێکی ئەم رێکخراوەیە.

**٣. قەیرانی مەراکیشی دووەم (ئەغادیر ١٩١١):**

کۆنگرەی دوورگەی سەوز نەیتوانی بە تەواوی کێشەکانی نێوان ئەڵمانیا و فەرەنسا کۆتایی پێبهێنێت، بۆیە ئەڵمانیا بە بەردەوامی چاودێری جوڵەکانی فەرەنسا بوو لەو ناوچەیەدا، بەڵام لە ٩ی شوباتی ١٩٠٩شدا رێککەوتنێك لە نێوان هەردوو لایان بەسترا کە تیایدا جەخت لەسەر ماددەکانی ویفاقی جەزیرە کرایەوە، هەروەها ئەڵمانیاش دانی بە بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا دانا لە مەغریب بەرانبەر بەوەی فەرەنساش دان بە بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی ئەڵمانیادا بنێت لەوێ، بەڵام هێندەی نەبرد جارێکی تر ناکۆکی لە نێوان ئەم دوو لایەنە لە ساڵی ١٩١١دا دەرکەوتەوە و بوو بە قەیرانێکی سیاسیی نێودەوڵەتی.

لەو ساڵەدا چەند هۆزێك لە دژی سوڵتان مەولای عەبدولحەفیزی مەغریب (١٩٠٨-١٩١٣) راپەڕینیان بەرپا کرد، فەرەنساش ئەمەی قۆستەوە و بەبیانووی پارێزگاریکردن لە سوڵتان سوپایەکی ناردە مەغریب و چەند شارێکی مەغریبی داگیرکرد، لە هەمان کاتیشدا سوپای ئیسپانیاش چەند شارێکی تری داگیرکرد، لەبەرانبەر ئەمەدا ئەڵمانیا بڕیاری دا دەست لە کاروباری مەغریب وەربدات و لەم پێناوەشدا چەند ناوچەیەکی گرنگ داگیر بکات وەك پەرچەکردارێك بۆ کارەکانی فەرەنسا و ئیسپانیا، بۆیە لە ١ی تەمموزی ١٩١١دا کەشتییە جەنگییەکانی خۆی ناردە بەندەری ئەغادیر، هاوکاتیش یاداشتێکی دایە زلهێزەکان کە تیایدا هۆکاری ئەم کارەی خۆی روون کردبۆوە کە بریتی بوون لە

**أ.** بەهاناوەچوونی خاوەن بەرژەوەندییە ئەڵمانییەکان لە مەغریب.

**ب.** نیگەرانی ڕای گشتی ئەڵمانیا لە دوورەپەرێزخستنی ئەڵمانیا لە چارەسەرکردنی کێشەکانی مەغریب.

**ت.** فەرەنسا و ئیسپانیا بڕیارەکانی کۆنگرەی سەوزیان شکاندووە.

ئەڵمانیا رایگەیاند کە ئامادە نییە کەشتییەکانی لەو بەندەرەدا بکشێنێـتەوە تا ئەو کاتەی فەرەنسا و ئیسپانیا هێزەکانیان نەکشێننەوە، کێشەکان بە رادەیەکی زۆر قوڵبوونەوە، بەڵام لە ١٠ی تەمموزی ١٩١١دا گفتوگۆ لە نێوان ئەڵمانیا و فەرەنسا دەستیپێکرد و تا ٤ی کانوونی دووەمی هەمان ساڵی خایاند و لە ئەنجامیشدا هەردوولا گەیشتنە رێککەوتن و کۆتایی بە کێشەکە هات و بەپێی ئەم رێککەوتنەش ئەڵمانیا دان بە چاودێری فەرەنسی بەسەر مەغریبەوە بنێت لەبەرانبەر ئەوەی فەرەنسا دەستبەرداری بەشێك لە کۆنگۆی فەرەنسی بێت بۆ ئەڵمانیا، بەمەش کۆتایی بە قەیرانەکە هات و ئەم قەیرانەش بووە مایەی زیاتر گرژکردنی پەیوەندی نێوان ئەڵمانیا لەلایەك و فەرەنسا و بریتانیاش لە لایەکی تر، چونکە لە کاتی گفتوگۆکاندا هەریەکە لە ئەڵمانیا و فەرەنسا هەڕەشەی بەکارهێنانی چەکیان لەبەرانبەری ئەویتریان دەکرد، بریتانیاش رایگەیاند کە ئەگەر ئەڵمانیا لە دژی فەرەنسا شەڕ بکات، ئەوا ئەو پشتگیریی فەرەنسا دەکات، بەم جۆرەش ئەم قەیرانە ئەگەر چی یەکێك بوو لەو کێشە سیاسییانەی کە پشێوییەکی گەورەی نایەوە بەر لە جەنگی یەکەمی جیهان، هاوکات هەنگاوەکانی بەرەو دووجەمسەری جیهانی خێراتر کرد.

## ٤. قەیرانی باڵکانی دووەم (١٩١٢–١٩١٣):

سەرەتاکانی ئەم قەیرانە دەگەڕێتەوە بۆ بەهاری ١٩١٢، چونکە لە مارتی ئەو ساڵەدا هەر یەك لە سربیا و بولگاریا پەیماننامەیەکیان بۆ دابەشکردنی مەکدۆنیا بەست، لە مانگی ئایاری هەمان ساڵیشدا هەریەکە لە یۆنان و مۆنتینگرۆ چوونە ناو رێککەوتننامەکەوە و بەمەش کۆمەڵەی باڵکانی دامەزرا، ئەم کۆمەڵەیە زیاتر لەدژی دەوڵەتی عوسمانی دامەزرا و لەو کاتەشدا خراپی بەڕێوەبردنی تورکیا لە ناوچەکە و شکستەکانی سوپای عوسمانی لەبەرانبەر ئیتالیا لە لیبیا رۆڵی گەورەیان هەبوو لە دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە.

هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی کۆمەڵەکەوە رووسیا پشتگیرییەکی زۆری لێدەکرد، چونکە وەك بەربەستێك دای دەنا لەبەردەم هەر دزەکردنێکدا بەرەو ئەو ناوچەیە، کە بە ناوچەی نفوزی خۆی دەزانی، ئەوە بوو رووسیا خۆی لە بولگاریا نزیك کردەوە و لەبەدەستهێنانی سەربەخۆییەکەی لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا، یارمەتییەکی زۆری دا. هەر لەو کاتەشدا رووسیا ویستی وا لە فەرەنسا بکات یارمەتی بدات لە کێشەکانی لە گەرووەکانی تورکیا و سیاسەتەکانی لە ناوچە سلاڤییەکاندا.

لە ١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩١٢دا کۆمەڵەی باڵکانی جەنگیان لە دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند، لە ماوەی شەش حەفتەدا توانیان نزیکەی ٦٠٠ هەزار سەرباز بنێرنە بەرەکانی جەنگ و شکستێکی گەورەش بە عوسمانیەکان بدەن و سەرجەم ناوچە ئەوروپییەکان، جگە لە ئەستەنبول، لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بهێننە دەرێ. ئەم سەرکەوتنە گەورەیە و ئەم گۆڕانە گەورەیە لە ناوچەکەدا، پەرچەکردارێکی نێودەوڵەتی جۆراوجۆری لێکەوتەوە، چونکە زلهێزەکان بەم ڕووداوە خۆیان لەبەردەم گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە ناوچەکەدا بینییەوە، کە پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی ئەوان بوو. ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر بەم دۆخە زۆر نیگەران بوو، چونکە ئەم سەرکەوتنە بە ڕادەیەکی زۆر لە پێگەی سربیای دوژمنی زیاد دەکرد، ڕووسیاش بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی لە گەرووە تورکییەکاندا پێی باش نەبوو ئەستەنبول لەژێر دەستی بولگاریادا بێت، ئەڵمانیاش بەو دۆڕانە زۆر بێزار بوو، چونکە ئەو بوو مەشقی بە سوپای عوسمانی دەکرد و پڕچەکی دەکرد، جگە لەمانیش هەریەکە لە بریتانیا و فەرەنسا بە دوودڵییەکی گەورەوە دەیانڕوانییە ڕەوشەکە، چونکە گۆڕانکارییەکان بەپێی ویستی ئەوان نەبوو، بۆیە زلهێزەکان دوای ئەوەی کە دەوڵەتی عوسمانی داوای لێکردن بێنە ناو کێشەکەوە، زۆر بە خێرایی هاتنە ناوەوە و ئاگربەستیان بەسەر وڵاتانی باڵکاندا سەپاند، ئەوە بوو دوای ئاگربەستەکە لە ٣ی کانوونی یەکەمی ١٩١٢دا کۆنگرەیەکی ئاشتی لە لەندەن بەسترا، لەم کۆنگرەیەشدا ململانێ و ناکۆکی لەبارەی ڕەوشەکەوە لە نێوان زلهێزەکان دەرکەوت، چونکە ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر زۆر پێداگری لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئەلبانیا دەکردەوە بۆ ئەوەی ڕێگر بێت لە سربیای دوژمنی، کە دەروازەیەکی نەبێت بۆ سەر دەریای ئەدریاتیك، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ڕووسیا سووربوو لەسەر ئەوەی ئەم دەروازەیە بۆ سربیای هاوپەیمانی بەدەست بهێنێت، ئەمەش بووە هۆکاری ململانێیەکی قورس لە نێوان هەردووکیاندا، کە تا ڕادەی کەوتنەوەی جەنگ لە ئەوروپا توند بوو، بەڵام دواتر ئەڵمانیا توانی نەمسا هێور بکاتەوە و بریتانیاش ڕووسیا سارد بکاتەوە و کێشەکەش بەوجۆرە یەکلا بکرێتەوە کە دەوڵەتێکی ئەلبانی سەربەخۆ دابمەزرێت کە لە لایەن لایەنگرێکی ئەڵمانییەوە حوکم بکرێت.

لە سەروبەندی کۆنگرەی لەندەندا جارێکی تر جەنگی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و کۆمەڵەی باڵکانی ڕووی دایەوە، چونکە لەو کاتەدا لە دەوڵەتی عوسمانیدا تورکە لاوەکان بەڕێی کودەتایەکەوە هاتنە سەر حوکم و ئەو شکستە گەورەیەی تورکیایان پێ قبوڵ نەبوو و ڕازینەبوون بەوەی کە وڵاتەکەیان ئەو ناوچە زۆرە لەدەست بدات، بۆیە شەڕیان لەدژی کۆمەڵەی

باڵکانی ڕاگەیاندەوە، بەڵام ئەنجامی جەنگەکە زۆر لەوەی پێشووتر خراپتر بوو، چونکە سوپای کۆمەڵەی باڵکانی لە جاری پێشووتر خراپتر شکستی بە سوپای عوسمانی هێنا و ناچاری کرد کە ناوچەی ئەدەرنەش بدات بەدەستەوە، بۆیە جارێکی تر لە ٣٠ی ئایاری ١٩١٣دا پەیماننامەی لەندەن بەسترایەوە و دەوڵەتی عوسمانی دەستبەرداری تەواوی ناوچەکانی ئەوروپا بوو، تەنها ئەستەنبوڵ و نیمچە دوورگەی گالیبۆلی نەبێت.

دوای بەستنی پەیماننامەی لەندەن، کێشە سەرەکییەکان لە نێوان وڵاتانی ئەندامی کۆمەڵەی باڵکاندا بە هەڵواسراوی مابوونەوە، کە ئەویش دیاریکردنی سنووری دەوڵەتی تازە دانراوی ئەلبانیا و دابەشکردنی ئەو ناوچانەی کە کۆمەڵە دەستی بەسەردا گرتبوو، بەڵام وڵاتانی کۆمەڵە لەم ڕووەوە نەیانتوانی بگەنە ڕێککەوتنێکی یەکلاکەرەوە، چونکە دامەزراندنی دەوڵەتی ئەلبانیا بێنەوبەرەیەکی زۆری لەنێوانیاندا نابۆوە، هەروەها ئەو کێشەیەی کە ئایا سربیا شوێن پێی بگاتە دەریای ئەدریاتیك یان نا، ئەمە جگە لەوەی کە لەسەر چەند ناوچەیەکی تر کێشە و هەرا لە نێوان ئەو دەوڵەتانە دروست بووبوو، بۆیە بولگاریا بەو پێیەی کە باری هەرە گەورەی شەڕی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا لەسەر شان بوو، پێیوابوو زۆر بە ئاسانی دەتوانێت دژی یۆنان و سربیا بەیەکەوە بجەنگێت، ئەوە بوو لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩١٣دا بەبێ ئاگادارکردنەوە هێرشی کردە سەر یۆنان و سربیا، بەمەش جەنگ لە نێوان وڵاتانی کۆمەڵەی باڵکانی کەوتەوە، بەڵام بارودۆخەکە بەوجۆرە نەبوو کە بولگاریا داینابوو، چونکە ئەم دوو وڵاتە بەیارمەتی سوپای ڕۆمانی و پشتگیری دەوڵەتی عوسمانی توانیان شکست بە بولگاریا بهێنن و ناچاری بکەن بە بەستنی پەیماننامەی ئاشتی بوخارێست، بەپێی ئەم پەیماننامەیەش ناوچەکانی مەکدۆنیا و تراقیا و چەند ناوچەیەکی تر بەر سربیا و یۆنان و ڕۆمانیا کەوتن، لە ٢٩ی ئەیلولی ١٩١٣شدا بەپێی پەیماننامەیەکی تر ناوچەی ئەدەنە درایەوە بە دەوڵەتی عوسمانی، دوای ئەویش لە کانوونی یەکەمی ١٩١٣دا پەیماننامەی دووەمی لەندەن بە مەبەستی ڕێکخستنی دەوڵەتی نوێی ئەلبانیا بەسترا، بەم جۆرەش قەیرانی دووەمی باڵکان کۆتایی پێهات، بەڵام بێ ئەوەی چارەسەرێکی کۆتایی بۆ کێشەکان بکرێت، بەڵکو هەریەکێك لەم قەیرانانە تەنها بە ئاشتییەکی ماوە کورت، کۆتاییان پێهات و ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لەوەی دووبەرەیی زلهێزەکان قوڵتر بکەنەوە و کێشەکانی نێوان ئەم دوو بەرەیەش ئاڵۆزتر بکەن و ئەگەرەکانی کەوتنەوەی جەنگی یەکەمی جیهان مسۆگەرتر بکەن.

## سێیەم: دەستپێکی جەنگی یەکەمی جیهان و ڕووداوەکانی

### – هۆکاری ڕاستەوخۆی جەنگ

بە باسکردنی ئەو هۆکار و بارودۆخانەی کە پێشتر باسکران، بۆمان دەرکەوت کە زلهێزەکانی ئەوکات ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بەرەو ئاقاری جەنگ دەڕۆیشتن و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان گرژ و ئاڵۆزتر دەبوون و لێرەو لەوێ چەندین جار زلهێزەکان لە جەنگ نزیك دەبوونەوە، مابۆوە ئەوەی کە لە ڕووداوێکدا ئاگری ئەم جەنگە بە تەواوەتی بتەقێتەوە، ئەویش ئەو ڕووداوە بوو کە لە ٢٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٤ لە (سەرایڤۆ)ی پایتەختی بۆسنە ڕووی دا، کە کوشتنی جێنشینی نەمسا-مەجەر ئەرشیدۆك (فرانسیس فێردیناند) و خێزانەکەی بوو لەلایەن (گەڤەرلۆ پرەنسیپ)ەوە کە یەکێك بوو لە ئەندامانی ڕێکخراوەی دەستی ڕەش، کە بۆ یەکێتی سربیا کاری دەکرد. ئەم ڕووداوە بوو بە هۆکاری ڕاستەوخۆی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان.

لە سەرەتای ڕووداوەکەوە نەمساییەکان هەوڵیان دا ئەم ڕووداوە بۆ کۆتاییهێنان بە دەوڵەتی سربیا بیقۆزنەوە، هەرچەندە لەوەش دڵنیا بوون کە ڕاگەیاندنی جەنگ لە دژی سربیا تێوەگلانی ڕووسیاشی لێدەکەوێتەوە، دوای ڕوودانەکە، حکومەتی نەمسا-مەجەر لە ٢٣ی تەمموزی ١٩١٤دا ئاگادارکردنەوەیەکی ئاراستەی حکومەتی سربیا کرد و تیایدا هاتبوو پێویستە سەرجەم ئەو ڕێکخراوانە هەڵوەشێنێتەوە کە دژی ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر پڕوپاگەندە بڵاودەکەنەوە و ڕێکخراوەی دەستی ڕەشیش لە پێش هەموویانەوە بێت، هەروەها داوای کردبوو سربیا بەشوێن ئەو کەسانەدا بگەڕێت کە دەستیان لە تاوانەکەدا هەبووە و دەستگیریان بکات، ئاماژەشی بۆ ئەوە کردبوو کە ئەفسەرێکی نەمسایی ڕەوانەی سربیا بکرێت و بەدواداچوون بۆ ڕووداوەکە بکات. ئەگەرچی حکومەتی سربیا ڕەنگە بە خاڵەکانی پێشووتر ڕازی بووبووایە، بەڵام ئەو خاڵەی کە پەیوەست بوو بە ناردنی ئەفسەریی نەمساییەوە، مایەی قبوڵکردنی سربییەکان نەبوو، ئەمەش بووە هۆی کەوتنەوەی بێنەوبەرەیەکی گەورە لە ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی ئەوکاتەدا هەوڵێکی زۆر بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە درا، بەڵام ڕەوشەکە زیاتر بەلای تێکچووندا بوو تا ئەوەی لە ٢٥ی تەمموزی ١٩١٤دا پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی نێوان هەردوو لا بپچڕێت و دوای سێ ڕۆژیش ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر شەڕ لە دژی سربیا ڕابگەیەنن.

رووسیاش که لەو کاتەدا هاوپەیمانی نزیکی سربیا بوو، نەیدەتوانی دەستبەرداری هاوپەیمانێتییەکەی ببێت، بۆیە داوای لە نەمسا کرد کە کرداره سەربازییەکانی رابگرێت و وەك ئاماژەیەکیش بۆ لایەنگیریکردنی سربیا، نیوەئامادەباشی راگەیاند، کە هۆکاری سەرەکی ئەم هەڵوێستەشی لەوێوه سەرچاوەی گرتبوو، پێیوابوو ئەگەر پشتیوانی سربیا نەکات ئەوا متمانەی خۆی لەلای گەلانی تری ناوچەکە لەدەست دەدات، هەروەها ئەگەر نەمسا بەسەر سربیادا زاڵ بێت، ئەوا دەسەڵاتی لە ناوچەکانی باڵکان و دانوب فراوانتر دەبێت، وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ ئەم هەڵوێستەی رووسیا، ئەڵمانیاش لە ۲۹ی حوزەیرانی ۱۹۱٤دا رایگەیاند ئەگەر رووسیا لە بڕیاری نیوەئامادەباشی پاشگەز نەبێتەوە، ئەوا ئەڵمانیا بڕیاری ئامادەباشی گشتی رادەگەیەنێت، لە بەرانبەریشدا رووسیا بە راگەیاندنی ئامادەباشی گشتی، وەڵامی ئەڵمانیای دایەوە، ئەڵمانیاش لە وەڵامی ئەم هەنگاوەی رووسیادا، لە ۳۱ی تەممووزدا ئاگادارکردنەوەیەکی ئاراستەی هەر یەکە لە رووسیا و فەرەنسا کرد و لە ۱ی ئابیشدا ئامادەباشی گشتی راگەیاند، لە وەڵامی ئەمەشدا فەرەنسا وەك پشتگیرییەك بۆ رووسیای هاوپەیمانی، ئامادەباشی گشتی راگەیاند. کەواتە بارودۆخەکە تا دەهات بەرەو ئاڵۆزی و گرژی دەچوو، بەڵام لەو کاتەدا بریتانیا رایگەیاند کە ئامادەنییە ئامادەباشی گشتی رابگەیەنێت و ناچاریش نییە یارمەتی سەربازی بدات بە فەرەنسا، ئەگەر لەگەڵ ئەڵمانیادا بکەوێتە جەنگەوە، ئەم هەڵوێستەی بریتانیا ئەوەندەی تر دۆخەکەی ئاڵۆز کرد، چونکە هێندەی تر هاندەری ئەڵمانیا بوو بۆ ئەوەی فەرمان بە سوپاکانی بکات لە ۲ی ئابی ۱۹۱٤ لەڕێی بەلجیکاوە بەرەو داگیرکردنی فەڕەنسا بڕۆن، ئەگەرچی بەلجیکا وڵاتێکی بێ لایەنیش بوو، بەڵام ئەم کارەی ئەڵمانیا پەرچەکردارێکی بەهێزی لە رای گشتی بریتانیای لێکەوتەوە، چونکە بریتانییەکان داگیرکردنی بەلجیکایان بە مەترسییەکی گەورە بۆسەر بەرژەوەندییەکانیان لێکدایەوە، بۆیە رایانگەیاند کە ئەوان رێگە نە بە ئەڵمانیا و نە بە هیچ زلهێزێکی تر دەدەن بنەماکانی پارسەنگی هێز تێك بدات، ئەمەش وایکرد کە بریتانیا بە هەڵوێستی خۆیدا بچێتەوە و لە ٤ی ئابدا رایبگەیەنێت کە لەم جەنگەدا بەشداری هاوپەیمانەکانی دەکات، بەم جۆرەش لەدەستپێکی جەنگی یەکەمی جیهاندا ئەو وڵاتانەی کە بەشداربوون لەبەرەی ویفاقی دۆستانەدا بریتی بوون لە فەرەنسا و رووسیا و بریتانیا و سربیا، لەبەرەی بەرانبەریشدا ئەڵمانیا و نەمسا-مەجەر بوون.

## –  ڕووداوەکانی جەنگ

جیاوازی لە ئاست و ئیمکانیاتی هەریەك لەم دوو بەرەیە وایکرد  ئەم جەنگە ماوەیەکی دوور و درێژ بخایەنێت، چونکە ئەڵمانیا دەمێك بوو لەڕووی چەك و سوپاوە خۆی سازدەدا، بۆیە سوپایەکی پڕچەکتر و سەربازێکی باشتری لە وڵاتانی ویفاقی دۆستانە هەبوو، لە بەرانبەریشدا ئەوان توانایەکی گەورەی ئابووری و کانزایان هەبوو، هەروەها سوودیشیان لە پیشەسازی وڵاتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن وەردەگرت، تەنها رووسیا نەبێت، کە لە رووی ئابوورییەوە زۆر بەخێرایی تووشی تەنگەنەفەسی بوو. ئەم نابەرابەرییەش وایکرد خستنی یەکجارەکی هەرلایەکیان کارێکی ئاسان نەبێت.

کاتێك کە جەنگ رووی دا، ئەڵمانیا زۆر پێش ئەوە پلانێکی سەربازی بۆ جەنگەکە هەبوو، ئەوە بوو هەر لە ساڵی ١٩٠٥ەوە سەرۆك ئەرکانی ئەڵمانیا کە ناوی **"شلڤین"** بوو پلانێکی سەربازی بۆ وڵاتەکەی داڕشتبوو، کە تیایدا هاتبوو لە کاتی جەنگدا لەگەڵ فەرەنسا و رووسیا و بریتانیا پێویستە گورزێکی گەورە لە باکووری فەرەنسا و رووسیا بوەشێنرێت بەر لەوەی هاوکاری بریتانیایان پێبگات، بۆیە بەپێی ئەم پلانە هەر لە سەرەتای جەنگەکەوە ئەڵمانیا روویکردە بەرەی رۆژئاوا و تەنها دوو یەکەی سەربازی نارده بەرەی رۆژهەڵات بۆ ئەوەی لەگەڵ سوپای نەمسا-مەجەردا فشار بکەنە سەر سوپای رووسی تا ئەوکاتەی سوپای ئەڵمانیا بەرەی رۆژئاوا تێکدەشکێنێت و دواتریش هێرشێکی هاوشێوە دەکاتە سەر سوپای رووسیا و تێکیدەشکێنێت.

لە دەستپێکی جەنگدا (ژەنەراڵ مۆلدکە) سەرۆك ئەرکانی سوپای ئەڵمانی بوو، ئەوە بوو هەر لەگەڵ دەستپێکی جەنگدا بەلجیکای ئاگادار کردەوە کە رێگەی بدات بە خاکەکەیدا تێپەڕ بێت، بەڵام کاتێك بەلجیکا رازینەبوو سوپای ئەڵمانیا هێرشیان کردە سەر بەلجیکا و توانیان لە ماوەیەکی زۆر کورتدا سەرەڕای ئەو بەرگرییە زۆرەی بەلجیکا، بەشی هەرە زۆری وڵاتەکە داگیر بکەن، دوای داگیرکردنی بەلجیکا سوپای ئەڵمانی لەبەرەوپێشچوونەکانی بەردەوام بوو بەرەو فەرەنسا، ئەوە بوو لە ٢١ی ئابی ١٩١٤دا سوپای ئەڵمانیا لەسەر سنووری بەلجیکا-فەرەنسا رووبەڕووی سوپای فەرەنسی-بریتانی بووەوە و شەڕێکی گەورەی لێکەوتەوە کە چوار رۆژی خایاند و بەشەڕی سەر سنوور ناسرا، ئەم شەڕە بە شکستی هاوپەیمانان کۆتایی پێهات، بەڵام لەو کاتەدا لەبەرەی رۆژهەڵات جەنگێکی قورس لە نێوان سوپای رووسیا و سوپای نەمسا-مەجەردا

کەوتەوە، کە ڕۆڵێکی باشی هەبوو لە کەمکردنەوەی فشار لەسەر فەرەنسا، لەلایەکی تریشەوە هەر لەو کاتەدا سوپای نەمسایی-ئەڵمانی هێرشێکی هاوبەشیان کردە سەر پۆلەندا، کە سوپای رووسیا توانی بەریان پێبگرێت، جگە لەوەش چەند سەرکەوتنێك بەسەر سوپای مۆڵبووی ئەڵمانی-نەمسایی بەدەست بهێنێت لە شەڕی وارشۆ-ئیفانکۆرتدا کە یەکێك بوو لە شەڕە گرنگەکانی جەنگی یەکەمی جیهان، ئەم سەرکەوتنەش لەو شەڕەدا پلانەکانی سەرکردایەتی ئەڵمانیای پووچەڵ کردەوە و ناچاریکردن بەشێك لە سوپاکەیان لەبەرەی رۆژئاواییەوە بگوازنەوە بۆ بەرەی رۆژهەڵات، بۆ ئەوەی لەو بەرەیەدا بە تەواوەتی شکست نەهێنن.

لە ١١ی تشرینی دووەمدا ئەڵمانییەکان جەنگی لۆتزینیان دەستپێکرد، کە نزیکەی دوو حەفتەی خایاند و تیایدا توانیان بەر بە سوپای رووسی بگرن بۆ ئەوەی زیاتر پێشڕەوی نەکات لەناوچەکانی گالیسیاوە، بەڵام رووسیا زۆر پاشەکشەی نەکرد، ئەمەش وایکرد کە جەنگەکە یەکلاییکەرەوە نەبێت، جگە لەوەی کە هەر لەو ماوەیەدا چەند جەنگێك لە ناوچەی سربیا رووی دا و نەمساییەکان هێرشیان کردە سەر سربیا و چەند جارێك چوونە ناو خاکی سربیاوە، بەڵام لەژێر فشاری سربییەکاندا پاشەکشەیان کرد.

یەکێکی تر لە جەنگە هەرە گرنگەکانی ساڵی ١٩١٤ی جەنگی یەکەمی جیهان، جەنگی مارن بوو کە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر رەوتی رووداوەکانی جەنگی یەکەمی جیهان هەبوو، ئەو جەنگە کاتێك رووی دا کە ئەڵمانییەکان پێیانوابوو رۆژئاواییەکان لە دوای جەنگی سەرسنوور لەڕووی سەربازییەوە توانایەکی ئەوتۆیان نەماوە و ئەنجامی شەڕی سەرسنوور لە بەرژەوەندی ئەواندا بووە، بۆیە لە **٢٣**ی ئابدا ئەڵمانییەکان هێرشیان کردە سەر بەرەی رۆژئاوا و توانیان چەند پێشڕەوییەك بکەن و گەیشتنە ناوچەی رووباری مارن لە باشووری رۆژهەڵاتی پاریس، بەڵام سوپای فەرەنسی توانی بەربەستیان بکات و دژە هێرشیان بکاتە سەر و تاڕادەیەك هێرشەکانی ئەڵمانیا لەو ناوچانە تێك بشکێنێت، بەمەش شەڕی مارن، کە لە ١٢ی ئەیلوولدا تەواو بوو پلانی سەربازی ئەڵمانیای پووچەڵ کردەوە.

## – تێخزینی دەوڵەتی عوسمانی بۆ جەنگ

لەسەروبەندی دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهاندا دەوڵەتی عوسمانی پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ ئەڵمانیادا هەبوو، چونکە پێیانوابوو کە ئەڵمانیا کەمتر لە وڵاتە زلهێزەکانی تر چاوی بڕیوەتە ناوچەکانیان جگە لەوەی لەو کاتەدا سوپای عوسمانی لەسەر دەستی ئەفسەرانی ئەڵمانیا ڕێکدەخرایەوە و مەشقی پێدەکرا، وێڕای ئەوەی کە ئەڵمانیا ڕۆژێك دوای جەنگ، دوای ئەوەی کە دەوڵەتی عوسمانی بێ لایەنی خۆی ڕاگەیاند، توانیبووی پەیمانی هاوپەیمانێتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا مۆربکات و هەوڵیشیان دەدا کە دەوڵەتی عوسمانی لەپاڵ خۆیاندا بهێننە جەنگەوە، مەبەستیشیان بەم هەنگاوە داخستنی تەنگەبەرە عوسمانییەکان لە دەریای ڕەش لەبەردەم هاوپەیمانان و پەکخستنی گەیشتنی هاوکارییە سەربازییەکان بۆ ڕووسیا و پچڕاندنی پەیوەندی نێوان بریتانیا و داگیرکەکانی بوو، هەروەها دەیانویست تەواوی جیهانی ئیسلامی بەلای خۆیاندا رابکێشن لە ڕێگەی ڕاگەیاندنی جیهادی پیرۆزەوە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، بەمەش پێگەی دەوڵەتی بریتانی لە داگیرکە ئیسلامییەکانیدا بێهێز بکەن، مەبەستێکی تریشیان ئەوە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی ناوچەکانی کافکاس داگیربکات و بەمەش بەرەیەکی نوێی جەنگ لەبەرانبەر ڕووسیادا بکاتەوە، بۆیە لە ۲۹ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۱٤دا دەوڵەتی عوسمانی لەپاڵ ئەڵمانییەکانەوە چوونە شەڕەوە، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی پەیوەندی نێوان ڕووسیا و هاوپەیمانەکانی لە ڕێگەی تەنگەبەرەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بپچڕێت و بەرەیەکی جەنگی نوێش لە ڕۆژهەڵات بەرانبەر بە ڕووسیا بکرێتەوە، چونکە دەوڵەتی عوسمانی نزیکەی ٥٠٠ هەزار سەربازی ناردە بەرەکانی جەنگەوە.

پاڵنەری سەرەکی چوونە ناوەوەی دەوڵەتی عوسمانیش بۆ ئەم جەنگە لەپاڵ ئەڵمانیاوە، بریتی بوو لەو سیستەمی جیاوگ و مافە تایبەتیانەی کە لە دەوڵەتی عوسمانیدا بە وڵاتە ئەوروپییەکان بەخشرابوو و دەیویست ئەڵمانیا شوێنی فەرەنسا و بریتانیا و ڕووسیا بگرێتەوە، جگە لەوەی وای هەستدەکرد کە دەسەڵاتی بەسەر بەندەرەکانیدا تەواو نییە و لەم ڕێگەیەشەوە دەیەویست ئەم ئامانجانە بەدەست بهێنێت: یەکەمیان رزگارکردنی دەوڵەتەکەی لەدەستێوەردانی دەرەکی و گەڕاندنەوەی ئەو ویلایەت و ناوچە عوسمانیانەی کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی بێگانە وەك میسر و قوبرس و چەند ناوچەیەکی تر، دووەمیشیان گێڕانەوەی ئەو

ناوچانەی کە رووسیا لە کافکاس و تورکستان داگیری کردبوون، سێیەمیشیان جێگیرکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت و خیلافەی عوسمانی بەسەر سەرجەم ناوچە ئیسلامییەکاندا.

## – تێخزینی ژاپۆن بۆ نێو جەنگ

ژاپۆن یەکێك بوو لەو دەوڵەتە ئاسیاییانەی کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە گەیشتبووە ئاستێکی بەرزی گەشەسەندن لەڕووی ئابووری و سیاسییەوە و لە کاتی دەستپێکردنی جەنگدا وەك یەکێك لە زلهێزەکانی ناوچەکە دەرکەوتبوو، بۆیە تاکە دەوڵەتی ئاسیایی بوو لە جەنگی یەکەمی جیهاندا بەشداری کرد و بەشداریکردنەکەیشی لەپاڵ هاوپەیماناندا بوو، بە کەوتنەوەی جەنگ رەوشی رۆژهەڵاتی دوور زیاتر لەبار بوو بۆ ژاپۆن بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی چین بکات، ئەویش زۆر بەخێرایی ئەم هەلەی قۆستەوە و لە **١٥**ی ئابی **١٩١٤**دا ورپاکردنەوەی کۆتایی دا بە ئەڵمانیا و داوای لێکرد کە ناوچەی (سیاوجۆ)ی بۆ چۆڵ بکات بەو بیانووەی کە کار لەسەر گەڕاندنەوەی دەکات بۆ چین، بەڵام ئەڵمانیا ورپاکردنەوەکەی رەتکردەوە، بۆیە لە **٢٣**ی ئابدا ژاپۆن جەنگی راگەیاند و داگیرگەکانی ئەڵمانیای لە ناوچەی رۆژهەڵاتی دوور بە تایبەت لە چین، داگیرکرد، کە ئەمیش سەرەتایەك بوو بۆ وەدەرنانی دەسەڵاتی ئەورووپی لە ناوچەکە بە گشتی، دوای ئەم هەنگاوە ژاپۆن چینی ناچارکرد رێککەوتننامەیەکی لەگەڵدا مۆربکات، کە بەپێی ئەو رێککەوتننامەیە کۆمەڵێك جیاوکی سیاسیی و ئابووری لەناوچەکە بەدەست هێنا، بەم جۆرە ژاپۆن یەکێك بوو لەو وڵاتانەی کە لە پاڵ هاوپەیماناندا چووە جەنگی یەکەمی جیهانەوە، بەڵام بەشداریکردنی ئەو، بەشێوەیەکی سنووردار بوو، تەنها بۆ ئەوە بوو کە ئامانجەکانی خۆی بەدیبهێنێت، چونکە کاتێك هاوپەیمانان داوای ئەوەیان لێکرد هێز بنێرێتە ئەوروپا بۆ رووبەڕووبوونەوەی وڵاتی ناوەند، ژاپۆن ئەمەی رەتکردەوە، چونکە لە بەرژەوەندی خۆی نەدەزانی لە جەنگی ناوچە ئەوروپییەکانەوە تێوەگلێت.

## – تێخزینی ئیتالیا بۆ جەنگ

ئیتالیا بەر لە جەنگی یەکەمی جیهان، وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا هاوپەیمانێتی دۆستانەی لەگەڵ ئەڵمانیا و ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەردا هەبوو، بەڵام کە جەنگ دەستی پێکرد، ئەو لەگەڵ رۆمانیا و بولگاریا و یۆنان بێلایەنی خۆیان راگەیاند، ئەم وڵاتانەش لەو کاتەدا بایەخی ستراتیژی و سەربازی خۆیان هەبوو بۆ جەنگەکە، ئیتالیا لەبەر ئەوەی هێزێکی مرۆیی و سەربازی گەورەی هەبوو، هەریەك لە رۆمانیا و بولگاریا و یۆنانیش شوێنێکی ستراتیژی و جوگرافیگرنگیان هەبوو، سەبارەت بە حکومەتی ئیتالیا، لەو کاتەدا کە بە سەرۆکایەتی (سلاندرا) بوو، لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگدا بە فەرمی بێلایەنی خۆی راگەیاند، بەڵام لە هەمانکاتیشدا دەرگاکانی دانوستاندنی لەگەڵ لایەنە شەڕکەرەکاندا دانەخستبوو، کێشەی ئیتالیا ئەوە بوو کە لەو کاتەدا دەیەویست هەندێك لەو ناوچانەی ئیتالیا کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر بگێڕێتەوە، بەڵام ناوەندی دەسەڵاتدارێتی نەمسا بەمە رازینەبوو، دوای شکستی ئەڵمانیا لە جەنگی مارن و ئەو سەرکەوتنانەی رووسیا لە ناوچەکانی گالیسیا بەدەستی هێنا، ئیتالیا بە باشی زانی لەگەڵ فەرەنسا و بریتانیادا دەست بە گفتوگۆ بکات، هەر لەو کاتەشدا ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر جارێکی تر گفتوگۆکانی لەگەڵ ئیتالیا دەستپێکردەوە، ئیتالیاش لەپێناو بەرژەوەندییەکانیدا وەڵامی نەمسا-مەجەری دایەوە بێ ئەوەی گفتوگۆکانی لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا بپچڕێنێت، دواتریش دوای ئەوەی بەراوردێکی کرد لە نێوان بەڵێنەکانی هەردوولا بۆی دەرکەوت کە بەڵێنەکانی هاوپەیمانان زیاتر لە قازانجی ئەو دایە، چونکە ئەوان ئەو بەڵێنەیان پێدابوو کە دوای سەرکەوتنیان نەك تەنها ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی نەمسا-مەجەری بۆ دەگێڕنەوە، بەڵکو چەند دوورگەیەکی دەریای ئەدریاتیکی و داگیرکەیەکی ئەڵمانیشی لە ئەفریقا پێدەدەن، بۆیە ئیتالیا لە **٢٦**ی نیسانی **١٩١٥**دا رێککەوتننامەیەکی نهێنی لە لەندەن لەگەڵ هاوپەیمانانڎا مۆرکرد و لە **٢٣**ی مایسی **١٩١٥**شدا جەنگی لە دژی ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانی راگەیاند، بەم جۆرەش بەرەیەکی تری جەنگ لە ئەوروپادا بۆوە.

## - کرداره سەربازییەکانی ساڵی ١٩١٥

لە سەرەتای ساڵی ١٩١٥دا سەرکردایەتی ئەڵمانیا گۆڕانکاری لە پلانە سەربازییەکانی و سەرکردەکانی کرد، ئەوەبوو ژەنەراڵ (فۆلکن هاین) خرایە شوێنی (ژەنەرال مۆلدکە) و پلانەکەیشیان بەو جۆرە گۆڕی کە چالاکییە سەربازییەکانی بەرەی رۆژئاوا ببێتە جەنگی سەنگەرانە و هەوڵەکانیان ئاراستەی بەرەی رۆژهەڵات بکەن، بۆ ئەوەی هێزەکانی رووسیا لەو ناوچانە وەدەرنێن کە داگیریکردوون و نەمسا لە فشاری رووسی رزگار بکەن، لە پلانە نوێیەکەی ئەڵمانیادا، جەخت لەسەر ئەوە کرابۆوە کە بولگاریا بەلای خۆیاندا راکێشنە ناو جەنگەکەوە، بۆ ئەوەی لە رێگەی ئەوەوە سربیا تێك بشکێنن، تا سوپای ئەڵمانی ئامادەی رووبەڕووبوونەوەی ئیتالیا بێت، ئەگەر هاتوو ئەم پلانەش سەرکەوت، ئەوکات لەبەرەی رۆژهەڵاتەوە روودەکاتە بەرەی رۆژئاوا و گورزی کوشندە لە فەرەنسییەکان دەوەشێنێت، دواتریش دەچێتەوە بەلای بریتانیا و هێرشە ژێر دەریاییەکانی بۆسەر کەشتیگەلەکانی بریتانیا دەست پێدەکات و ئەگەر بریتانیا هێزە دەریاییەکەی لەدەست دا، کەواتە هێزی سەرەکی خۆی لەدەست داوە.

بەم جۆرەش بەدرێژایی سێ مانگی یەکەمی ساڵی ١٩١٥ بەرەی رۆژهەڵات چەند شەڕێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی، بەڵام سوپای رووسیا سەرکەوتنی دیاری بەدەست هێنا تا ئەو رادەیەی کە سەرکردایەتی نەمسا-مەجەر بیر لەوە بکاتەوە کە تاکلایەنانە لەگەڵ رووسیا ئاشتی ببەستێت، بەڵام بەهاناوەهاتنی سوپای ئەڵمانیا وایکرد کە ئەڵمانییەکان لەناوچەکانی گالیسیا سەرکەوتن بەسەر رووسەکاندا بەدەست بهێنن و ناچاریان بکەن تا سنووری خۆیان پاشەکشێ بکەن و چەند ناوچەیەکی تری پۆڵەندا و دەوروبەریشی داگیربکەن، بەرادەیەك کە هێزی ئەڵمانی و نەمساییەکان نیازی ئەوەیان هەبوو بە تەواوەتی رووسەکان ئابلۆقە بدەن و لەناویان بەرن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، ئەم جەنگانە لەبەرەی رۆژهەڵاتدا بەردەوام بوو تا کۆتایی ئەیلوولی ساڵی ١٩١٥، لەوێوە وردە وردە جەنگەکان بەرەو ساردبوونەوە و دامرکاندنەوە دەرۆیشتن.

لەبەرەی باڵکانیشدا وڵاتانی ناوەند لە ساڵی ١٩١٥دا توانیان بولگاریا بەلای خۆیاندا رابکێشن و دژایەتی سربیای پێ بکەن، وا لە سربیا بکەن ناچاربێت لە سنووری ئەلبانیا پاشەکشێ بکات. لەلایەکی تریشەوە، وڵاتانی میحوەر هاوکاری هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانیان

کرد بۆ پەکخستنی هێرشەکانی بریتانیا بۆسەر تەنگەبەرەکان و توانیان هەوڵەکانی بریتانیا بۆ کۆنترۆڵکردنی تەنگەبەری دەردەنیل پووچەڵ بکەنەوە.

سەبارەت بە بەرەی رۆژئاواش، دیارترین رووداوەکانی، ئەو هێرشە قورسە بوو کە ئەڵمانەکان لە ٢٢ی نیساندا بۆ سەر کەناڵی ئیبەر ئەنجامیان دا، بۆ ئەوەی بگەنە پاریس، کە لەم جەنگەدا بۆ یەکەم جار ئەڵمانییەکان گازی ژەهراویان بەکارهێنا، بەڵام ئەم جەنگە هیچ ئاکامێکی یەکلاییکەرەوەی نەبوو، چونکە هاوپەیمانەکانیش هەر لە هەمان کاتدا دوو هێرشی گەورەیان کردە سەر ئەڵمانیا و لە خاکی فەرەنسا و ناوچە قایمەکان دەریان کردن، بەڵام ئەمانیش بەتەواوەتی لەبەدیهێنانی مەبەستەکانیان سەرکەوتوو نەبوون، دوای ئەم جەنگەش، بەدرێژایی ساڵی ١٩١٥ گۆڕانێکی ئەوتۆ لەبەرەی رۆژئاوا رووی نەدا.

بەڵام شەڕ لەبەرەی ئیتالیا لەو ساڵەدا لە بەرژەوەندی هاوپەیمانان‌دا نەبوو، چونکە تۆبۆگرافیای ناوچە سنوورییەکانی نێوان نەمسا و ئیتالیا وایکردبوو نەمساییەکان لە دۆخێکی باشتردا بن، لەبەر ئەوەی ئەوان بەسەر تەواوی زنجیرە چیاکاندا زاڵ بوون، ئەمەش وایلێکردبوون کۆنترۆلی جوڵەی سوپای ئیتاڵییەکان بکەن.

## – تێخزینی بولگاریا بۆ نێو جەنگ

یەکێك لە رووداوە گرنگەکانی ساڵی ١٩١٥ چوونە ناوەوەی بولگاریا بوو بۆ جەنگ بەلای وڵاتانی میحوەردا، هەرچەندە لە بولگاریادا رەوتێکی بەهێز هەبوو، جەختیان لەسەر مانەوەی پەیوەندییە باشەکانیان لەگەڵ رووسیادا دەکردەوە، بەڵام ئەوەی بۆ ئەڵمانیا سوودی هەبوو، ئەوە بوو کە بولگاریا لەلایەکەوە چاوی بڕیبووە سربیا و لەلایەکی تریشەوە پێشڕەوییەکانی کۆتایی ساڵی ١٩١٥ی ئەڵمانیا و نەمسا لەبەرەی رۆژهەڵات وایکردبوو بولگارییەکان واتێبگەن کە وڵاتانی میحوەر سەرکەوتوون، ئەمانەش بوونە هۆی ئەوەی کە لە ١٦ی ئەیلوولدا بولگاریا پەیماننامەیەك لەگەڵ ئەڵمانیا و نەمسا-مەجەردا ببەستێت و بەپێی ئەم پەیماننامەیەش ببێتە لایەنی چوارەمی سەربازگەی وڵاتانی میحوەر و ٣٠٠ هەزار سەرباز لەسەر سنووری نێوان خۆی و سربیا مۆڵ بکات.

## - تێخزینی یۆنان بۆ نێو جەنگ

کاتێك کە جەنگ رووی دا، لە یۆناندا دوو ئاراستە هەبوون، یەکێکیان پاشا (کۆنستەنتین) سەرکردایەتی دەکرد، ئەو ئاراستەیە بوو، کە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە بێلایەنی بپارێزن، بەو بیانووەی ئەوان خاوەن شوێنێکی ستراتیژین و لەسەر دەریای ناوەڕاستن، خۆ ئەگەر بچنە نێو جەنگیشەوە ئەوا وا باشە لە پاڵ ولاتانی میحوەردا بچنە جەنگەوە، چونکە پێیان وابوو ئەڵمانیا لەڕووی سەربازییەوە بەتواناترە و ئەگەری سەرکەوتنی زیاترە، ئەمە جگە لەوەی کە خێزانی (پاشا کۆنستەنتین) خوشکی ئیمپراتۆری ئەڵمانی (ویلیەمی دووەم) بوو، ئاراستەکەی دووەمیش کە حزبی لیبرالی بە سەرۆکایەتی سەرۆك وەزیران (فیزیلیۆس) نوێنەرایەتی دەکرد، لەگەڵ ئەوەدا بوو یۆنان لەپاڵ ولاتانی هاوپەیماناندا بچێتە نێو جەنگەوە، لەبەرئەوەی پێیان وابوو باشترین رێگایە بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندییە هەرێمییەکانی یۆنان، چونکە بەر لە هەموو شت یۆنان پێویستە دژی دەوڵەتی عوسمانیدا بجەنگێت.

لە کاتی جەنگدا بە پلانی سەرۆك وەزیران یۆنانییەکان یارمەتیان پێشکەش بەو هێزەی هاوپەیمانان کرد، کە بەرەو دەردەنیل و بوسفۆر دەکشا، ئەم ئاراستەیە بە جۆرێك دەچوونە پێش کە ئەوەندەی نەمابوو خۆیان بەسەر دۆخەکەدا بسەپێنن، بەڵام پاشا لە مارتی ١٩١٥دا (فیزیلیۆس)ی لەسەرکار لادا و پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە، بۆیە (فیزیلیۆس) شاری ئەسینای پایتەختی بەجێهێشت و روویکردە ناوچەی سالۆنیك و لەوێ حکومەتێکی سەربەخۆی دامەزراند و ئەو ناوچەیە و دوورگەکانی دەوروبەری کۆنترۆڵ کرد، ئەو حکومەتە لەلایەن هاوپەیمانانەوە پشتگیری لێدەکرا و دوای ماوەیەکیش بە پشتیوانی هاوپەیمانەکان هەڕەشەی بۆمبارانکردنی پایتەختی کرد، بەمەش پاشای ناچارکرد دەستبەرداری تەختی پاشایەتی ببێت بۆ ئەلیکساندەری کوڕی کە ئەویش سیاسەتەکەی (فیزیلیۆس)ی جێبەجێکرد و (فیزیلیۆس)ی داواکرد بۆ دامەزراندنی کابینەیەکی نوێ و جارێکی تر یۆنان یەکخرایەوە و لە ساڵی ١٩١٧شدا بە فەرمی لەپاڵ هاوپەیمانانەوە چۆ نێو جەنگەوە.

- **کرداره سەربازییەکانی ساڵی ١٩١٦**

دوای ئەوەی لە ئەزموونەکانی ساڵی ١٩١٥دا هاوپەیمانان بۆیان دەرکەوت کە کردارەکانیان لە سەرجەم بەرەکاندا بەهۆی نەبوونی هەماهەنگی و نابەرابەرییەوە سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان بەدەست نەهێناوە، بۆیە بەباشیان زانی کرداره سەربازییەکانی ساڵی ١٩١٦ و پلانەکانیان بە جۆرێك رێك بخەنەوە کە بتوانن لە هەموو بەرەکانەوە لە یەك کاتدا دەستپێ بکەن.

بەڵام ئەڵمانییەکان بەر لە دەستپێکردنی هاوپەیمانان، هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩١٦ەوە بە هێرش لەبەری رۆژئاواوە دەستیان پێکرد و هەوڵیان دا بچنە نێو قوڵایی فەرەنساوە، بەڵام هەوڵەکەیان بێ ئاکام بوو و زیانێکی گەورەیشیان بەرکەوت، فەرەنساش توانی ئەو ناوچانەی کە ئەڵمانییەکان داگیریان کردبوو، رزگاری بکاتەوە، ئەویش بەهۆی ئەو هێرشە بەربڵاوەی کە لەبەرەی رۆژهەڵاتەوە رووسیا ئەنجامی دا، کە لەو هێرشەدا ئەڵمانییەکان ناچار بوون هێزی یەدەگی بەرەی رۆژئاوا بۆ بەرەی رۆژهەڵات بنێرن.

لەو ماوەیەشدا هێزە دەریاییەکانی بریتانیا توانیبووی بە تەواوەتی کۆنترۆڵی دەریایی بکات، ئەڵمانیای بە تەواوەتی لە بەرەکانی جەنگ دابڕی بوو، هەرچەندە ئەڵمانییەکان هەڕەشەی بەکارهێنانی ژێر دەریاییەکانیان دەکرد. لە ئابی ساڵی ١٩١٦دا ئەڵمانیا هەوڵێکی زۆری دا ئەو ئابلۆقە دەریاییە بشکێنێت کە هاوپەیمانان خستبوویانە سەر کەنارەکانی، ئەوە بوو لەم پێناوەدا جەنگی دەریایی (گۆتلاند) لە نێوان هەردوو کەشتیگەلی ئەڵمانی و ئینگلیزی رووی دا، کە گەورەترین جەنگی دەریایی جەنگی یەکەمی جیهان بوو. لە کۆتایی ئەم جەنگەدا، هەردوولا سەرکەوتنی خۆیان راگەیاند، بەڵام راستییەکەیشی ئەوە بوو کە کەشتیگەلی ئەڵمانی شکستی خواردبوو و پاشەکشەی کردبوو بەرەو ناوچەی کیل، بەمەش ئینگلیزەکان بە تەواوی بەسەر دەریا باڵادەست بوون.

لەبەرەی ئیتالیاشدا هێزەکانی نەمسا-مەجەر لە ئایاری ساڵی ١٩١٦دا هێرشێکی گەورەیان لە دژی سوپای ئیتالیا دەستپێکرد و پێشڕەوییەکی زۆریان کرد، بە رادەیەك کە هەڕەشەیان گەیشتە سەر پێدەشتەکانی ڤینسیا، ئەم سەرکەوتنەی نەمسا وای لە رووسیا کرد، بۆ کەمکردنەوەی فشار لەسەر ئیتالیا، هێرشێکی گەورە لەبەرەی باشووری رۆژئاواوە دەستپێ بکات و توانی لە ٤ی حوزەیراندا بەر بە پێشڕەوی سوپای نەمسا بگرێت و فشاری نەمسا لەسەر ئیتالیا کەم بکاتەوە و چەند سەرکەوتنێکیش بەدەست

بهێنێت، بەمەش سەرکردایەتی ئەڵمانیای ناچارکرد هێرشەکانی بۆ سەر فەرەنسا لەبەرەی رۆژئاوادا رابگرێـت و هەندێك لە سوپاکەی بنێرێت بۆ یارمەتیدانی نەمسا-مەجەر، بەڵام سوپای رووسی جارێکی تر توانی بەرپەرچی ئەم هێرشە بداتەوە، کە هێزەکەی ئەڵمانیا لەگەڵ نەمساییەکاندا لە ١٦ی حوزەیراندا ئەنجامیان دا، لە ئەنجامی ئەم شەڕانەشدا رووسەکان نزیکەی ٤٢٠ هەزار سەرباز و ئەفسەری نەمساییان بە دیل گرت، جگە لە دەستکەوتێکی جەنگی زۆر، کە ئەمە گورزێکی گەورە بوو بەر سوپای نەمسا-مەجەر کەوت و هەنگاوەکانی بەرەو هەڵوەشانەوە خێراتر کرد لە ئەنجامی ئەوەشدا ئیتالییەکان دژە هێرشێکیان بۆسەر نەمسا ئەنجام دا، ئەمەش دۆخێکی لەبارتری بۆ فەرەنسی و ئینگلیزەکان رەخساند بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر رووباری سوم، کە لەوێدا یەکێك لە توندوتیژترین شەڕەکانی جەنگی یەکەمی جیهان رووی دا بێ ئەوەی هیچ لایەنێك سەرکەوتنێکی ئەوتۆ بەدەست بهێنێت، تەنها ئەوە نەبێت کە نزیکەی نیو ملیۆن سەربازیان لەدەست دا، کە باشترین سەربازەکانی هاوپەیمانان بوون، لەم جەنگەشدا بوو کە بۆ یەکەمجار لە مێژوودا هاوپەیمانان تانکیان بەکارهێنا، کە کاریگەری گەورەی بەسەر جەنگەکەوە هەبوو.

## - تێخزینی رۆمانیا بۆ جەنگ

ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر دەمێك بوو دەستی بەسەر ناوچەکانی (ترانسلڤانیا و بۆکۆڤینیا و بانات) دا گرتبوو، کە زیاتر لە سێ ملیۆن خەڵکی رۆمانی تیایاندا دەژیا، رۆمانیاش لە هەلێك دەگەڕا بۆ گێڕانەوەی ئەو ناوچانە، هاوکات لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٤دا رووسیا توانیبووی رێککەوتننامەیەکی نهێنی لەگەڵ رۆمانیادا ببەستێت، کە تیایدا دانی بە مافەکانی رۆمانیادا نابوو بۆ گێڕانەوەی ئەم ناوچانە بەمەرجێك پابەندی بێلایەنییەکی دۆستانە بێت بەرانبەر بە رووسیا، لەگەڵ ئەمانەشدا دەستپێکی جەنگ واینەکرد کە رۆمانیا هەر لە سەرەتاوە لەپاڵ هاوپەیمانان‌دا بچێتە جەنگەوە، بەڵکو چاودێری رووداوەکانیان دەکرد، دوای دوو ساڵ لە جەنگ رۆمانییەکان گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە سەرکەوتنی هاوپەیمانان گومانێکی تێدا نەماوە، بۆیە لە ١٧ی ئابی ١٩١٦ پەیماننامەیەکیان لەگەڵ هاوپەیمانان‌دا بەست کە تیایدا هاوپەیمانەکان دانیان بە مافەکانی رۆمانیادا نا بۆ گێڕانەوەی ئەو سێ ناوچەیە، رۆمانیاش لە ٢٧ی ئابی ١٩١٦دا بە فەرمی شەڕی لە دژی نەمسا-مەجەر راگەیاند

و زۆر بەخێرایی توانی بچێتە ناو ترانسلڤانیاوە، بەڵام دواتر لە ناوچەی دوبرۆجە بە توندی لەسەر دەستی بولگارییەکان تێك شکا، هەر ئەمەش وایکرد ئەڵمانیا سوپایەك بە دوو ئاراستەدا بنێرێتە سەر رۆمانیا، ئاراستەیەکیان لە چیای کەرباتەوە و ئەویتریشیان لەرێی دوبرۆجەوە کە توانی بەشێکی زۆری ناوچەکانی رۆمانیا داگیربکات و بگاتە بوخارێستی پایتەخت، لێرەوە هەموو سامانی سروشتی و کشتوکاڵ و نەوتی رۆمانیا کەوتنە ژێر دەستی ئەڵمانیاوە.

### – هەوڵەکانی ئاشتی

رووداوەکانی جەنگ لە ساڵی سێیەمی دابوو، بەڵام ئاماژە ئابووری و سیاسیی و سەربازییەکان بەوجۆرە نەبوون، کە هیچ لایەنێك لە لایەنە شەڕکەرەکان توانای سەرکەوتنی یەکلاییکەرەوەیان هەبێت، چونکە ئەوان بە تایبەتیش وڵاتانی میحوەر، بەرەو لەبەربڕان و نەمانی سەرچاوە بنەڕەتییەکان دەچوون چ لە رووی مرۆییەوە چ لە رووی ئابوورییەوە، لە کۆتایی ساڵی ١٩١٦دا نزیکەی ٢٥ ملیۆن سەربازی هاوپەیمانان لە بەرەکانی جەنگدا بوون، لەبەرانبەردا ١٥ ملیۆن سەربازی وڵاتانی میحوەریش لەبەرەکانی جەنگدا بوون، ئەمە لەکاتێکدا بوو، کە تا ئەوکاتە لایەنە شەڕکەرەکان نزیکەی ٦ ملیۆن کوژراو و زیاتر لە ١٠ ملیۆن برینداریان هەبوو، ئەمە جگە لەوەی کە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی تا دەهات نزمتر دەبوو، بەجۆرێك کە پێشتر شتی وەهای بەخۆیەوە نەبینیبوو، جگە لەو قەیرانە کەم وێنەیەی سووتەمەنی و ئەو ساردییەی ساڵی ١٩١٦، کە ئەمە کاریگەری زۆر خراپی هەبوو لەسەر جوڵەی هاتوچۆ و گواستنەوەی بەروبوومەکان، نرخ رۆژبەڕۆژ لەبەرزبووندا بوو، ئەمانەش تا دەهات رەوشی گەلانی خراپتر دەکرد، هەموو ئەمانە وایانکرد گەلانی شەڕکەر لەوە تێبگەن کە ئەم جەنگە لە بەرژەوەندی ئەواندا نییە، سەرەنجامیش ئەمانە کاردانەوەیان لە نێوەندە سیاسیی و سەربازییەکان و رای گشتی هەردوو لای شەڕکەردا دەبوو، بۆ نموونە فەرەنسا لە ساڵی ١٩١٦دا رووبەڕووی قەیرانێکی سەربازی گەورە بووەوە، لە بریتانیاش بە هەمان شێوە کێشە لە کابینە وەزارییەکاندا دروست بوو، لە نەمساش هەر لەو سەروبەندەدا بوو کە سەرۆکی وەزیران کوژرا، لە ئەڵمانیاش چەند گۆڕانکارییەك لە سەرکردایەتی سەربازیدا رووی دا، جگە لەوەی لە رووسیا تەقەلا شۆڕشگێڕییەکان لە کۆتایی ساڵی ١٩١٦دا تا دەهات توندتر دەبوون و هەنگاوەکانی بەرەوسەرکەوتن خێراتر دەبوو. سەرەنجامی هەموو ئەمانەی

باس کران، لە نێوەندە سیاسییەکانی وڵاتە شەڕکەرەکاندا ئاراستەیەك دەرکەوت کە بیریان لە وەستاندنی خێرای جەنگ دەکردەوە، ئەویش لە ڕێگەی گەیشتن بە ڕێککەوتنێك، کە بەرژەوەندی و داواکارییەکانی هەردوولا دەستەبەر بکات بێ ئەوەی هیچ لایەکیان سەرکەوتنی یەکلاییکەرەوە بەدەست بهێنن. بەڵام ئەم تێڕوانینە لە لایەن سەربازەکانی وڵاتە شەڕکەرەکانەوە ڕووبەڕووی ئاراستەیەکی پێچەوانەی بەهێز بۆوە کە سووربوون لەسەر درێژەپێدانی جەنگ تا سەرکەوتن، کە ئەمانە خاوەن هێز و پێگەی گەورەتر بوون، بۆ نموونە لە ئەڵمانیا خودی ئیمپراتۆر و گەورە سەرکردە سەربازییەکانی ئەڵمانیا زۆر پێداگر بوون لەسەر بەردەوامی جەنگ، لە بەرانبەریشدا بەشی زۆری سیاسەتمەداران لەوە دڵنیا بوون کە ئەڵمانیا لەڕووی سەربازییەوە بەرەو تێك شکانە، بۆیە داوای وەستانی جەنگیان دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی ئاراستەی یەکەم بەهێزتر بوو، بۆیە شەڕ هەر بەردەوام بوو، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە ناوەندی دەسەڵاتی وڵاتە شەڕکەرەکان وایان نیشان دەدا کە ئەوان هەوڵی ئاشتی دەدەن، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو، چونکە کاریگەریی ڕەوتی دژە شەڕ گەیشتبووە خودی بەرەکانی جەنگ، لە ساڵی ١٩١٥ەوە ئەڵمانیا هەوڵ یدا تاك لایەنانە جەنگ لەگەڵ ڕووسیادا رابگرێت، بەڵام هەوڵەکەی شکستی هێنا، دوای ئەوە لە ١٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٦دا بە ناوی سەرجەم هاوپەیمانەکانییەوە، پێشنیارێکی بۆ وڵاتانی هاوپەیمانان کرد بۆ ئەوەی گفتوگۆی ئاشتی لە نێوانیاندا دەستپێ بکات، بەڵام ئەویش هیچ ئەنجامێکی بەدەست نەهێنا.

لە کۆتایی ساڵی ١٩١٦دا چەند پێشنیارێکی تر بۆ ئاشتی لە لایەن وڵاتە بێلایەنەکانەوە پێشکەش کرا، وەکو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و سویسرا و سوید و دانیمارك و نەرویج، بەڵام لە ٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩١٧دا هاوپەیمانان وەڵامی نەرێنیان دایەوە، جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە ناکرێت ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیادا ببەسترێت تا ئەو کاتەی بە تەواوی نەیبەزێنن و تۆڵەی سەرجەم ئەو زیانانەی خستوویەتییەوە، لێنەکرێتەوە. بەم جۆرەش هەوڵەکانی ئاشتی شکستیان خوارد و شەڕ هەر بەردەوام بوو.

## – تخێزینی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا بۆ نێو جەنگ

كاتێك جەنگ دەستی پێكرد، وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا بە فەرمی بێلایەنی خۆی ڕاگەیاند، هۆكاری ئەم هەڵوێستەی ئەمەریكاش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی:

**أ. ئەمەریكا بەپێی پرەنسیپەكانی مۆنرۆی ساڵی ١٨٢٣ ڕایگەیاندبوو كە ئەمەریكا دەست لەكاروباری وڵاتانی تر وەرنەدات و هیچ وڵاتێكیش دەست لەكاروباری ئەو وەرنەدات.**

ب. پێكهاتەی كۆمەڵایەتی گەلی ئەمەریكی پێكهاتەیەكی تێكەڵ بوو لەگەلانی ئەوروپا، ئەمەش وای لە دەسەڵاتدارانی ئەمەریكا كردبوو كە پێیانوابێت چوونەناوەوەیان بۆ جەنگ، گەلی ئەمەریكا لەتلەت و پەرتەوازە دەكات.

ج. ئەمەریكا دەیەویست زیاتر برەو بە بەرژەوەندییە ئابوورییەكانی خۆی بدات، چونكە لەو كاتەدا پیشەسازی وڵاتانی ئەوروپا بە تەواوەتی بۆ جەنگ تەرخانكرابوو، بۆیە بەرهەمی ئەمەریكی تا دەهات بازاڕی ئەوروپی زیاتر كۆنترۆل دەكرد و ئەمەریكییەكانیش دەیانەویست ئەم دۆخە بپارێزن، جگە لەوەی ئەمەریكا بووبووە سەرچاوەی سەرەكی بەخشینی قەرز بە وڵاتە شەڕكەرەكان و نەیدەویست لەكاتی تێوەگلانی لە پاڵ هەر لایەنێكدا، قەرزەكەی لای لایەنەكەی تری بفەوتێت، ئەمە جگە لەوەی ئەمەریكا دژ بە سەركەوتنی یەكلاییكەرەوەی هەر لایەنێك لە لایەنە شەڕكەرەكان بوو، ئەو ئامانجی لاوازبوونی هەردوولایان بوو، چونكە سەركەوتنی یەكجارەكی هەر لایەكیان مانای كۆنترۆڵكردنی ئەوروپا بوو لەلایەن ئەو لایەنەوە، كە دواجاریش ئەمە دەبووە سەرەتای كۆنترۆڵكردنی هەموو جیهان.

بەڵام لەپڕ ئەم سیاسەتەی ئەمەریكا گۆڕا و لە ساڵی **١٩١٧**دا چووە جەنگەوە، فاكتەری سەرەكیشی لوتبەرزی و سەرەڕۆیی ئەڵمانییەكان بوو، كە وایلێكردبوون بێباكانە هەڵەی سیاسیی گەورە بەرانبەر بە ئەمەریكا ئەنجام بدەن، ئەوە بوو لە **٢٤**ی مارتی **١٩١٦** یەكێك لە ژێر دەریاییە ئەڵمانییەكان پاپۆڕێكی نەفەرهەڵگری ئەمەریكی نوقمی زەریا كرد، ئەمەش وای لە سەرۆكی ئەمەریكا كرد یاداشتێكی نارەزاییانە ئاراستەی ئەڵمانیا بكات و تیایدا هەڕەشەی بڕینی پەیوەندییە دیپلۆماسییەكان بكات، بەڵام ئەڵمانیا هەر لە سەركێشییەكانی بەردەوام بوو، بۆیە لە **٣**ی شوباتی **١٩١٧** سەرۆكی

ئەمەریکا پەیوەندییە دیپلۆماسییەکانی لەگەڵ ئەڵمانیا پچڕاند و لە ٢٦ی شوباتیشدا داوای لە کۆنگرێسی ئەمەریکی کرد بوار بدات کەشتییە بازرگانییەکانی ئەمەریکا خۆیان چەکدار بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن، جگە لەوەی پێداگری ئەڵمانییەکان لەسەر درێژەپێدان بە شەڕی ژێردەریاییەکانیان رای گشتی ئەمەریکایان وروژاند و وای لە دەسەڵاتدارانی ئەمەریکا کرد، کە بەرپەرچی ئەڵمانیا بدەنەوە، ئەمە جگە لەوەی ئەمەریکا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی و قەرزەکانی، کە بە دەیان ملیار دۆلار دەبوون لای هاوپەیمانان، چووە نێو جەنگەوە، چونکە بەسەرکەوتنی ئەڵمانییەکان، ئەو قەرزانەی دەفەوتان، هەروەها بەڕووخانی سیستەمی قەیسەری لە رووسیا و نەمانی دەسەڵاتی ئۆتۆکراتی، نزیکبوونەوە لە نێوان سیستەمی حوکمی ئەمەریکی و رووسیاش دروست بوو، بۆیە ئەمەریکا زۆر بەخێرایی دانی بە حکومەتی کاتی (کێرنسکی)دا نا، لەپاڵ هەموو ئەمانەشەوە لەوکاتەدا ئەمەریکییەکان پلانی نێوان ئەڵمانیا و مەکسیکیان بۆ دەرکەوت کە وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا یاداشتێکی بۆ باڵیۆزی مەکسیك ناردبوو تیایدا هان یدابوو، کە لەکاتی کەوتنەوەی شەڕی نێوان ئەڵمانیا و ئەمەریکادا هێرش بکەنە سەر ئەمەریکا، هەموو ئەمانەی باس کران وای کرد وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ٦ی نیسانی ساڵی ١٩١٧دا شەڕ لە دژی ئەڵمانیا رابگەیەنێت، بەمەش دەوڵەمەندترین و گەورەترین وڵاتی بەرهەمهێنی جیهانی چووە نێو جەنگی یەکەمی جیهانەوە لەپاڵ هاوپەیمانەکانەوە و بە تەواوی پارسەنگی هێز بەلای هاوپەیمانەکاندا کەوت و کاریگەری گەورەی لەسەر رەوتی رووداوەکانی جەنگ هەبوو.

### – رەوشی هەردوو بەرەی رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی لە ساڵی ١٩١٧دا

دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩١٧دا چەند رووداوێکی گرنگی وەك شۆڕشی رووسیا و هاتنەناوەوەی ئەمەریکا بۆ جەنگ روویان دا، گۆڕانکاری گەورە بەسەر رەوتی جەنگەکەدا هات، لە لایەکەوە ئەو هێرشەی هاوپەیمانان کە پلانڕێژیان بۆ کردبوو لە ساڵی ١٩١٧دا ئەنجامی بدەن، بۆیان ئەنجام نەدرا، چونکە سوپای رووسیا نەیتوانی هێرشەکە ئەنجام بدات لەبەر کەمی چەك و زەخیرە، دواتریش لەبەر ئەوەی سوپاکەی لە ئەنجامی شۆڕشەکانی رووسیا لەبەریەك هەڵوەشایەوە. ئەگەرچی ژەنەراڵ (نیفل)ی فەرەنسی کە سەرکردەی گشتی ئەم هێرشە بوو، بارودۆخەکەی لەبەرچاو نەگرت و بڕیاری دا هێرش بکاتە سەر دوژمنەکانی

بۆ گێڕانەوەی زەوییە داگیرکراوەکانی ژێر دەستی ئەڵمانیا، بەڵام سەرکردایەتی ئەڵمانیا لە پلانەکانی ئینگلیز و فەرەنسا ئاگادار بوو، بۆیە ئەو هێرشەی کە هاوپەیمانان ئەنجامیان دا، سەرکەوتوو نەبوو، تەنانەت نزیکەی سەد هەزار سەربازیشیان بە کوژراو و بریندارەوە لەدەست دا، کە ئەمەش کاردانەوەی نەرێنی لە نێو خودی سوپای فەرەنسیدا لێکەوتەوە و بووە مایەی قەیرانێکی گەورە لە نێو سەرکردایەتی فەرەنسادا و سەرەنجامەکەیشی گۆڕینی سەرکردەی سەربازیی فەرەنسی بوو، لەلایەکی ترەوە لە رووسیا، حکومەتی کاتی بەسەرۆکایەتی (کێرنسکی) لە ١ی تەمموزی ١٩١٧دا هێرشێکی بەرفراوانی کردە سەر بەرەکانی باشووری رۆژئاوا، لەم جەنگەدا ئەگەرچی سەرەتا رووسییەکان چەند سەرکەوتنێکیان بەدەستهێنا و چەند ناوچەیەکی نەمساییەکانیان داگیرکرد، بەڵام بەهۆی بەهاناوەهاتنی زۆر بەخێرایی ئەڵمانییەکانەوە سوپای نەمساییەکان، توانیان هێرشەکە بەربەست بکەن و رووسەکان بە پاشەکشێ ناچار بکەن و تەنانەت چەند ناوچەیەکیش لە گالیسیا و بۆکۆڤینیا لەدەستیان دەربێنن، کە ئەمەش ئەوەندەی تر بووە مایەی لەبەریەکهەڵوەشانەوەی سوپای رووسی و بووژانەوەی گیانی شۆڕشگێڕانە لە نێو سوپاکەیدا، ئەم دۆخەش لە خزمەت ئەڵمانییەکان بوو و ئەڵمانەکانیش بە قۆستنەوەی ئەم دۆخە و رەوشی نالەباری سوپای ئینگلیز و فەرەنسا، هێرشێکی بەرفراوانیان لەگەڵ سوپای نەمساییدا کردە سەر سوپای ئیتالیا و بە رادەیەك ئیتالییەکانیان تێك شکاند، کە ئەگەر سوپای ئینگلیزی و فەرەنسی بەهانایانەوە نەهاتایە، هێرشەکە بەردەوام لە پێشڕەویدا بوو.

ئەگەرچی هاوپەیمانان لەبەرەکانی ئەورووپا تا رادەیەك لە دۆخێکی خراپدا بوون، بەڵام سوپای بریتانیا لە ساڵی ١٩١٧دا توانی لە عیراقدا بارودۆخی خۆی بەرەو باشتر بەرێت، دوای ئەوەی لە باشوورەوە دەستی بە پێشڕەوییەکانی کرد و لە مانگی مارتدا گەیشتە ناو بەغدا و لەوێشوە بەدوو ئاراستەدا بەرەو ناوچەکانی کوردستان کەوتەڕێ، جگە لەوەی هەر لەو ساڵەدا هێزەکانی بریتانیا لە ناوچەکانی فەلەستین چەند سەرکەوتنێکی گەورەیان بەسەر سوپای عوسمانیدا بەدەستهێنا و لە تشرینی دووەمی ١٩١٧دا چوونە ناو غەززەوە و دواتریش یافا و دوای ئەویش چوونە ناو قودسەوە، کە ئەمە کاریگەرییەکی خراپی لەسەر هەیبەتی ئەڵمانیا و دەوڵەتی عوسمانی هەبوو لە ناوچە ئیسلامییەکاندا، لە لایەکی ترەوە رۆژبەڕۆژ کاریگەریی جەنگی ژێردەریاییەکانی ئەڵمانیا بەسەر هێزی هاوپەیمانانەوە لە کەمبووندا بوو و ئەڵمانەکان چیتر نەیاندەواتی لەو رێگەیەوە کێشەی ئابووری بۆ ئینگلیزەکان دروست بکەن، بە

پێچەوانەوە، کاریگەرییەکەی بەسەر خودی ئەڵمانییەکانەوە زێتر بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەڵمانییەکان لە جەنگە ژێردەریاییەکانی خۆیان بەردەوام بوون، کە زیاتر مەبەستیان ناچارکردنی هاوپەیمانان بوو بۆ مۆرکردنی ئاشتینامە، بە تایبەت کە شۆڕشی رووسیا ئەوەندەی تر ئەو ئومێدەی پێ بەخشیبوون.

## – کاریگەری شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ی رووسیا لەسەر جەنگ*

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە یەك رۆژ، دەسەڵاتی نوێی بەلشەفییەکان لە رووسیا بەیانی ئاشتیی راگەیاند، کە تیایدا بانگەشەی بۆ کۆتاییهێنان بەو جەنگە دەکرد و جەختی لەسەر کشانەوەی رووسیا لە جەنگ دەکردەوە و بانگەوازی ئاراستەی سەرجەم گەلانی وڵاتە شەڕکەرەکان کرد، کە هەرچی زووترە دەست بە گفتوگۆ بکەن بۆ بەدیهێنانی ئاشتی سەرتاسەری بێ ئەوەی هیچ وڵاتێك وڵاتێکی تر داگیربکات، لەلایەکی تریشەوە ئەم دەسەڵاتە نوێیە سەرجەم پەیماننامە نهێنییەکانی نێوان رووسیای قەیسەری و هاوپەیمانانی ئاشکراکرد و بە پووچەڵ بوو لە قەڵەمی دان، کە ئەمەش گورزێکی گەورە بوو بەر هەیبەت و راگەیاندنی هاوپەیمانەکان بە تایبەت و زلهێزەکان بە گشتی کەوت، چونکە تەواوی گەلانی لەو سیاسەتی فریودان و لەخشتەبردنەی زلهێزەکان ئاگادار کردەوە کە لەژێر پەردەی شەڕێکی عادیلانەدا پیادەیان دەکرد.

دوای ئەوەی هاوپەیمانان پێشنیارەکەی رووسیایان قبوڵ نەکرد، رووسیا ناچار بوو یەکلایەنانە لەگەڵ ئەڵمانیادا رێك بکەوێت و لە ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩١٧دا پەیمانێکی لەگەڵ ئەڵمانیادا بەست، کە ئەم پەیمانە رێخۆشکەر بوو بۆ ئاشتینامەی (بریست لیۆتۆفسك)ی نێوان ئەڵمانیا و رووسیا. لە کاتی گفتوگۆکانی ئەم ئاشتینامەیەشدا رووسەکان جارێکی تر داوایان لە هاوپەیمانان کرد کە هەڵوێستی خۆیان بگۆڕن، بەڵام هاوپەیمانان هیچ وەڵامێکی ئەرێنیان نەبوو، بۆیە رووسەکان ناچار بوون لە ٣ی ئازاری ١٩١٨دا یەکلانەنانە ئاشتینامەکە لەگەڵ ئەڵمانیادا مۆربکەن، لە پێناو پاراستنی دەستکەوتەکانی شۆڕش و چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانی، رووسیا بەسەرجەم مەرجەکانی ئەڵمانیا رازیبوو بۆ ئەوەی جارێکی تر ئەڵمانیا هێز لەبەرانبەر رووسیا بەکارنەهێنێتەوە، چونکە لەو کاتەدا حکومەتی رووسی توانای بەرگریکردنی نەبوو.

---

* سەبارەت بە رووداوەکانی شۆڕشەکە لە بابەتی رووسیا لە نێوان هەردوو جەنگدا باس دەکرێت.

ئەم کشانەوەیەی رووسیا لە جەنگ کاریگەرییەکی راستەوخۆی لەسەر بەرەی هاوپەیمانان هەبوو، بەتایبەتیش لەبەرەی رۆژهەڵاتی جەنگدا، کە کەلێنێکی گەورەی تێکەوت، ئەمەش لە بەرژەوەندی ئەڵمانیا بوو و دواجاریش بووە مایەی خۆبەدەستەوەدانی رۆمانیا.

## – خۆبەدەستەوەدانی رۆمانیا

بە کشانەوەی رووسیا لە جەنگەکە و رێککەوتنی لەگەڵ ئەڵمانیا، رۆمانیا کەوتە ژێر فشارێکی زۆر گەورە و توانای خۆڕاگرتن و بەردەوامیدان بە جەنگی نەما، بۆیە لە ٧ی مایسی ١٩١٨دا پەیماننامەیەکی لە بوخارێست لەگەڵ وڵاتانی میحوەردا بەست و بەپێی ئەو پەیماننامەیەش، رۆمانیا سەربەخۆیی ئابووری لەدەستدا، هەروەها دەستبەرداری ناوچەی دوبرۆجە بوو بۆ بولگاریا و هەر بەپێی ئەم پەیماننامەیەش، کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەڵمانیا بوون بە خاوەنی مافی کنەکردن و دەرهێنانی نەوت لە ناوچەکانی رۆمانیا بۆ ماوەی ٩٠ساڵ.

## – رووداوە سەربازییەکانی بەرەی رۆژئاوا لە ساڵی ١٩١٨دا

دوای هاتنەناوەوەی ئەمەریکا بۆ جەنگ، ئەڵمانیا لەوە گەیشتبوو، کە پێویستە جەنگێکی قورس لە بەرەی رۆژئاوادا بکات و بەر لە گەیشتنی سوپای ئەمەریکا و هاوکارییەکانی، گورزێکی خێرا لە هێزەکانی ئینگلیز و فەرەنسا بوەشێنێت، بۆیە لە مانگی مارتەوە بۆ مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٨، ئەڵمانییەکان لەو بەرەیەدا چوار هێرشیان و لە زۆر شوێنەوە پێشڕەوی گەورەیان کرد، تەنانەت گەیشتنە سەر رووباری مارن، کە ٧٠ کیلۆمەتر لە پاریسەوە دوورە، هەرچەندە ئەو سەرکەوتنانە سوپای هاوپەیمانانیان تێك شکاند، بەڵام تەنها کاتی بوون، و زیاتر بوونە مایەی ماندووبوونی هێزی ئەڵمانیا و بەفیڕۆچوونی کەرەستە یەدەگەکانیان، لەکاتێکدا ، کە ئەڵمانییەکان بۆخۆیان لە قەیرانێکی راستەقینەی ئابووریدا بوون و سەرجەم ئەنبارەکانیان خاڵی بوون و کارگەکانیان لەکار کەوتبوون، سوپای هاوپەیمانانیش لەوکاتەدا لەڕووی تەکنیك و لەڕووی سەربازیشەوە وردە وردە بەرەو خۆڕێکخستنەوە و بەهێزبوون دەچوو، لەو کاتەدا هاوپەیمانان سەرکردایەتییەکان یەکخست و ژەنەرال (فۆشی) فەرەنسیان کرد بە سەرکردەی گشتی سوپای هاوپەیمانان، بە سوودوەرگرتن لەو لاوازییەی ئەڵمانیاش کە تەنانەت لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩١٨دا توانای بەرگریکردنی

درێژخایەنیشیان لە دەستدابوو، فەرەنسییەکان هێرشیان کردە سەر ئەڵمانییەکان و توانیان ناوچەیەکی فراوان لەو ناوچانەی کە ئەڵمانیا داگیری کردبوون، بگێڕنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، لێرەشەوە، جەنگی یەکەمی جیهان پێی نایە قۆناغی یەکلاییبوونەوە و بەرەی ولاتانی میحوەر تا دەهات بەرەو هەرەس دەچوو و گرنگترین رەگەزەکانی جەنگ وەك زەخیرە و کەرەستە سەرەکییەکانی جەنگی لەدەست دابوو، بەڵام سەرکردایەتی سەربازیی ئەڵمانیا ئەم راستییەی لە حکومەتەکەی و هێزە سیاسییەکانی وڵات شاردبۆوە، تا کۆتایی مانگی ئەیلوولیش دانی بەو راستییەدا نەنا، کە توانای خۆڕاگرتن و بەرگریکردنی نەماوە.

ئەو بارودۆخە بووە هۆکاری قەیرانێکی سیاسیی لە ناوەوەی ئەڵمانیا و سەرەنجامیش لە ٢٠ی ئەیلوولی ساڵی ١٩١٨دا حکومەتێکی نوێ دامەزرا، ئەم حکومەتە لە ٤ی تشرینی یەکەمدا یاداشتێکی دایە سەرۆکی ئەوکاتی ئەمەریکا کە سەرۆك وڵسن بوو، لەو یاداشتەدا داوای کردبوو ئاگربەست رابگەیەنرێت و ئامادەی بەوە کردبوو کە ئەوان ئامادەی ئاشتین بەپێی چواردە بەندەکەی وڵسن، بۆ ئەم مەبەستەش ماوەی یەك مانگ گۆڕینەوەی یاداشت لە نێوان ئەڵمانیا و ئەمەریکا بەردەوام بوو، ئەمەش بەتەواوەتی هاوپەیمانانی گەیاندە ئەو باوەڕەی کە سوپای ئەڵمانی تەواو هەرەسی هێناوە و هێندەی نەماوە کێشە و شۆڕش لە ناوەوەی ئەڵمانیا دەستپێ بکات و بۆیە دەستبەرداری ئەو هێرشە سەربازیانە بوون، کە پلانرێژیان بۆ کردبوون بۆسەر ئەڵمانیا، چونکە دەیانویست سوپای ئەڵمانیا لەبەرانبەر ئەو دەوڵەتە نوێیەی رووسیا بهێنێتەوە، لەو سەروحەدەشدا بوو هاوپەیمانانی ئەڵمانیا یەك لە دوای یەك هەرەسیان دەهێنا و خۆیان بەدەستەوە دەدا، ئەمەش زیاتر ئەڵمانیای لاواز دەکرد و جەنگی یەکەمی جیهانیشی لە کۆتایی نزیك دەکردەوە.

### – خۆبەدەستەوەدانی بولگاریا و دەوڵەتی عوسمانی

لەو سەروبەندەدا کە ئەڵمانیا رۆژ لەدوای رۆژ لە بەرەی رۆژئاوادا پاشەکشەی دەکرد و هەوڵەکانی بۆ مۆرکردنی ئاشتینامە بەردەوام بوو، هاوپەیمانەکانی یەك دوای یەك هەرەسیان دەهێنا و لە جەنگ دەچوونە دەرەوە، بەر لە هەمووانیش بولگاریا بەهۆی ئەو قەیرانە ئابوورییە توندەی کە بەسەریدا هاتبوو، لە توانایدا نەمابوو لەبەرانبەر پێشڕەویکردنەکانی هاوپەیمانان خۆڕابگرێت، بۆیە ناچار بوو لە ٢٩ی ئەیلوولی ساڵی ١٩١٨دا رێککەوتنێکی مەرجدار لەگەڵ هاوپەیماناندا مۆر بکات.

دوای بولگاریاش، دەوڵەتی عوسمانی کە هەر لە سەرەتاوە بەبێ هێزیی هاتە ناوجەنگەوە، دواتریش ڕۆژ بەرۆژ بەرەو داتەپین دەچوو، بە تەواوی لە بەرانبەر سوپای ئینگلیزەکان هەرەسی هێنا و لە ناوچەکانی سووریا و عیراق و فەلەستین تێك شکا، بۆیە ناچاربوو لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨دا سەرجەم مەرجەکانی ئینگلیز قبوڵ بکات و ڕێککەوتننامەی مۆدریس مۆربکات و بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیەش، تەواوی ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی سەربازیانەی هاوپەیمانانەوە.

لە بارەی ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەریشەوە لەو کاتەدا ئەو تەوژمە شۆڕشگێڕانەی کە لەلایەن گەلە جیاجیاکانی ژێر دەسەلاتی نەمسا-مەجەرەوە دەرکەوت، بە تەواوی شپرزەی کردبوو و بزووتنەوە نەتەوەییەکانی بەشێکی زۆری ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی، جیابوونەوەی خۆیان ڕاگەیاندبوو و سەربەخۆ بووبوون و بەمەش ئەو ئیمپراتۆریایە بە تەواوی هەرەسی هێنابوو، لەو کاتەشدا ئیتالیا دوایین هێرشی خۆی کردە سەر ئیمپراتۆرییەکە و ناچاری کرد لە ٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨دا ئاگربەست لەگەڵ ئیتالیادا مۆربکات.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، سەرکردایەتی ئەڵمانیا تا ئەو کاتەش دەستبەرداری سیاسەتە سەرکێشییەکەی خۆی نەبووبوو و لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨دا بڕیاریان دا هێرشێکی دەریایی گەورە ئاراستەی کەشتیگەلی ئینگلیز بکەن، ئەم بڕیارەش وایکرد دەریاوانە ئەڵمانییەکان لە دژی ئەم بڕیارە لە کیل ڕاپەڕینێك ئەنجام بدەن، کە دواتر پروشکی ئەم ڕاپەڕینە تەواوی ناوچەکانی ئەڵمانیای گرتەوە و بوو بە سەرەتای شۆڕشێکی گشتگیر لە ئەڵمانیا و سیستەمی ئیمپراتۆریی هەڵوەشایەوە و ئیمپراتۆر (ویلیەمی سێیەم) وڵاتی جێهێشت و سیستەمی کۆماری شوێنی گرتەوە و حکومەتێکی کاتی بە سەرۆکایەتی (ئێبرت) کە کەسێکی سۆسیال-دیموکرات بوو، دامەزرا.

یەکەم ئەرکی ئەم حکومەتەش ڕاگەیاندنی ئاگربەست لەگەڵ هاوپەیماناندابوو، لە کۆتاییشدا، لە ١١ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨دا ژەنەراڵ (فۆشی) فەرەنسی مەرجەکانی ئاگربەستی بەسەر ئەڵمانییەکاندا ڕاگەیاند و بەپێی ئەم مەرجانەش، ئەڵمانیا ڕازیبوو لە تەواوی ئەو ناوچانە پاشەکشە بکات کە داگیری کردوون و لە ماوەی ١٥ ڕۆژیشدا لە فەرەنسا و بەلجیکا و لۆکزنبێرگ و ناوچە ئەڵمانییەکانی لای چەپی ڕووباری ڕاین بکێشتەوە، هەروەها سوپاکانی لە هەریەکە لە تورکیا و ڕۆمانیا و ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر و داگیرگەکانی ئەفریقا بکشێنێتەوە، ڕازیشبوو کە فڕۆکە و تۆپ و جبەخانەکانی و ژمارەیەکی زۆر لە

شەمەندەفەرمانی و بەشێکی زۆر لە کەشتیگەلەکەی رادەستی هاوپەیمانان بکات، بەڵام سەبارەت بە ناوچەکانی رووسیا کە ئەڵمانیا داگیری کردبوو، لەبەرئەوەی ئەو کاتە حکومەتی رووسیای نوێ هەبوو، هێزەکانی ئەڵمانیا هەر لەوێ مانەوە. بەم جۆرەش دوای زیاتر لە چوار ساڵ لەکاولکاری و ماڵوێرانی، جەنگی یەکەمی جیهان کۆتایی پێهات.

## چوارەم: ئەنجامەکانی جەنگی یەکەمی جیهان

جەنگی یەکەمی جیهان ئەو رووداوە مێژووییە گەورەیە بوو کە کۆمەڵێك ئەنجامی کۆمەڵایەتی، سیاسیی و ئابووری گەورەی لێ کەوتەوە و لە ئاکامی ئەم جەنگەدا، نەخشەی سیاسیی جیهان گۆڕانکارییەکی گەورەی بەسەردا هات و چەندین دەوڵەتی نوێ لەسەر خۆڵەمێشی وڵاتە گەورەکانی پێشووتر دەرکەوتن و گۆڕانێکی گەورەش بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا هات بەم جۆرەی لای خوارەوە:

١. هەر یەکە لە ئیمپراتۆریای ئەڵمانیا و نەمسا-مەجەر و دەوڵەتی عوسمانی و رووسیا کۆتاییان پێهات، هاوکات کۆتایی بە دەسەڵاتی چەند بنەماڵەیەکی پاشایی هات لەوانە بنەماڵەی هۆهنزلرنی ئەڵمانی و لە شوێنیدا کۆمارێکی ئەڵمانی نوێ دامەزرا، کە بەشی زۆری ناوچە ئەڵمانییەکانی دەگرتەوە، بەڵام ناوچەکانی ئەلزاس و لۆرین گەڕانەوە بۆ فەرەنسا و بەشێك لە خەڵکی ئەڵمانیاش بەر نەمسا و کۆماری چیکۆسلۆڤاکیا کەوتن، لەلایەکی تریشەوە کۆتایی بە دەسەڵاتی بنەماڵەی هۆبسبێرگ لە نەمسا هات و کۆمارێکی نەمسایی بچووك دامەزرا و چەندین گەلی وەکو یۆگسلاڤی و چیك و سلۆڤاکی و رۆمانی و پۆلەندی لێ جیابۆوە، هەروەها جەنگی یەکەمی جیهان هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی بنەماڵەی رۆمانۆڤ لە رووسیا، هاوکات دەسەڵاتی خەلیفە عوسمانییەکانیش کۆتایی پێهات و کۆماری تورکیای نوێ دامەزرا و سەرجەم وڵاتە عەرەبییەکان و چەند ناوچەیەك لە ئەورووپا و دوورگەکانی دەریای ئیجەی لێ جیابۆوە.

٢. چەند دەوڵەتێکی نوێ لەسەر نەخشەی سیاسیی جیهان دەرکەوتن، لەوانە کۆماری نەمسا و کۆماری پۆڵەندا و کۆماری چیکۆسلۆڤاکیا و کۆماری تورکیا و شانشینی یوگسلاڤیا و شانشینی مەجەر.

٣. رووبەڕووی هەندێك وڵاتی وەك فەرەنسا و سربیا و رۆمانیا زیادبوونی بەخۆیەوە بینی.

٤. دەرکەوتنی چەند وڵاتێکی نوێ لە ناوچە عەرەبییەکاندا وەك سوریا و لوبنان و فەلەستین و عیراق و میسر و سوودان و لیبیا و تونس، کە هەر یەکێك لەمانە دەکەوتە ژێر ئینتیدابی یەکێك لە وڵاتە هاوپەیمانەکان، بەتایبەت فەرەنسا و بریتانیا.

٥. هەر لە ئەنجامی جەنگی یەکەمی جیهاندا بوو، کە کوردستان بەسەر تورکیا و ئێران و عیراق و سوریادا دابەش بوو، پارچەیەکی بچووکیشی بەر رووسیا کەوت.

٦. دەرکەوتنی کۆمەڵەی گەلان وەك هەنگاوی یەکەمی دەرکەوتنی رێکخراوەیەکی نێونەتەوەیی بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی جیهان.

٧. دەرکەوتنی سیستەمی ئینتیداب لەبری سیستەمی کۆلۆنیالیستی کۆن.

٨. دەرکەوتنی یەکێتی سۆڤێت وەك زلهێزێکی نوێی جیهانی لەسەر بنەمای سۆسیالیستی.

٩. رووداني گۆڕانکارییەکی ریشەیی لە سیستەمی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا و گۆڕانی پارسەنگی هێز و دەرکەوتنی ئەمەریکا وەك زلهێزێکی نوێ و تەنگهەڵچنینی بە ئەورووپا لە سەرجەم بوارە سیاسیی و ئابوورییەکان.

١٠. قوڵبوونەوەی وشیاری نەتەوەیی و هەستی نیشتیمانی، تایبەت لای ئەو گەلانەی کە ژێردەستە و داگیرکراو بوون، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لە چەند وڵاتێکدا سەربەخۆیی بەدەست بهێنن.

١١. جەنگی یەکەمی جیهان زیانێکی زۆر گەورەی مرۆیی و ئابووری لێکەوتەوە، کە زیاتر لە دە ملیۆن کەس کوژران و حەوت ملیۆن کەسیش بێکار کەوتنەوە، بە سەدان ملیار دۆلاریش بەبێ هیچ دەستکەوتێك بەفیڕۆ چوو.

# بەشی دووەم

## کۆنگرەی ئاشتی و کۆمەڵەی گەلان:

### یەکەم: کۆنگرەی ئاشتی:

دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهان، وڵاتە براوەکان کەوتنەخۆ بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی فراوان بە مەبەستی یەکلاییکردنەوەی کێشەکان و سەپاندنی سزاکان بەسەر وڵاتە دۆڕاوەکاندا، هەندێکیان پێیان باش بوو کۆنگرەکە لە شاری ژنێفی پایتەختی سویسرا بکرێت، چونکە وڵاتێکی بێ لایەن بووە و دوور بووە لە کاریگەرییەکانی جەنگ، بەڵام هەندێکی تریان کە زۆرینە بوون، پێیان وابوو دەبێت ئەم کۆنگرەیە لە شاری پاریسی فەرەنسا ببەسترێت، چونکە فەرەنسا رۆڵی گەورەی هەبووە لە جەنگەکە و وڵاتەکەی گۆڕەپانی جەنگەکان بووە، هەروەها ئەوکات ئەگەر چی هەندێك لە ئەمەریکییەکان دەیانەویست کۆنگرەکە لە واشینگتۆن ببەسترێت بەو بیانووەی ئەمەریکا رۆڵی یەکلاییکەرەوەی هەبووە لە جەنگدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەریکییەکان رازیبوون بەوەی لە پاریس کۆنگرەکە ببەسترێت، چونکە سوپایەکی ئەمەریکیشی لێبوو بۆ پاراستنی سەرۆك ولْسن، بۆیە لە ١٨ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٩، کۆنگرەکە دەستی پێکرد.

لەم کۆنگرەیەدا ئەگەرچی نوێنەری ٢٩ وڵات ئامادە بوون، بەڵام رای سەرەکی هەر بۆ نوێنەرانی چوار وڵاتە زلهێزەکە بوو، ئینگلیز و فەرەنسا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئیتالیا، ژاپۆنیش هەرچەندە لە جەنگدا هاوپەیمانیان بوو، بەڵام تەنها لەو باسانەدا ئامادەیی هەبوو کە پەیوەست بوو بە رۆژهەڵاتی دوورەوە.سەبارەت بە نوێنەرە سەرەکی و دیارەکانی ناو کۆنگرە، برێتی بوون لەمانە:

١.  لۆرد ولْسن، که سەرۆکی ئەمەریکا بوو لەو کاتەدا و سەرۆکی شاندی ئەمەریکی بوو لە کۆنگرەکەدا، ئەم کەسایەتییە پێشتر سەرۆکی زانکۆی پرستۆن بووە و دواتریش حاکمی ویلایەتی نیوجێرسی بوو، بەر لەوەی ببێــتە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانیش، مامۆستای زانستە سیاسییەکان بووە. یەکێك بووە لەو کەسانەی خاوەنی بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلان بووە و زۆر لەگەڵ پاراستنی ئاشتی نێودەوڵەتیدا بوو، ئەو لە کۆنگرەکەدا زیاتر هەوڵی دەدا بۆچوونەکانی خۆی بەسەر شاندەکانی تردا بسەپێنێت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

٢.  کلیمەنسۆ، سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا بوو و سەرۆکی شاندی فەرەنسیەکانیش بوو، کلیمەنسۆ پارێزەرێکی زۆر باش و سیاسییەکی زۆر لێهاتوو بوو، کە بە پڵینگ دەناسرا، هاوکات کەسایەتییەکی رۆشنبیر و دیپلۆماتێکی کارامەش بوو، مەبەستی سەرەکی ئەو لە کۆنگرەکەدا بەدەستهێنانی خواستەکانی فەرەنسا و تۆڵەستاندنەوە بوو لە ئەڵمانیا تا بتوانن ئەڵمانیا بەڕادەیەك بەربەست بکەن، کە جارێکی تر نەبێتەوە مایەی ترس بۆ فەرەنسا.

٣.  شاندەکەی بریتانیاش بەسەرۆکایەتی لوید جۆرج بوو، کە بلفۆری وەزیری دەرەوەیشی لەگەڵدا بوو، لوید جۆرج پارێزەرێکی رێزدار و پەرلەمانتارێکی کارامە و سیاسییەکی نەرمونیان بوو، ئەو سەرۆکی پارتی لیبرالی بریتانیا و سەرۆك وەزیرانی بریتانیاش بوو، مەبەستی بریتانییەکان زیاتر جێگیربوونی ئەوروپا بوو و شاندەکەشیان دەیەویست ئەڵمانیا ناچار بکات تێچوونی جەنگەکە بداتەوە و بەڵام نەیدەویست زۆر بە توندی مامەڵە لەگەڵ ئەڵمانیادا بکرێت بەڕادەیەك ببێتە هۆی بڵاوبوونەوەی کۆمونیستی لەوێدا. بەدرێژایی کۆنگرەکە، لوید جۆرج چاودێری دۆخی ناوەوەی بریتانیا و گۆڕانکارییەکانیشی دەکرد و هەوڵی دەدا گونجاندنێکی وەها دروست بکات، کە نارەزایی بەرانبەر کارەکانی دروست نەبێت.

٤.  ئۆرلاندۆ، سەرۆکایەتی شاندی ئیتالیای دەکرد، کە پارێزەرێکی شارەزا و کەسایەتییەکی خۆشەویستی وڵاتەکەی بوو. ئەم زیاتر هەوڵی ئەوەی دەدا بەندەکانی پەیماننامە نهێنییەکەی لەندەنی ساڵی ١٩١٥ی نێوان ئەوان و هاوپەیمانان جێبەجێ بکرێت، چونکە هاوپەیمانەکان وەك پێشتر باس کرا، بەڵێنی پێدانی ناوچەیەکی زۆریان پێدابوو، بەڵام ئۆرلاندۆ لە هەوڵەکانیدا سەرکەوتوو نەبوو و بۆیە لە کۆنگرە کشایەوە و گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی.

٥.  وەفدی ژاپۆنی کە بە سەرۆکایەتی (سیۆن جی) بوو، ئەمان کەمتر لەو کێشانەی تایبەت بوون ئەوروپاوە بەشداردەبوون، چونکە ئەو نەیدەویست هیچ وڵاتێکی تر لە دژی ژاپۆن بوروژێنێت، بۆیە تەنها لەو کێشانەدا بەشداری دەکرد، کە تایبەتبوون بە رۆژهەڵاتی دوورەوە.

شاندەکەی ژاپۆن داوای ئەوەیان دەکرد کە ئەو پەیماننامەیەی لە ١٦ی شوباتی ١٩١٧دا لە نێوان ئەوان و ئینگلیزدا بەسترابوو، جێبەجێ بکرێت، چونکە لەوێدا ئینگلیزەکان بەڵێنی ئەوەیان دابوو کە چەند ناوچەیەك لە دوورگەکانی زەریای هێمن و چەند ناوچەیەکی تر کە داگیرگەی ئەڵمانی بوون، بدەن بە ژاپۆن.

٦. یەکێکی تر لە شاندەکانی کۆنگرەکە، ژەنەراڵ (سمیس)ی نوێنەری ئەفریقای باشوور بوو، ئەم بوو کە سیستەمی ئینتیدابی پێشنیارکرد و دواجاریش پەسەندکرا. هەروەها نوێنەری چیکۆسلۆڤاکیا و پاشای بەلجیکا لەوێ بوون، لەگەڵ نوێنەری چەندین وڵات و گەلی تر.

لە ١٨ی کانوونی دووەمی ١٩١٩دا، کۆنگرەکە کرایەوە و نوێنەری ٧٠ لایەن لە یەکەم دانیشتنندا ئامادە بوون، بەڵام وڵاتە دۆڕاوەکان و رووسیا رێیان پێنەدرا ئامادەی کۆنگرەکە بن، لەم کۆنگرەیەدا شەش دانیشتنی گشتی بەسترا، کە یەکێکیان تایبەت بوو بە کۆمەڵەی گەلان، ئەوانی تریش بەو جۆرە گرنگ نەبوون، دوای ئەوە، ئەندامەکان بەسەر لیژنەکاندا دابەش کران و نوێنەری زلهێزە گەورەکانیش کۆنترۆڵی ئەو لیژنانەیان کردبوو. یەکێك لە لیژنە سەرەکییەکان لیژنەیەکی دە ئەندامی بوو، بەو مەرجەی دوو ئەندامی هەر زلهێزێکی تێدا بێت لە پێنج زلهێزەکە، کە ئەرکی سەرەکی تاوتوێکردن و گفتوگۆکردنی کێشە گرنگەکان بوو، دواتریش لیژنەیەك دانرا، کە تەنها لە پێنج سەرۆك شاندە گەورەکە پێك دەهات، بەڵام نوێنەری ژاپۆن رۆڵی لاوەکی تێدا دەگێڕا، دوای کشانەوەی ئۆرلاندۆش، لیژنەکە لە سێ ئەندام پێکدەهات.

لە ٢٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩دا، دوای بێنەوبەرە و گفتوگۆ و کێشەو مشتومڕێکی زۆر، پەیمانی ڤێرسای مۆرکرا، دواتریش چەند پەیمانێکی تر لەگەڵ وڵاتە دۆڕاوەکاندا مۆرکرا، لە ٢١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢١دا، کۆنگرەکە کۆتایی بەکارەکانی خۆی هێنا، لە راستیدا ئەم کۆنگرەیە بۆ هاوپەیمانان زۆر دژاور بوو، چونکە دۆخەکە بە رادەیەك ئاڵۆز بوو، کە ئاسان نەبوو ئەم شاندانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، لەبەر ئەوەی هەر یەکێکیان شاندی وڵاتێکی کۆلۆنیالیستی گەورەی خاوەن بەرژەوەندی فراوان بوون، بۆیە زۆر بە ئاسانی لەسەر کێشەکان و یەکلاییکردنەوەیان رێك نەدەکەوتن، کە هەندێك جار بارودۆخی نێوانیان تا قەیران دەچوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆنگرەکە چەند پەیماننامەیەکی لەگەڵ وڵاتە دۆڕاوەکاندا مۆرکرد، لەوانەش:

## - پەیماننامەی ڤێرسای

### گرنگترین بەندەکانی پەیماننامەی ڤێرسای

أ. بەشی یەکەمی پەیماننامەکە تایبەت بوو بە گەلاڵەنامەکەی کۆمەڵەی گەلان.

ب. بەشێکی تری تایبەت بوو بە رێکخستنی سنووری ئەڵمانیا بەم جۆرە:

١. گێڕانەوەی ناوچەکانی ئەلزاس و لۆرین بۆ فەرەنسا بەپێی ماددەی ٥١٠.

٢. ناوچەی سار کە ناوچەیەکی دەوڵەمەند بوو بە کانە خەڵوزییەکان، بۆ ماوەی ١٥ ساڵ خرایە ژێر دەسەڵاتی فەرەنساوە بەو مەرجەی لە کۆتایی ئەو ماوەیەدا راپرسییەك لەو ناوچەیە ئەنجام بدرێت بۆ ئەوەی خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن.

٣. هەر سێ هەرێمی (ئۆبن و مالنیدی و مۆرسن) دران بە بەلجیکا.

٤. بڕیاردرا لە بەشی باکووری شلزڤیگ راپرسییەك بکرێت تا دانیشتوانەکەی چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن.

٥. بڕیاردرا لە سەر سەربەخۆیی پۆلەندا، بە مەرجێك رێڕەوێکی ٦٠ میل پانی پێدرا بۆ ئەوەی بگاتە سەر دەریای بەلتیك.

٦. سیلیزیای سەروو لە نێوان پۆلەندا و چیکۆسلۆڤاکیا دابەش کرا و زۆرینەش بەر پۆلەندا کەوت. ناوچەی دانتزیك خرایە ژێر چاودێری کۆمەڵەی گەلان بەمەرجێك پۆلەندا لەبری ئەو بەڕێوەی بەرێت.

ج. بەشێکیشی تایبەت بوو بە داگیرگەکانی ئەڵمانیا، کە ئەڵمانیا دەست لە سەرجەم داگیرگەکان و ئیمتیازەکانی لەوێدا هەڵبگرێت، ئەم ناوچانە بەسەر هاوپەیماناندا دابەش بکرێت. هەروەها ئەڵمانیا ناچار بوو دەست لە سەرجەم جیاوگ و بەرژەوەندییەکانی لە دەوڵەتی عوسمانی و بولگاریا و ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر هەڵبگرێت.

د. لەڕووی سەربازییشەوە بڕیاردرا:

١. بەشی رۆژئاوای رووباری راین بۆ ماوەی ١٥ ساڵ لەلایەن سوپای فەرەنسییەوە بەڕێوەببرێت، بۆ ئەوەی بەر بە فراوانخوازییەکانی ئەڵمانیا بگیرێت.

٢. سەرجەم قەلاّ و شوێنە سەختەکانی بەشی رۆژهەلاّتی رووباری راین بە رووبەری ٥٠ کیلۆمەتر تێك بدرێت و ئەو ناوچەیە کرا بە ناوچەی بێ چەك، واتا نابێت چەکدار یان سەرباز لەوێدا هەبێت.

٣. بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپای ئەڵمانیا دەرکرا و ئەڵمانیا ناچارکرا کە لە ١٠٠ هەزار سەرباز و ٤ هەزار ئەفسەر زیاتری نەبێت. سوپای دەریایی و کەرەستەی جەنگی دەریایی و کەشتیگەلەکەشی سنووردارکرا.

٤. قەدەغەکرا ئەڵمانیا فڕۆکەی جەنگی دروست بکات و سوپای ئاسمانی دابمەزرێنێت.

٥. بڕیاردرا چاودێرییەکی توند بخرێتە سەر دروستکردنی چەك و کەرەستە سەربازییەکان لە ئەڵمانیا.

٦. قەدەغەکرا ئەڵمانیا گازی ژەهراوی یان شلەی هاوشێوەی دروست بکات.

٧. بڕیاردرا کە ئەڵمانیا بۆی نەبێت زرێپۆش و تانك دروست بکات یان لەدەرەوە بیانهێنێت.

٨. بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی خزمەتی سەربازی زۆرەملێ لە ئەڵمانیا درا.

بەپێی ماددەی ٢٣١ی کۆنگرەکەش، بەرپرسیارێتی جەنگی یەکەمی جیهان درایە پاڵ ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانی، کە مەبەستیش لەمە ناچارکردنی ئەڵمانیا بوو بۆ ئەوەی ئەو زیانانەی کە بەر هاوپەیمانان یان یەکێك لە وڵاتە لایەنگرەکانی بەهۆی جەنگەوە کەوتووە، بگرێتەئەستۆ.

**هـ.** قەرەبووەکان:

لە راستیدا کۆدەنگییەك لەنێو هاوپەیماناندا نەبوو لەم بارەیەوە، هەر لە سەرەتاوە ئاراستەیەکیان هەبوو، کە پێیوابوو ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانی دەبێت ناچار بکرێت سەرجەم تێچوونەکانی جەنگ بدەنەوە، بەڵام دوای وردبوونەوە، دەرکەوت کە جێبەجێکردنی ئەمە لە توانادا نییە، بۆیە بیریان لەوە کردەوە، ئەڵمانیا ناچار بکرێت تەنها ئەو زیانانە بداتەوە، کە بەر خەڵکی بێ چەك کەوتووە، دواتریش مووچەی خانەنشینی سەربازییەکانیشی خرایەسەر، بەڵام فەرەنسا دەیەویست ئەڵمانیا ناچار بکرێت کە گەورەترین قەرەبوو بداتەوە، بۆ ئەوەی بە تەواوەتی ئەڵمانیا لاواز بکرێت و فەرەنساش ببووژێتەوە، بەڵام سەرۆك ولّسن بەوە رازینەبوو کە ئەڵمانیا بەو توندییە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، ئەویش لە ترسی بڵاوبوونەوەی کۆمونیستی لەوێدا، بۆیە داوای هیچ قەرەبوویەکی بۆ ئەمەریکا نەکرد، دواتریش ئاراستەیەك

هاتەگۆڕێ، ئەویش ڕەچاوکردنی توانای ئەڵمانیا بوو بۆ دانەوەی قەرەبووەکان، هەرچەند بیروبۆچوونەکان لەم بارەیەوە جیاوازبوون، بەڵام لیژنەیەك بە سەرۆکایەتی سەرۆك وەزیرانی ئوستراليا بۆ ئەم مەبەستە دانرا و توانای ئەڵمانیای بە ٢٤ هەزار ملیۆن پاوەند مەزەندە کرد، بەڵام دوای گفتوگۆیەکی زۆر، ئەم بڕە پەسەند نەکرا و بڕیاردرا لیژنەیەکی تر بۆ ئەم مەبەستە پێك بێت و ئەم لیژنەیە کارەکانی قەرەبووکردنەوە بگرێتە ئەستۆ.

**– پەیماننامەی سان جێرمان لەگەڵ نەمسا**

بەپێی ئەم پەیماننامەیە، کە لە ١٠ی ئەیلوولی ١٩١٩دا لە نێوان هاوپەیمانان و نەمسادا بەسترا، ڕووبەری نەمسا بە ٨٤ هەزار کم٢ دیاری کرا و نەمساش بوو بە کۆمارێکی بچووك، کە دانیشتووانەکەی شەش ملیۆن و نیو بوو، سوپاکەشی بە ٣٠ هەزار سەرباز سنووردار کرا، هەر لەم پەیماننامەیەشدا یەکگرتنەوەی نەمسا لەگەڵ ئەڵمانیا قەدەغەکرا، هەروەها بڕیاردرا کە هەرێمی تریستا لە نەمسا جیابکرێتەوە و بدرێتە پاڵ ئیتالیا و هەردوو هەرێمی بۆهیمیا و مۆراڤیا بدرێتە چیکۆسلۆڤاکیا و نەمسا دەستبەرداری گالیسیا بێت بۆ پۆڵەندا، هەروەها پێویستە نەمسا بەڵێنی ئەوە بدات، کە ڕێز لە مافی کەمە نەتەوەیی و ئایینییەکانی چوارچێوەی نەمسا بگرێت.

**– پەیماننامەی تریانۆن**

ئەم پەیماننامەیە لە ١٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٠دا لە نێوان هاوپەیمانان و مەجەردا لە کۆشکی تریانۆن مۆرکرا، بەپێی ئەم پەیماننامەیە ڕووبەری دەوڵەتی مەجەری نوێ بە ٩٢ هەزار کیلۆمەتر کم٢ دیاری کرا و ژمارەی دانیشتووانەکەیشی ٨ ملیۆن کەس بوو و سوپاکەیشی بە ٣٥ هەزار سەرباز سنووردار کرا، هەروەها قەرەبووی جەنگیشی خرایە سەر. هەر بەپێی بەندەکانی ئەم پەیماننامەیە، هەرێمی ترانسیلڤانیا لە مەجەر جیاکرایەوە و خرایە پاڵ ڕۆمانیا، هەروەها کرواتیا و بەشێك لە هەرێمی بانات درایە یوگسلاڤیا.

## – پەیماننامەی نۆلی لەگەڵ بولگاریا

ئەم پەیماننامەیەش لە نێوان هاوپەیمانان و بولگاریا لە ٢٧ی تشرینی ساڵی ١٩١٩دا مۆرکرا، کە تیایدا سوپای بولگاریا بە ٢٠ هەزار سەرباز سنووردار کرا و بەشێکی گەورەی بەشە رۆژئاواییەکانی بولگاریا درا بە یوگسلاڤیا کە زۆرینەیان بولگاریش بوون، هەروەها بڕیاردرا کە تراقیای رۆژئاوا بدرێتە یۆنان، لە کۆتاییشدا قەرەبوویەکی جەنگی بەسەر بولگاریادا سەپێنرا، کە دەبوو بیدات بە وڵاتە سەرکەوتووەکان. هاوکات دەبوو سەرجەم خەرجی ئەو لیژنانەی کە بۆ مەبەستی جێبەجێکردنی ئەم پەیماننامەیە دانرابوون، لە ئەستۆ بگرێت، بە خەرجی ئەو سوپا نێودەوڵەتییانەوە کە لە نێو خاکەکەی دان.

## – پەیماننامەی سێڤر

لە ١٠ی ئابی ساڵی ١٩٢٠دا هاوپەیمانان ئەم پەیماننامەیەیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا مۆرکرد، کە گرنگترین بەندەکانی بریتی بوون لەوەی تەنگەبەرەکانی دەردەنیل و بوسفۆر بکرێتە ناوچەیەکی لە چەکداماڵراو و لیژنەیەکی نێودەوڵەتی چاودێری بکات، هەروەها بڕیاردرا چەند ناوچەیەکی گرنگ و بە ناوچەی ئەزمیریشەوە بدرێت بە یۆنان، دورگەی رۆدس و دۆدیکانز بدرێتە ئیتالیا و سەربەخۆیی ئەرمینیاش لەبەشی رۆژهەڵاتی ئەنادۆل لەژێر چاودێری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا رابگەیەنرێت. هەروەها ئۆتۆنۆمی بدرێتە کوردستان، هەر بەپێی ئەم پەیماننامەیە بڕیار وابوو سوپای تورکی و هێزی جەندرمە و پاسەوانانی سوڵتانیش سنووردار بکرێت، بەڵام ئەم پەیماننامەیە لەلایەن بزووتنەوەی مستەفا کەمال ئەتاتورکەوە دژایەتی کرا و لە دواجاریشدا توانی پووچەڵی بکاتەوە و بیگۆڕێت بە پەیماننامەی لۆزانی ساڵی ١٩٢٣، کە بەپێی ئەم پەیماننامەیە، تورکیا دەستبەرداری دورگەی عەرەبی و سوریا و عێراق و فەلەستین و میسر و سوودان و قوبرس بوو، هەروەها تەواوی دەسەڵاتی تورکیا بۆ ئەستەنبول گەڕایەوە و دان بە دەسەڵات و سیادەی تەواوی دانرا لە ناوچەی ئەنادۆل، هاوکات سەرجەم ئەو قەرەبووانەی کە لە سێڤردا بەسەر تورکیادا سەپێنرابوون، پووچەڵ کرانەوە و بڕیارش درا کە بەندەرەکانی تورکیا ئازاد بێت بۆ هەموو کەشتییەك و قەدەغەش کرا کە تورکیا بنکەی سەربازی و قەڵا لە سەر رۆخی دورگەکان دابمەزرێنێت.

له كۆتاييدا لەدواى جەنگ، بەندەكانى ئەو پەيماننامانە بوون بە بناغە و بنەماى ئەو پەيوەندييە نێودەوڵەتييانەى، كە لەدواى جەنگدا جيهانى گرتەوە، ئەويش لە چوارچێوەى رەچاوكردنى بەرژەوەنديى وڵاتە براوەكانى جەنگ لەسەر حسابى بەرژەوەندى وڵاتانى تر. لە راستيدا ئەم پەيماننامانە بەشێكى زۆر لە كێشەكانى پێشووتريان هێشتەوە و ئەمە جگە لەوەى كە چەند كێشەيەكى نوێشيان سەربارى كرد، كە دواجار ئەم كارەيان دۆخێكى سياسيى هێندە ئاڵۆزيى نايەوە، كە سەرەنجامەكەى كەوتنەوەى جەنگى دووەمى جيهان بوو.

## دووەم: كۆمەڵەى گەلان

يەكێك لەو كارانەى كە كۆنگرەى ئاشتى پاريس كردى، دامەزراندنى دەزگايەكى نێودەوڵەتى بوو بۆ پاراستنى ئاشتى جيهانى و چارەسەركردنێكى ئاشتييانەى كێشە نێودەوڵەتييەكان، وەك بەشێك لە جێبەجێكردنى كۆنگرەى ئاشتى، ئەم كۆمەڵەيە لە ئەنجامى داواكارى هەندێك لە بيريار و رێكخراوە و سياسەتمەدارى ئەوكاتە دامەزرا، كە بانگەشەيان بۆ دامەزراندنى دەزگايەكى نێودەوڵەتى دەكرد، بۆ ئەوەى رۆڵى سەرەكى لە رێكخستنى پەيوەندييە نێودەوڵەتييەكان بە شێوازێكى ئاشتييانە و پەنانەبردن بۆ چەك بگێڕێت.

هەر چۆنێك بێت لە ٢٥ى كانوونى دووەمى ١٩١٩دا ئەنجوومەنى باڵاى هاوپەيمانان وەك بەشێك لە بڕيارەكانى ئاشتيى لەگەڵ ئەڵمانيا بڕيارى دا ليژنەيەك لە نوێنەرى ١٤ وڵات بە سەرۆكايەتى سەرۆك وڵسن بۆ دانانى گەڵاڵەنامەى كۆمەڵەى گەلان دابمەزرێت، ئەوە بوو لە ٢٨ى نيسانى ساڵى ١٩١٩، بڕيار لەسەر پرۆژەى گەڵاڵەنامەكە درا و لە ١٠ى كانوونى دووەمى ساڵى ١٩٢٠يشدا كۆمەڵەى گەلان بە فەرمى كرايەوە.

سەرەتا ٢٤ دەوڵەت لەم كۆمەڵەيەدا ئەندام بوون، بەڵام دواى سەربەخۆبوونى چەند وڵاتێك و هاتنەناوەوەيان بۆ كۆمەڵەى گەلان بەر لە جەنگى دووەمى جيهان، ژمارەى ئەنداماناى كۆمەڵەى گەلان ٦٣ دەوڵەت بوو. ئەوەى جێى سەرنجە ئەوەيە، كە هەرچەندە سەرۆكى ليژنەى گەڵاڵەنامەى كۆمەڵەى گەلان سەرۆك وڵسن بوو، بەڵام ئەمەريكا لە كۆمەڵەى گەلاندا ئەندام نەبوو، چونكە كۆنگرێسى ئەمەريكى واژووى لەسەر پەيماننامەى ئاشتى بە گشتى و كۆمەڵەى گەلانيش نەكرد.

سەبارەت بە ئامانجە سەرەکییەکانی کۆمەڵەی گەلان بەو پێیەی لە گەلاڵەنامەکەدا هاتووە، بریتی بوون لە پاراستنی ئاشتی و ئاسایيشی نێودەوڵەتی و توندوتۆڵکردنی هاریکاری لە نێو وڵاتاندا و ڕێزگرتن لە یاسا نێودەوڵەتی و پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان و دامەزراندنی پەیوەندیی دۆستانە لە نێو وڵاتەکاندا لەسەر بنەمای دادوەری و یەکسانی، جگە لەوەی کە لە گەلاڵەنامەکەدا بڕگەیەك هەبوو سەبارەت بە چۆنێتی بەڕێوەبردنی داگیرگەکانی ئەڵمانیا و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، کە بە سیستەمی ئینتیداب ناسرابوو.

## – پێکهاتەکانی کۆمەڵەی گەلان

– کۆمەڵە: ئەو کۆمەڵەیە لە نوێنەری سەرجەم ئەندمەکانی کۆمەڵەی گەلان پێك دەهات، بە مەرجێك هیچ وڵاتێك لە سێ نوێنەر زیاتری نەبێت، کە تەنها یەکێکیان مافی دەنگدانی هەبێت. ئەم کۆمەڵەیە لە مانگی ئەیلوولی هەموو ساڵێکدا کۆبوونەوە ئاساییەکانی خۆی ئەنجام دەدا، وێڕای ئەوەی دەکرا کۆبوونەوەی نائاساییش ئەنجام بدرێت.

– ئەنجوومەن: بریتی بوو لە دەزگای جێبەجێکردن لە ڕێکخراوەکەدا، کارەکانی لە کۆمەڵە فراوانتر بوو، دوو جۆر ئەندامی لە خۆدەگرت، یەکەم، ئەندامە هەمیشەییەکان، کە لە کاتی دامەزراندنی ڕێکخراوەکەدا ژمارەیان پێنج ئەندام بوون، ئەوانیش بریتانیا و فەرەنسا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ژاپۆن و ئیتالیا، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەکو پێشتر باس کرا بەشدار نەبوو، دواتریش ئەڵمانیا و یەکێتی سۆڤێت بوون بە ئەندامی هەمیشەیی.

دووەم، ئەو وڵاتانە بوون کە لەلایەن کۆمەڵەوە بۆ کاتێکی دیاریکراو هەڵدەبژێردران، ئەمانە لەکاتی دامەزراندنی ڕێکخراوەکەدا ژمارەیان چوار دەوڵەت بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٣٦دا بوون بە یانزە دەوڵەت. ئەنجوومەن دەسەڵاتی پارێزگاریکردنی ئاسایيشی نێودەوڵەتی هەبوو جا چ بەڕێگەی ئاشتی بوایە یان ڕێگەی سزای ئابووری و سەربازی بەکۆی دەنگ، بەپێی گەلاڵەنامەکەش ئەرکەکانی ئەنجوومەن بریتین بوون لە:

١. پاراستنی وڵاتانی ئەندام لە دەستدرێژی.
٢. کێشەی چەکداماڵین.
٣. ناوبژیوانیکردن لە کاتی ڕوودانی قەیرانە جیهانییەکاندا.

٤. وەرگرتنی ئەو راپۆرتانەی کە لەلایەن وڵاتە ناکۆکەکانەوە دەهاتن و تاوتوێکردنیان و ئاراستەکردنیان بۆ ئەنجوومەن.

– سکرتاریەتی بەردەوام: ئەم سکرتاریەتە لە سکرتێری گشتی و ژمارەیەکی زۆر لە فەرمانبەر پێك دەهات، کە نزیکەی ٢٠٠ کەس دەبوون، ئەرکی سکرتاریەت بریتی بوو لە رێکخستنی کارەکان و وەرگرتنی راپۆرت و داواکارییەکان و پێشکەشکردنی بە ئەنجوومەنی کۆمەڵە و کۆمەڵە. هەروەها تۆمارکردنی پەیماننامەکان و چاودێریکردنی بەڕێوەچوونی کۆمەڵەی گەلان.

بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵەی گەلان رۆڵێکی زۆر سنوورداری گێڕا، چونکە کارەکانی گوزارشتیان لە بەرژەوەندی وڵاتە سەرکەوتووەکان دەکرد و زیاتر مۆرکێکی ئەوروپیانە بە کۆمەڵەکەوە دیار بوو، بەتایبەتیش فەرەنسی و بریتانی، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، ئەم کۆمەڵەیە چەند هەنگاوێکی نا بۆ رێکخستنی کاروباری نێودەوڵەتی. لە مێژووی کارکردنیدا، کۆمەڵەی گەلان چەندین کێشەی گرنگی ئاراستە کرا، لەوانە کێشەی نێوان سوێد و فینلاند لەسەر دورگەکانی ئالاند و راپرسی سیلیزیای سەروو و کێشەی عیراق و تورکیا لەسەر ویلایەتی موسڵ و کێشەی مەنشوریا و هێرشی ئیتالیا بۆسەر حەبەشە و چەندین کێشەی تر، کە توانی هەندێکیان چارەسەر بکات و هەندێکی تریشیانی پێ چارەسەر نەکرا، کە سەرەنجام چارەسەرنەکردنی ئەم کێشانەش بوونە هۆکاری لاوازیی کۆمەڵەی گەلان و ئەم لاوازییەی کۆمەڵەش، یەکێك بوو لە هۆکارەکانی کەوتنەوەی جەنگی دووەمی جیهان.

## – رێکخراوەی کاری نێودەوڵەتی

لە بڕگەی ٢٣ی گەڵاڵەنامەی کۆمەڵەی گەلاندا هاتبوو، کە پێویستە رێکخراوەیەك هەبێت بۆ کاری نێودەوڵەتی لە پێناو رەخساندنی دۆخی مرۆیی گونجاو بۆ کرێکارانی پیاو و ژن لە سەرجەم وڵاتاندا، ئەم رێکخراوەیە لە ساڵی ١٩١٩دا وەك دەزگایەکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی کۆمەڵەی گەلاندا، دامەزرا. ئەرکی سەرەکی رێکخراوەکەش باشترکردنی رەوشی کار و مەرجەکانی و رێکخستنی کاتی کار و نەهێشتنی بێکاری و دەستەبەرکردنی ئازادی سەندیکایی بوو، لەو رێکخراوەیەدا نوێنەرانی هەر یەکە لە حکومەت و کرێکار و خاوەنکار بەشداربوون، گرنگترین دەزگاکانی رێکخراوەکەش بریتی بوون لە:

- کۆنگرەی گشتی یان کۆنگرەی کاری نێودەوڵەتی: کە باڵاترین دەزگایە و هەر دەوڵەتێك بە دوو نوێنەر بەشداری دەکات، کە یەکێکیان نوێنەری کرێکارانە و ئەویتریشیان نوێنەری خاوەنکار.
- ئەنجومەنی بەڕێوەبردن: ئەم ئەنجوومەنە چاودێریی کارەکانی سکرتاریەتی دەکرد و خشتەی کاری کۆنگرەکانی ئامادە دەکرد، کە لە ٤٠ ئەندام پێك دەهات و بیستیان نوێنەری حکومەت و کرێکاران بوون و بیستەکەی تریشیان نوێنەری خاوەن کارەکان.
- سکرتاریەتی بەردەوام: ئەم سکرتاریەتە لەلایەن بەڕێوەبەری گشتی ڕێکخراوەکە سەرۆکایەتی دەکرا و بارەگاکەی لە شاری ژنێڤی سویسرا بوو.

- **دادگای دادی نێودەوڵەتیی بەردەوام (١٩٢٢)**

ئەم دادگایە لە ئەنجامی پێشنیاری پرۆژەیەکی تایبەتەوە بۆ دامەزراندنی دادگای دادی نێودەوڵەتی هاتەکایەوە و ئەرکی گوێگرتن بوو لە سکاڵا نێودەوڵەتییەکان، ئەم دادگایە لە ١٥ دادوەر پێکدەهات، کە بۆ ماوەی ٩ ساڵ هەڵدەبژێردران و بارەگاکەیشی لە شاری لاهای بوو لە هۆڵەندا، بەڵام ئەم دادگایە ڕۆڵێکی زۆری نەگێڕا، لەبەر ئەوەی لەژێر کاریگەری و کۆنترۆڵی زلهێزەکاندا بوو.

## سێیەم: کێشەی ئاشتی و پەیمانە نێودەوڵەتییەکان لە نێوان هەردوو جەنگدا

هەر بەمەبەستی پاراستنی ئاشتیی نێودەوڵەتی و زامنکردنی پێکەوە ژیان، لە نێوان هەردوو جەنگدا کۆمەڵێك ڕێککەوتننامە لە نێو زلهێزەکاندا مۆرکرا و کۆمەڵەی گەلانیش لەم ڕووەوە هەوڵێکی زۆری دا، یەکێك لەو ڕێککەوتننامانە، پرۆتۆکۆلی ژنێفی ساڵی ١٩٢٤ بوو، ئەم پرۆتۆکۆلە وەك یەکێك لە هەوڵەکانی بریتانیا هاتەکایەوە، کە پێشنیاریان دەکرد ڕێگەچارەیەك بۆ چارەسەرکردنی ململانێ نێودەوڵەتییەکان بەڕێگەی ئاشتییەوە دابنرێت و رێ بە جارێکی تر ڕوودانەوەی جەنگ بگیرێت، ئەمیش پرۆتۆکۆلی ژنێفی لێکەوتەوە. بەپێی ئەم پرۆتۆکۆلە، دەبوو وڵاتان پابەند بەن بەوەی کێشەکانیان بخەنە ژێر دەستی دادگای دادی نێودەوڵەتییەوە، هەر کاتێکیش هەر وڵاتێك نەچووە ژێر باری بڕیارەکانی دادگاوە، یان ڕەتی

کردەوە، ئەوا بە وڵاتێکی دەستدرێژیکار لە قەڵەم دەدرێت. بریتانیا پێی وابوو بەم جۆرە دەتوانرێت سنوورێك بۆ شەڕ و دوژمنکاری دابنرێت و دەستدرێژیکار دەستنیشان بکرێت، ئەم پرۆتۆکۆلە لەلایەن کۆمەڵەی گشتی کۆمەڵەی گەلانەوە لە ساڵی ١٩٢٤دا دانی پێ دانرا، کە زیاتر مەبەستی پاراستنی ئەو ڕەوشە بوو، کە ئەوکات لە ئارادا بوو.

یەکێکی تر لەو ڕێککەوتننامانە، ڕێککەوتننامەی لۆکارنۆ بوو، کە لە ساڵی ١٩٢٥دا لە شاری لۆکارنۆی سویسرا بەسترا، دوای کۆبوونەوەی هەریەکە لە ئەڵمانیا و فەرەنسا، بەلجیکا، بریتانیا، ئیتالیا، پۆلەندا، چیکۆسلۆڤاکیا، ئەو ڕێککەوتنەش لە نێوان ئەڵمانیا لەلایەك و فەرەنسا و بەلجیکا و چیکۆسلۆڤاکیا لەلایەکی ترەوە مۆرکرا، کە زیاتر دەربارەی کێشەی سنووری نێوان فەرەنسا و ئەڵمانیا بوو، چونکە فەرەنسا بە بەردەوامی لە بەهێزبوونەوەی ئەڵمانیا دەترسا، بەتایبەتیش، دوای ئەوەی کە ئەڵمانیا پەیماننامەی دۆستانەی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتیدا بەست لە ساڵی ١٩٢٢دا، کە بەپێی ئەم پەیماننامەیە ئەڵمانیا بوو بە یەکەم وڵاتی ئەورووپای ڕۆژئاوا کە دان بە دەوڵەتی سۆڤێتیدا بنێت و پەیوەندیی بازرگانی لەگەڵدا دابمەزرێنێت. هۆکاری سەرەکی ئەم کۆنگرەیەش ئەوە بوو، کە ئەڵمانیا توانای دانەوەی قەرزەکانی فەرەنسای نەبوو، بۆیە لە ساڵی ١٩٢٣دا، فەرەنسا هێرشی کردە سەر شاری رۆهەری ئەڵمانی و داگیری کرد، بەم جۆرەش بارودۆخی ئەڵمانیا بە تەواوەتی تێك چوو، بۆیە لە ساڵی ١٩٢٤دا سەرۆك وەزیرانی ئەڵمانیا، کە ئەوکات (شتریسمان) بوو، پێشنیاری ئەوەی کرد، کە پەیماننامەیەکی گەرەنتی و دڵنیایی و دەستدرێژینەکردن لە نێوان وڵاتاندا ببەسترێت، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٢٥دا، پەیماننامەی لۆکارنۆ بەسترا و لە بڕگەی ١ی پەیماننامەکەشدا هاتبوو، کە هەریەك لە ئەڵمانیا و فەرەنسا و بەلجیکا، لە شێوەی تاك و کۆ، بەڵێن بدەن ڕێز لە سنووری نێوان ئەڵمانیا بەلجیکا و ئەڵمانیا فەرەنسا بگرن و هێرش نەکەنە سەر ناوچەی لەچەك داماڵڕاوی راین، هەریەکە لە ئەڵمانیا و فەرەنسا هانا بۆ چەك نەبەن، تەنها لەکاتی بەرگریکردندا نەبێت. دوای ئەوەش چەند پەیماننامەیەکی تر لە نێوان ئەڵمانیا و هەریەك لە فەرەنسا و بەلجیکا و پۆلەندا و چیکۆسلۆڤاکیا بەجیاجیا بەسترا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان بە شێوەیەکی ئاشتیانە.

یەکێکی تر لەو هەوڵانە، گەڵاڵەنامەی پاریسی ساڵی ١٩٢٨ بوو، ئەم گەڵاڵەنامەیە لەوێوە سەرچاوەی گرت، کە وەزیری دەرەوەی فەرەنسا لە ساڵی ١٩٢٧دا پێشنیاری بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا کرد، کە چیدی هانا بۆ چەك نەبرێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، ئەم

پێشنیازەش بە بۆنەی تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر بەشداربوونی ئەمەریکا لە جەنگی یەکەمی جیهانیەوە بوو، کە پەرچەکردارێکی گەورەی لە ناوەندی سیاسیی ئەمەریکی و کۆشکی سپی بوو، بۆیە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا پێشنیاری ئەوەی کرد ئەم کارە بانگهێشتێکی نێودەوڵەتی بۆ بکرێت نەك بە شێوەیەکی دوو قۆڵی بێت، ئەوە بوو کۆبوونەوەیەکی نێودەوڵەتی لە پاریس ئەنجام درا و نزیکەی پازدە وڵات واژوویان لەسەر گەڵاڵەنامەکە کرد، کە دواتر ژمارەیان زیاتریش بوو، لە ساڵی ١٩٢٩شدا، گەڵاڵەنامەکە بەگەڕخرا و تیایدا جەنگ قەدەغەکرا، تەنها لەم کاتانەدا نەبێت:

١. بەرگری لەخۆکردن.

٢. لەکاتی سەرپێچیکردنی بەندەکانی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان لەلایەن دەوڵەتێکەوە.

٣. کاتێك کە بریتانیا دەیەوێت بەرگری لە داگیرگەکانی بکات یان کاتی جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەی کە بەسەر وڵاتاندا سەپێنراوە وەك ئەندامێکی کۆمەڵەی گەلان.

ئەگەرچی سۆڤێت لە سەردەمی بەستنی کۆنگرەکەدا ئیدانەی ئەم گەڵاڵەنامەیەی کرد، بەڵام دواتر لە ساڵی ١٩٢٩دا گەڵاڵەنامەکەی مۆرکرد، دواتریش هەریەك لە پۆڵەندا و لیتوانیا و لاتیڤیا و ئیستوانیا و رۆمانیا هاتنە نێو رێککەوتنەکەوە.

هەرچەندە لە نێوان هەردوو جەنگدا، هەوڵە نێودەوڵەتییەکان و هەوڵەکانی کۆمەڵەی گەلان تا دەهات بە مەبەستی چارەسەرکردنی ئاشتییانەی کێشەکان چڕتر دەبوون، بەڵام دۆخەکە و بەرژەوەندییە جیاجیاکان و قەیرانەکان لەم هەولانە گەورەتر بوون و رۆژ بە رۆژ قوڵتر دەبوون و جیهانیان بەرەو ناجێگیری دەبرد.

## چوارەم: کێشەی چەکداماڵین

یەکێك لە خواستە سەرەکییەکانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی کە لە سەردەمی جەنگ و دوای جەنگیش بانگەشەیان بۆ دەکرد، یاسایەك بوو بۆ داماڵینی چەك، کە سەرۆك ولْسنیش لە ١٤ بەندەکەیدا جەختی لەسەر کردبۆوە، هەروەها بڕگەی ١٨ی گەڵاڵەنامەی کۆمەڵەی گەلانیش، چەکداماڵینی کردبوو بە مەرجێکی بنەڕەتی بەئەندامبوونی وڵاتەکان، لە کۆنگرەی ڤێرسایشدا چەکداماڵینی ئەڵمانیا وەك هەنگاوی یەکەمی چەکداماڵینی جیهان هەژمارکرا، سەرەڕای ئەمانەش، هەر بۆ ئەم مەبەستە، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیەوە چەند کۆنگرەیەکی تری

نێودەوڵەتی بەستران، بە تایبەت لە بارەی چەکی دەریاییەوە، چونکە دوای جەنگی یەکەمی جیهان، کێبەرکێیەکی توند لەم بارەیەوە لە نێو زلهێزاندا هاتەئارا، تایبەت بریتانیا و ئەمەریکا و ژاپۆن، هەر بۆیە ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٢١دا هەریەکە لە بریتانیا و فەرەنسا و ژاپۆن و ئیتالیای بانگهێشتی واشینگتۆن کرد و کۆنگرەیەکیان لە بارەی سنووردارکردنی ئەم دیاردەیەوە گرێ دا، کە دواتر بەلجیکا و هۆڵەندا و پرتوگالیش بانگهێشتکران.

کۆنگرەکە لە شوباتی ١٩٢٢دا بەسترا و تیایدا بڕیار درا تا ماوەی ١٠ ساڵ کەشتی دەریایی دروست نەکرێت و ٤٠٪ی بورجە دەریاییەکانی زلهێزەکان کەمبکرێتەوە، بەکارهێنانی گازی ژەهراویش لەلایەن هەر یەکێك لە وڵاتانی بەشداربوو قەدەغە بکرێت و دروستکردنی ژێردەریاییش سنووردار بکرێت، بەڵام بەهۆی ناکۆکی هەندێك لە بەشداربووان لەسەر کێشەی دروستکردنی ژێردەریایی و کەمکردنەوەی ئامێرە جەنگییە دەریاییەکان، ئەم کۆنگرەیە ئاکامێکی وەهای لێنەکەوتەوە و بەپێچەوانەوە، دوای کۆنگرەکە بێ متمانەیی لە نێوانیان زیاتربوو و کێبەرکێکە فراوانتر بوو، هەر بۆیە سەرۆکی ئەمەریکا دوای ماوەیەکی تر داوای کرد کە کۆنگرەیەکی تر لە ژنێف ببەسترێت، بەڵام ئەم کۆنگرەیەش بەهۆی کێشە و ناکۆکییەکانی نێو وڵاتە زلهێزەکان ئاکامێکی ئەوتۆی نەبوو.

دوای ئەو کۆنگرانەش لە ساڵی ١٩٣٠یشدا جارێکی تر کۆنگرەیەکی بێ ئاکامی تر بۆ هەمان مەبەست لە لەندەن بەسترا، بەڵام ئەویش زیاتر قوڵبوونەوەی کێشەکان و زیادبوونی کێبەرکێکانی لێکەوتەوە، بەم جۆرەش ئەم کۆنگرانە نەیانتوانی هیچ ئاکامێکی ئەوتۆ لە بارەی چەکدامالینی دەریاییەوە بەدەست بهێنن، تەنها ئەوەندە نەبێت تا رادەیەك رۆڵیان لە کەمکردنەوەی کەشتییە دەریاییە زۆر گەورەکان هەبوو.

لەبارەی چەکە وشکانییەکانیشەوە، بەپێی بڕگەی ٨ی کۆمەڵەی گەلان، لیژنەیەکی راوێژکاری بەردەوام بۆ ئەم مەبەستە دامەزرا، کە لە ساڵی ١٩٢١ بەدواوە ئەم لیژنەیە دەستی بە لێکۆڵینەوەکانی لەبارەی کێبەرکێی چەك لەنێو وڵاتاندا کرد، دوای گەلاڵەنامەی لۆکارنۆش، ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لە کانوونی ١٩٢٥دا دەزگایەکی تایبەتی بە مەبەستی دەستنیشانکردنی چەك و جۆرەکانی چەك و رێگاکانی بەکارهێنانی دامەزراند، کە لە نوێنەری ٣٢ وڵات پێك هاتبوو، ئەم دەزگایە لە مایسی ساڵی ١٩٢٦ەوە دەستی بە کۆبوونەوەکانی کرد، کە بۆ جاری یەکەم بوو لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە، شاندی ئەڵمانیش بەشدار بوو، لەوێدا ئامادەبووانی کۆنگرەکە ئەو

پەیمانەی ڤێرسایان وەبیرهێنایەوە کە سنووردارکردنی چەك، هەموو وڵاتەکان دەگرێتەوە و داوای ئەوەیان کرد کە نابەرابەری لە چەکسازیدا لەنێو ئەندامانی کۆمەڵەی گەلاندا نەمێنێت، کۆنگرەکە جارێکی تر لە ساڵی ١٩٣٢دا، بە بەشداربوونی ٦٠ وڵات، کە ئەمەریکا و ئەڵمانیا و سۆڤێتیشی تێدا بوو، لە ژنێف بەسترایەوە، هەر لە سەرەتای کۆبوونەوەکەوە کێشە و ململانێ کەوتە نێو ئەندامانی کۆنگرەکەوە و لەدوا ئەنجامیشدا سەرۆکی ئەمەریکا پێشنیاری ئەوەی کرد دوو جۆر هێز هەبێت، یەکەمیان پۆلیس بۆ پاراستنی ئاساییشی ناوخۆ و دووەمیش سەربازی بۆ بەرگری دەرەکی، بەمەرجێك سوپای دەرەکی بەڕێژەی ١/٣ کەم بکرێتەوە، بەڵام مشتومڕ و ناکۆکییەکی لەنێو ئەندامانی کۆنگرەدا لەبارەی رازیبوون و رازینەبوون بەم پێشنیارە هاتەئاراوە، بۆیە ئەڵمانیا هەر لەوێدا رایگەیاند کە جارێکی تر بەشداری ئەم کۆنگرەیە نابێتەوە.

لە ساڵی ١٩٣٣دا کۆنگرەکە جارێکی تر بەسترایەوە و ئەڵمانیا سەرەڕای ئەوەی حوکمی هیتلەریش دەستی پێکردبوو، هەر ویستی بەشداربوونی لە کۆنگرەکەدا هەبوو، بەڵام بەهۆی ناکۆکییەکانەوە کۆنگرەکە چەند مانگێك دواخرا و بەر لە بەستنی کۆنگرەکەش بە دوو رۆژ، ئەڵمانیا کشانەوەی خۆی راگەیاند. لە ساڵی ١٩٣٤شدا جارێکی تر ئەو کۆنگرەیە بەسترایەوە، بەڵام ئەو جارەش سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێنا. بەم جۆرە تەواوی ئەو کۆنگرانە و هەوڵەکانی دوای جەنگ لە پێناو چەکدامالین و کەمکردنەوەی کێبەڕکێی چەکسازی، شکستیان هێنا و دەستکەوتێکی وایان بەدەستەوە نەدا.

# بەشی سێیەم

## زلهێزەکان لە نێوان هەردوو جەنگدا

### یەکەم: بریتانیا

بریتانیا یەکێك بوو لە وڵاتە سەرکەوتووەکانی جەنگی یەکەمی جیهان، کە زیانە گیانی و ماددییەکانی لە چاو وڵاتە شەڕکەرەکانی تردا کەمتر بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەدوای جەنگەوە کۆمەڵێك کێشەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی بۆ دروست بوو، چونکە لەکاتی جەنگدا حکومەتی بریتانیا بەپێی پێداویستییەکانی جەنگ وڵاتی بەڕێوە دەبرد، بۆیە دوای جەنگ، دەبوو چەند گۆڕانکارییەك ئەنجام بدات، ئەوە بوو هەر لە کۆتایی ساڵی ١٩١٨دا حکومەتی بریتانی چەند چاکسازییەکی لە بواری پەروەردە و فێرکردن و هەڵبژاردنی پەرلەمانیدا ئەنجامدا، لەوانە هەوڵی دا ئاستی خوێندن و خوێندەواری و رۆشنبیری لە وڵات بەرز بکاتەوە بەرێگەی هاندانی خوێندنەوە، هەروەها مافی هەڵبژاردن بۆ هەموو بریتانییەك فەراهەم بکات، کە لە تەمەنی ٢١ ساڵی بەسەرەوە بێت بۆ (نێر) و بۆ (مێ)ش لە ٣٠ ساڵی بەسەرەوە.

لە هەڵبژاردنی دوای جەنگدا (لوید جۆرج) سەرکەوتنی بەدەست هێنا و حکومەتێکی ئیئتلافی دامەزراند، کە چەند کەسایەتییەکی دیاری سەردەمی جەنگ لە کابینەکەیدا بەشدار بوون، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم حکومەتە راستەوخۆ لەدوای جەنگ هاتە سەرکار، رووبەڕووی چەند کێشەیەك بووەوە، یەکێك لەو کێشانەش دەرکەوتنەوەی پارتی کرێکاری یەکگرتوو بوو بەدەستوورێکی نوێوە، ئەو پارتەی کە بەهۆی جەنگەوە لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهاندا دوو لەت بووبوو، بەڵام لە دوای جەنگەوە نزیکبوونەوە لەنێوان پارچەکانیدا دروست بۆوە و پارتێکی یەکگرتوویان دامەزراند و بە بەرنامەیەکی نوێوە هاتنەوە مەیدان و بەرهەڵستکاری حکومەتە نوێیەکەیان دەکرد.

یەکێکی تر لە کێشەکانی ئەو حکومەتە کاریگەری شۆڕشی ئۆکتۆبەری رووسیا بوو، کە بووە هۆکاری دەرکەوتنی پارتی کۆمونیستی لە بریتانیا و یەکێك لە بەرهەڵستکارەکانی حکومەتی نوێ. کێشەیەکی تری ئەم حکومەتە زۆربوونی بێکاری بوو، تایبەت دوای ئەوەی کە بەکۆتاییهاتنی جەنگ، نزیکەی ٤ ملیۆن کەس لە ئەرکی سەربازی دەرکرابوون و وەکو بێکار کەوتبوونە بازاڕەکانەوە، سەرباری ئەم کێشانەش، لەلایەکی تریشەوە لابردنی کۆنترۆڵی دەوڵەت بەسەر بازاڕەوە وایکردبوو کە رۆژ بە رۆژ نرخ لەبەرزبوونەوەدا بێت، ئەمەش بارودۆخی کرێکارانی بەرەو خراپی برد و لێرەشەوە جوڵەی سەندیکا کرێکارییەکان زیاتری کردبوو و مانگرتنە کرێکارییەکان لە هەڵکشاندا بوون. کێشەی بیناکردنەوە و خانووبەرەش کێشەیەکی تری ئەو سەردەمە بوو، چونکە بەهۆی جەنگی یەکەمی جیهانەوە، بەشێکی زۆر لەخانووبەرە و کارگەکان داڕمابوون، بۆیە یەکێك لە بڕیارە گرنگەکانی (لوید جۆرج) بڕیاری بیمەی کۆمەڵایەتی بوو، کە لەساڵی ١٩٢٠دا دەری کرد، کە نزیکەی ١٢ ملیۆن لە بێکار و نەخۆش و پەککەوتە لێی سوودمەند بوون، هەروەها بڕیاری خانووبەرە و بیناکردنەوە و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان کە ئەم بڕیارانە کاریگەرییەکی گەورەیان هەبوو بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی بریتانی بە تەواوەتی هەرەس نەهێنێت.

سەبارەت بە سیاسەتی دەرەکیش (لوید جۆرج) زۆر جەختی لەسەر بووژاندنەوەی ئابووری سەرتاسەری ئەوروپا و چارەسەرکردنی کێشەی بێکاری دەکرد، چونکە پێیوابوو بووژانەوەی ئەوروپا لە قازانجی بریتانیا دەبێت، هەر لەو سۆنگەیەشەوە زۆر دژایەتیی فەرەنسای دەکرد لەبارەی کێشەی قەرەبووی ئەڵمانیاوە، جگە لەوەی هەر لە پێناو بەرژەوەندییە ئابوورییەکاندا، لوید جۆرج دەیەویست لەگەڵ سۆڤێتدا پێك بێت و پەیوەندی بازرگانی لەگەڵدا دروست بکات.

کێشەکانی (لوید جۆرج) تا دەهات زیاتر دەبوون، یەکێکی تر لە کێشەکانی، کێشەی ئیرلەندییەکان بوو، چونکە لوید جۆرج بەر لەوەی بچێتە کۆنگرەی جەنەوا لەساڵی ١٩٢٢دا، پەیمانی بە ئیرلەندییەکان دابوو کە حکومەتێکی ئۆتۆنۆمی بدات بە ئیرلەندەی باشوور و مافی سەرپشککردنیش بدات بە ئیرلەندەی باکوور کە ئایا لەگەڵ بریتانیا دەمێنێـەوە یان دەچێتە پاڵ ئیرلەندەی باشوور، بەڵام کاتێك لە کۆنگرەکەدا بوو، جەنگی نێوان ئیرلەندا و بریتانیا دەستی پێکردەوە، ئەمەش دۆخێکی خراپی بەسەر (لوید جۆرج)دا هێنا، لە کۆنگرەکەش شکستی خوارد، کە بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەوروپا و گێڕانەوەی پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێوان ئەوروپا بوو، کە لەکاتی جەنگدا پچڕا بوو.

هەروەها وەکو باس کرا (لوید جۆرج) ویستی خۆ نزیککردنەوەی هەبوو لە سۆڤێت، بەڵام لەبەر ئەوەی فەرەنسا بەمە رازینەبوو، ئەم هەوڵەی سەری نەگرت، تایبەت کە سۆڤێتیش لەو کاتەدا بەپێی پەیمانی رابالۆ لەگەڵ ئەڵمانیادا رێککەوتبوو، ئەمانە هەمووی هاوکات بوون لەگەڵ شپرزەبوونی بریتانیا لە ناوچەکانی یۆنان و ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا و سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکەکانی مستەفا کەمال ئەتاتورك بەسەر یۆنانییەکاندا، سەرەنجامیش ئەو بارودۆخە وایکرد بەشێك لە پارێزگارەکانی بریتانیا (لوید جۆرج) بە ترسێك بزانن بۆسەر یەکڕیزیی پارێزگارەکان و بەشێکی زۆریشیان بڕیاری کشانەوە بدەن لە حکومەتە ئیئتلافییەکەی لوید جۆرج، بۆیە (لوید جۆرج) ناچار بوو دەست لەکاربکێشێتەوە.

دوای ئەوەی (لوید جۆرج) دەستی لەکار کێشایەوە، جارێکی تر هەڵبژاردن ئەنجام درایەوە، کە تیایدا پارێزگارەکان ٣٤٧ کورسیان بەدەستهێنا و پارتی کرێکارانیش ١٤٢ کورسی و لیبرالەکانیش ١١٧ کورسی، دوای هەڵبژاردنەکە، سەرۆکی پارتی پارێزگاران کابینەیەکی دامەزراند، بەڵام نالەباری لەڕووی تەندروستییەوە، وایکرد دەست لەکار بکێشێتەوە، لە شوێنی ئەودا، (ستانلی بالدۆین) ببێت بە سەرۆکی وەزیران. ئەوەی لەم هەڵبژاردنەدا بەدی دەکرێ ئەوەیە پارتی کرێکاران کە لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە دامەزرابوو، توانی شوێنی پارتی لیبرالەکان بگرێتەوە و ببێت بە دووەم پارتی گەورەی وڵات، لیبرالەکانیش بەهۆی پەرتەوازییەوە پاشەکشێ بکەن. پارتی کرێکاران کە وەك پێشتر باس کرا لەکاتی جەنگدا پەرتەوازە بووبوو، بەڵام دوای جەنگ جارێکی تر خۆی کۆکردەوە و پارچە جیاجیاکانی یەکیان گرتەوە و بە بەرنامەیەکی نوێوە هاتنە گۆڕێ و بەتایبەتیش دوای ئەوەی رایان گەیاند، کە ئەوان دەیانەوێت سۆسیالیزم بەرێی دیموکراتی و پەرلەمانەوە جێبەجێ بکەن، لەلایەن چینی ناوەڕاستەوە پشتگیرییەکی زۆری لێکرا، بۆیە لە هەڵبژاردنەکەی کۆتایی ساڵی ١٩٢٣دا، پارتی پارێزگاران پاشەکشەیەکی زۆری کرد و ٢٨٥ کورسی بەدەست هێنا و لیبرالەکانیش ١٥٨ کورسی، بەڵام پارتی کرێکاران ١٩١ کورسی بەدەست هێنا، هەرچەندە پارێزگارەکان زۆرینەبوون، بەڵام بواریان بە پارتی کرێکاران دا حکومەت دابمەزرێنن، ئەوە بوو لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٤دا، کابینەی کرێکاران بە سەرۆکایەتی (رەمزی مەکدۆنالد) دامەزرا.

## – سەردەمی پارتی کرێکاران

مەکدۆنالد کە هاتە سەر حوکم، لەبەر ئەوەی دۆخەکە لەبار نەبوو، سیاسەتی سۆسیالیستی جێبەجێ نەکرد، بەڵکو هەندێك چاکسازیی سەرەتایی ئەنجام دا، لەوانە دروستکردنی بینای نیشتەجێبوون و ریفۆرم لە سیستەمی پەروەردە و خوێندن و بەڕێوەبردنی حکومەت لەسەر رێبازی بازرگانە ئازادەکان.

لەڕووی سیاسەتی دەرەوەش، مەکدۆنالد باوەڕێکی زۆری بە کۆمەڵەی گەلان هەبوو بۆ چارەسەری کێشە نێودەوڵەتییەکان، هەروەها هەوڵی دەدا پەیوەندی نێوان ئەڵمانیا و فەرەنسا بەپێی ویستی بریتانیا بێت و قەرز و قەرەبووەکانی سەر ئەڵمانیا کەم بێت، یەکێکی تر لە هەنگاوەکانی مەکدۆنالد ئەوە بوو، کە لەژێر کاریگەری چەند ئەندامێکی ناو پارتی کرێکان دانی بە یەکێتی سۆڤێت دانا و پەیوەندییە دیپلۆماسی و بازرگانییەکانی لەگەڵدا کردەوە، کە ئەمەش پارێزگارەکانی تەواو پەست و نیگەران کرد و قەیرانێکی سیاسیی لە ناوەوەی وڵات خستەوە، بەرادەیەك وای لە مەکدۆنالد کرد داوای هەڵبژاردنی پێشوەخت بکات، ئەوە بوو کە هەڵبژاردنیش کرا، پارێزگارەکان توانیان زۆرینە بەدەست بهێنن، لیبرالەکانیش لەم هەڵبژاردنەدا بە تەواوی رۆڵیان نەما و تەنها ٤٢ کورسیان بەدەستهێنا، لە ٤ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٤یشدا، مەکدۆنالد دەستی لەکار کێشایەوە و جارێکی تر کابینەی پارێزگارەکان دامەزرایەوە.

## – سەردەمی پارێزگارەکان

(ستانلی بالدۆوین) جارێکی تر کابینەیەکی نوێی پارێزگارانی دامەزراندەوە و یەکەم کاری ئەم کابینەیەش بریتی بوو لە پووچەڵکردنەوەی ئەو پەیماننامانەی کە کابینەی پارتی کرێکاران لەگەڵ سۆڤێتدا ئەنجامیان دابوو و پچڕاندنی پەیوەندییە دیپلۆماسییەکانیان. هەروەها لە سەردەمی ئەم کابینەیەدا بوو، کە گەڵاڵەنامەلای لۆکارنۆ بەسترا، هەر لەو سەردەمەشدا ئەڵمانیا لە کۆمەڵەی گەلاندا قبوڵ کرا، کە ئەمانە هەنگاوی گرنگ بوون بەرەو ئاشتی ئەوروپا. لەڕووی ناوخۆییشەوە، ئەم کابینەیە کۆمەڵێك چاکسازیی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەنجام دا، لەوانە یاساکانی پەککەوتە و هەتیو و بێوەژن و گۆڕینی مافی دەنگدانی

ژنان، بەڵام هەرچەندە ئەم هەنگاوانەی چەند سەرکەوتنێکیان بەدەست هێنا، کەچی ئەم کابینەیە بەهۆی کێشەکانی ناو پارتەکەوە، تا دەهات بەرەو لاوازی دەچوو، بۆیە لە هەڵبژاردنی ٣٠ی مایسی ساڵی ١٩٢٩دا، پاشەکشەیان کرد و پارتی کرێکاران بە زۆرینەیەکی زۆر کەم، توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن و جارێکی تر بە یارمەتی لیبرالەکان، حکومەتێك بە سەرۆکایەتی مەکدۆنالد پێك بهێننەوە.

## – دامەزراندنەوەی حکومەت لەلایەن پارتی کرێکارانەوە

دامەزراندنی ئەم کابینەیە لەکاتێکدا بوو، کە قەیرانی ئابووری لە جیهاندا لە پەرەسەندندا بوو و دوای ماوەیەکی کەمیش، کاریگەرییەکانی ئەم قەیرانە بریتانیاشی گرتەوە و رێژەی بێکاری لە بریتانیا رۆژ بە رۆژ روو لە زیادبوون بوو و تا وایلێهات لە یەك ملیۆن و نیوەوە بگاتە سێ ملیۆن بێکار، ئەمەش وا لە حکومەت بکات، ناچار بێت پارەیەکی زۆر بۆ دامودەزگا بیمەییەکان تەرخان بکات، هەر لەو کاتەشدا بوو کە زێڕی وڵات وردە وردە بۆ دەرەوە دەچوو و داهاتی باجیش تا دەهات کەم دەبۆوە، کە ئەمانە بە تەواوی حکومەتیان شەکەت کردبوو و مەکدۆنالدیان ناچارکرد ئامۆژگارییەکانی لیژنەی پسپۆری دارایی لەگوێ بگرێت و پلانی پیادەکردنی سیاسەتێکی ئابوورییانەی توندوتیژ بگرێتەبەر و بیمە بێکارییەکان کەم بکاتەوە، ئەمەش کاریگەری زۆری بوو لە هاتنەخوارەوەی پێگەی پارتی کرێکاران لەناو کۆمەڵدا. هاوکات هەندێك لە وەزیرەکانی سەر بە پارتی کرێکارانیش بەمە نارازیبوون، ئەمانەش بوونە مایەی کێشەیەکی گەورە بۆ حکومەتەکەی مەکدۆنالد و رووبەڕووی قەیرانی وەزاری بووەوە، بۆیە ناچار بوو کابینەیەکی ئیئتلافی نوێ دابمەزرێنێت بەناوی (یەکێتی نیشتمانی)، ئەوەبوو لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٣١دا، ئەم ئیئتلافە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا و جارێکی تر مەکدۆنالد کابینەی نوێی یەکێتی نیشتمانی دامەزراندەوە.

## – سەردەمی کابینەی یەکێتی نیشتمانی

ئەرکی سەرەکیی ئەم کابینەیە یەکخستنەوەی هێزە نیشتمانییەکان و یەکێتی ریزەکان بوو لەپێناو رووبەڕووبوونەوەی کێشە ئابوورییەکاندا، یەکێك لەو رێگایانەی کە ئەم حکومەتە ویستی لە ڕێگەیەوە رووبەڕووی کێشە ئابوورییەکان ببێتەوە، کەمکردنەوەی خەرجییەکانی

حکومەت و کەمکردنەوەی جونەی ئیستەرلینی و سنووردارکردنی ئازادییە بازرگانییەکان بوو. هەروەها دەرکردنی سیستەمی ئەولەویەتی ئیمپراتۆرییەت کە ئەولەویەت درا بە بەرهەمە پیشەسازییەکانی بریتانیا، لە (دۆمۆنیۆنەکان)* ی بریتانیا ئەولەویەت درا بە بەرهەمە پیشەسازییەکانی بریتانیا. لە ناو بریتانیاش ئەولەویەت درا بە بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی دۆمۆنیۆنەکان، هەرچەندە ئەم سیاسەتە ئابوورییەی کە ئەم حکومەتە پیادەی کرد، هەندێك لە بارقورسی قەیرانی ئابووری کەم کردەوە، بەڵام نەیتوانی کۆتایی بە کێشەکان بهێنێت و بێکاری بنەبڕ بکات.

لە ساڵی ١٩٣٥دا، کۆتایی بە حکومەتەکەی (مەکدۆنالد) هات و (ستانلی بالدۆوین) شوێنی گرتەوە، لە سەردەمی ئەمدا، ئەو کێشە دەستوورییە لە بریتانیا رووی دا، کە لەسەر ژن و ژنخوازی پاشای وڵات بوو، ئەوە بوو (ئێدواردی هەشتەم) کە لەدوای مردنی باوکی بوو بە پاشای وڵات، کەوتبووە داوای خۆشەویستی بێوەژنێکی ئەمەریکییەوە و دەیەویست هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکات، بەڵام لە بەر ئەوەی ئەمە بەپێی دەستووری وڵات رێپێنەدراو بوو، بۆیە کێشەیەکی سیاسیی خستەوە، چونکە بالدۆوین بەم هاوسەرگیرییە رازینەبوو، بۆیە (ئێدواردی هەشتەم) ناچاربوو تەختی پاشایەتی بۆ (جۆرجی شەشەم)ی برای جێبهێڵێت، ئەمەش کاریگەریی باشی بوو لەسەر پێگە و هەیبەتی بالدۆوین، بەڵام لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٧ەوە (بالدۆوین) دەستی لە سەرۆکایەتی وەزیران و ژیانی سیاسیی بە گشتی هەڵگرت و لە شوێنی ئەودا، (نیڤل چەمبەرلن) بوو بە سەرۆکی وەزیران و سەرۆکی پارتی پارێزگاران، کە تا کەوتنەوەی جەنگی یەکەمی جیهان، سەرۆکی وەزیرانی بریتانیا بوو و رۆڵی هەبوو لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان.

لە پاڵ هەموو ئەو کێشە نێوخۆییانەی کە باس کران، بریتانیا کۆمەڵێك کێشەی تری هەبوو، کە کێشەی ناوچە داگیرکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی بوو، چونکە بریتانیا ئیمپراتۆریەتێك بوو چەندین دۆمۆنیۆن و ناوچەی ئینتیداب و داگیرگەی هەبوو، کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیەوە لەم ناوچانەدا چەندین کێشە رووبەڕووی بریتانیا بوونەوە، لەوانە کێشەکانی میسر و عیراق و فەلەستین لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢٢، هەروەها لە هندستانیش دەرکەوتنی

---

* گەلانی ناوچەکانی چوارچێوەی ئیمپراتۆریای بریتانیا کە لەڕووی سەربەخۆییەوە لە وڵاتانی ژێر ئینتیداب پێشکەوتووتر بوون.

کێشەی گاندیزم، ئەمە جگە لەوەی لە دۆمۆنیۆنەکانیش کە لەڕووی سیاسییەوە دۆخیان لە ناوچە ئینتیدابییەکان باشتر بوو، لەدوای جەنگەوە هەستی نەتەوایەتییان بووژایەوە و هەوڵەکانیان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی تەواو بەردەوام بوو، یەکێکی تر لە گرفتەکانی بریتانیا، کێشەی ناوچەی ئیرلەندا بوو، کە ئیرلەندییەکان لە بزووتنەوە و جوڵەی بەردەوام دا بوون لە پێناو سەربەخۆییدا، هەموو ئەم کێشانەی باس کران وایان کردبوو کە لە نێوان هەردوو جەنگدا، دۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی لە بریتانیا تا رادەیەکی زۆر لە ناجێگیریدا بێت و تەنانەت سیستەمی دیموکراسیش بکەوێتە قەیرانەوە.

## دووەم: فەرەنسا

فەرەنساش یەکێك بوو لەو وڵاتانەی کە سەرکەوتووانە لە جەنگی یەکەمی جیهان هاتەدەرەوە و هەردوو ناوچەی دەوڵەمەندی ئەلزاس و لۆرینی بەدەست هێنایەوە، بەڵام یەکێك بوو لەو وڵاتانەی کە زۆرترین زەرەر و زیانی ماددی و مرۆیی لە جەنگەکەدا بەرکەوت و جگە لەوەی لەدوای جەنگیشدا، سەرەڕای ئەو هەموو بێهێزکردن و لاوازکردنەی ئەڵمانیا، فەرەنسییەکان هەر ترسیان لە ئەڵمانیا مابوو، هاوکات کێشەیەکی تری فەرەنسا لەدوای جەنگ، دژایەتیکردنی بەلشەفییەکان بوو، لەبەر ئەوەی بەلشەفییەکان، کە هاتنە سەر حوکم، تەواوی هاوپەیمانێتییەکانیان لەگەڵ وڵاتە ئەوروپییەکاندا پووچەڵ کردبۆوە، لەلایەکی تریشەوە فەرەنسا لە دزەکردنی کۆمونیزم بۆ ناو فەرەنسا دەترسا، جگە لەوەی کە حکومەتی سۆڤێت سەرجەم ئەو قەرزانەی پووچەڵ کردبۆوە کە لەسەر رووسیا بوو، کە بەشی زۆریان قەرزی فەرەنسییەکان بوون، ئەمانەش وایکردبوو کە دژایەتیکردنی رووسیای کۆمونیستی، یەکێك بێت لە خاڵە بنەڕەتییەکانی سیاسەتی فەرەنسای دوای جەنگ.

لەدوای ساڵی ١٩١٦ەوە و لە سەرەتای بیستەکانیشدا، حکومەتەکانی فەرەنسا زیاتر لە ئیئتلافی پارتە راستڕەو و پارێزگارەکان پێك دەهات، ئەو پارتانەی کە لەلایەن بازرگان و هەندێك توێژی کشتوکاڵییەوە پشتگیری دەکرا، ئەم پارتانە زیاتر مەیلیان لە جێگیری باری ئابووری و هێورکردنەوەی دۆخی ناوخۆ و پشتگیری سوپا بوو، ئەم ئیئتلافە لە ساڵی ١٩١٩ەوە بەناوی حکومەتی کوتلەی نیشتمانییەوە سەرکەوت، کە لە نێوان ١٩١٩-١٩٢٤ حوکمی کرد، لە ماوەی حوکمیدا ئەم ئیئتلافە پشتیوانییەکی زۆری کۆنگرەی ڤێرسای دەکرد و

داوای دەکرد سزای توند بەسەر ئەڵمانیادا بسەپێنرێت، هاوکات لەڕووی سیاسەتی دەرەکیشەوە، سیاسەتێکی دژە سۆسیالیستانەی پەیڕەو دەکرد و پەیوەندییە دیپلۆماسییەکانیشی لەگەڵ ڤاتیکاندا باشتر کرد، هەر لە سەردەمی ئەم کابینەیەشدا بوو، کە لەساڵی ١٩٢٣دا فەرەنسا شاری رۆهەری ئەڵمانیای داگیرکرد.

لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٢٤دا، سۆسیالیستە رادیکالەکان توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن و بە پشتیوانی پارتی سۆسیالیستی فەرەنسا حکومەتێك بە سەرۆکایەتی (هریۆ) دامەزرێنن، کە ئەم حکومەتە لە ساڵی ١٩٢٤ەوە تا ساڵی ١٩٢٦ درێژەی کێشا، ئەم پارتە ئەگەرچی ناوی سۆسیالیستی بوو، بەڵام یەکێك بوو لەو پارتانەی کە سەرسەختانە بەرگریی لە کەرتی تایبەتی ئابووری و موڵکایەتی تایبەت و ئازادیی تاك دەکرد و زۆر دژی دەسەڵاتی کڵێسا بوو، بەپێی پرەنسیپەکانی ئەو پارتە، دەیتوانی ئیئتلاف لەگەڵ راست و چەپ و سۆسیالیست و ئەوانی تریشدا بکات، لە سەردەمی ئەم کابینەیەدا، لە فەرەنسا سیاسەتێکی عەلمانیانەی دژە کڵێسا پەیڕەو کرا. لەڕووی سیاسەتی دەرەوە چەند هەنگاوێك نرا، لەوانە کێشانەوەی سوپای فەرەنسا لە رۆهەر و بەستنی پەیماننامەی لۆکارنۆی ساڵی ١٩٢٥ بۆ دیاریکردنی سنووری نێوان ئەڵمانیا و فەرەنسا و لەچەکداماڵینی ناوچەی راین. یەکێك لە کێشە گرنگەکانی ئەو کاتی فەرەنسا، کێشەی بیناکردنەوە و چاککردنەوەی وڵاتی وێرانی دوای جەنگ بوو، بۆیە حکومەتی فەرەنسی لەو کاتەدا دەستی کردبوو بە پرۆسەیەکی بیناکاری فراوان بۆ چاککردنەوەی پاشماوەکانی دوای جەنگ، بەتایبەتیش لە ناوچەکانی باکوور و رۆژهەڵاتی فەرەنسا، جێبەجێکردنی ئەم پرۆژانەش، زیاتر لەسەر ئەو قەرەبووانە بوو کە لە وڵاتە دۆڕاوەکان وەردەگیرا، بۆیە لە کاتی نەدانەوە و دواکەوتنی قەرەبووەکان، کێشەی بۆ ئابووریی فەرەنسا دروست دەبوو، لە کاتێکدا کە فەرەنسا بۆخۆی لەڕووی ئابوورییەوە بەدەست چەند کێشەیەکەوە دەی ناڵاند، لەوانە خەرجییەکانی حکومەت و کۆنی سیستەمی باج و هتد، کە ئەم کێشە ئابوورییانەش بوون بە قەیرانێك و لە ساڵی ١٩٢٦دا گەیشتە لوتکە، لەو ساڵەشدا حکومەتی سۆسیالیستەکان کۆتایی پێهات و کابینەی یەکێتی نیشتمانی بە سەرۆکایەتی (ریمۆن بۆنکارای) راسترەوی میانڕەو دامەزرا.

لە سەردەمی کابینەی یەکێتی نیشتمانیدا چەند چاکسازییەك لە سیستەمی باج و چۆنێتی کۆکردنەوەی و سەپاندنی چەند باجێکی نوێ ئەنجام درا و کۆمەڵێك پرۆژەی ئابووری خرانەگەڕ، بۆیە لە نێوان ساڵانی ١٩٢٦-١٩٢٩ ئابووری فەرەنسا گەشەسەندنێکی باشی بەخۆیەوە بینی

و پیشەسازی پێشکەوت و وردە وردە کارگە نوێیەکان شوێنی کارگە تێکشکاوەکانی سەردەمی جەنگیان دەگرتەوە و ناوەندەکانی بەرهەمهێنانی پیشەسازی بەرزبووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم حکومەتە بێ کێشە نەبوو، چونکە هەموو ئەمانە سوودێکی ئەوتۆیان بۆ کرێکاران نەبوو و هەر لەدوای جەنگەوە یەکێك لە کێشەکانی حکومەتەکانی فەرەنسا، مانگرتنە یەك لەدوای یەکەکانی کرێکاران بوو، هەرچەندە ئەو مانگرتنانە ئەنجامێکی ئەوتۆیان نەدەبوو، چونکە کرێکارانی فەرەنسا ئەوکات بوو بوون بە دوو بەشەوە، بەشێکیان لایەنگری کۆمونیستی سۆڤێتی بوون و بەشێکی تریان ئەوانە بوون، کە سەر بە کۆمونیستی سۆڤێتی نەبوون، ئەگەرچی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کرێکاران لە ساڵی ١٩٣٠یشدا بڕیاری بیمە کۆمەڵایەتییەکان دەرچوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کێشە کرێکارییەکانی سارد نەکردەوە، بەتایبەتی، چونکە لە ساڵی ١٩٢٩ بەدواوە، قەیرانی ئابووری دونیای گرتبووەوە و وردە وردە کاریگەرییەکانی فەرەنساشی دەگرتەوە، کاریگەرییەکانی ئەم قەیرانە لەچاو وڵاتە پیشەسازییەکانی تر، تا رادەیەك درەنگتر فەرەنسای گرتەوە، کە پێدەچێت لەبەر ئەوە بووبێت کە لە فەرەنسادا بەڕادەیەکی زۆر هاوسەنگی لە نێوان بەرەوپێشچوونی پیشەسازی و کشتوکاڵدا هەبووبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵی ١٩٣٠ بەدواوە کاریگەرییەکانی قەیرانی دارایی وردە وردە بەڕوونی لە فەرەنسا دەرکەوت، بەڵام لەچاو ئەمەریکا و ئەڵمانیا تاڕادەیەك هێورتر بوو، ئەوە بوو لەوێ بەدواوە بازرگانی بەرەو داتەپین چوو و بێکاری تادەهات زیادی دەکرد، بەرهەمی پیشەسازیش رۆژ بە رۆژ لە هەرەسدا بوو. ئەم بارودۆخە ئابوورییە بێگومان رەنگدانەوەی دیاری بەسەر حکومەت و کابینە وەزارییەکاندا هەبوو و کابینەکان ناجێگیر و تەمەن کورت بوون، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٣٥دا شەش کابینە گۆڕان و لەماوەی دوو ساڵدا لە نێوان هەردوو جەنگ، نزیکەی ٤٠ کابینەی وەزاری دامەزران، کە ئەمە بۆخۆی مانای ئەوە بوو کە سیستەمی دیموکراسی بەهۆی کێشەکانی دوای جەنگەوە لە زلهێزەکانی ئەوروپا کەوتبووە قەیرانەوە.

جگە لەو قەیرانانەش، هاوکات لەو دۆخە ئابوورییە قورسەدا، ئاراستەیەکی تر لە فەرەنسا دەرکەوت، ئەوانیش فاشیستەکان بوون، کە هاوشێوەی فاشیستەکانی ئیتالیا بوون، لەو ماوەیەدا چەندین کۆمەڵەی فاشیستی دەرکەوتن، کە دیارترینیان کۆمەڵەی خاچی ئاگرین بوو و لەلایەن (کۆلۆنیل دیلارۆك)ەوە دامەزرابوو و کۆمەڵێك لە دەوڵەمەند و پیشەسازییە گەورەکان پشتیوانیان لێدەکرد، ئەم کۆمەڵە فاشیستانە کێشەیەکی زۆریان بۆ حکومەتەکانی

فەرەنسا نایەوە، کە لە ساڵی ١٩٣٤دا گەیشتە لوتکە، و خۆپیشاندانەکان بەڕادەیەکی زۆر فراوان بوو و هەڕەشەیان لە پەرلەمان کرد و هێرشیان کردە سەر پۆلیس و چەندین کوژراو و بریندار لێکەوتەوە، ئەم بارودۆخە ترسێکی گەورەی خستبووە دڵی لیبراڵەکان و دیمۆکراتەکان و سەندیکاییەکان و پارتی سۆسیالیستیش، کۆمونیستەکانیش لەو کاتەدا لەکاتێکدا کە لەگەڵ حکومەتدا نێوانیان خراپ بوو، لە هەمان کاتدا دژی فاشییەکانیش بوون، هاوکات لە ژێر کاریگەری ئاراستەکانی کۆمونیستی سۆڤێتی کە هەستیان بە ترسی سەرکەوتنی فاشیستەکان کردبوو لە فەرەنسا، بۆیە ناچار بوون هاوپەیمان بن لەگەڵ تەواوی رەگەزە دژەکانی تری فاشیستەکان، دوای ماوەیەك لەو پشێوییەی فەرەنسا، سۆسیالیستە رادیکالەکان و سۆسیالیستەکان و کۆمونیستەکان ئیئتلافێکی سیاسییان بەناوی (بەرەی گەل)ەوە دامەزراند، ئەم بەرەیە رای گەیاند، کە ئەم رۆڵی بەرگریکردن لە سیستەمی کۆماری لە بەرانبەر فاشیستەکاندا دەگێڕێت و هەروەها کۆمەڵێك رێککاری سەرکەوتووانە لە دژی قەیرانی ئابووری وڵات دەگرێتەبەر و چەند چاکسازییەکی کرێکارییانە ئەنجام دەدات، بۆیە لە هەڵبژاردنی بەهاری ساڵی ١٩٣٦دا، سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا و کابینەیەکی نوێیان بە سەرۆکایەتی (لیۆن بلۆم)ی سەرۆکی سۆسیالیستەکان دامەزراند.

(لیۆن بلۆم) کەسایەتییەکی جولەکە بوو، لە سەرەتاکانی ژیانیدا وەکو رەخنەگرێك دەستی پێکرد و دواتریش بۆ ماوەیەکی درێژ ئەندامی ئەنجوومەنی دەوڵەت بوو، هەروەها ئەزموونێکی باشیشی لە بواری دارایی و بەڕێوەبردندا هەبوو، هاتنەسەرکاری (بلۆم) لە کاتی ئەو بارودۆخە ئابووری و کۆمەڵایەتییە ئاڵۆزەدا ئومێدێکی باش بوو بۆ چینەکانی خوارەوە و پێیان وابوو لێرەوە سەردەمێکی نوێ لە چاکسازیی ئابووریی دەست پێدەکات و دۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتییان بەرەو باشتر دەڕوات، بەڵام هەر لەو کاتەشدا کرێکاران زنجیرەیەك مانگرتنیان لە کارگەکانی پاریس و دواتریش هەرێمەکانی تر دەست پێکرد.

کاری یەکەمی ئەم کابینە نوێیە گێڕانەوەی جێگیری بوو بۆ کارگە فەرەنسییەکان و هەوڵدان بوو بۆ هاندانی گێڕانەوەی کرێکاران بۆ کار و لەم رێیەشەوە چالاککردنەوەی جوڵەی ئابووریی وڵات، لەم بوارەشدا کۆمەڵێك چاکسازییان ئەنجام دا، هەروەها کۆمەڵێك یاسایان لە بەرژەوەندی کرێکاراندا دەکرد، لەلایەکی تریشەوە چەند یاسایەکیان بۆ باشکردنی بارودۆخی کشتوکاڵی دانانی نرخی نوێ و کۆنترۆڵکردنی ئەنبارەکان و بازاڕەکانی گەنم لە ناوەوە و دەرەوەی فەرەنسا دەرکرد، کە ئەمانە هەمووی کۆمەڵێك چاکسازی بوون بە مەبەستی

بوژاندنەوەی ژیانی ئابووری کە (بلۆم) پێی دەگوتن نیودلی فەرەنسی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هەنگاوانەی بلۆم نەیانتوانی کێشەی دارایی وڵات بە تەواوی چارەسەر بکەن و ئەمە جگە لەوەی کە هەنگاوەکانی بلۆم بوونە هۆکاری ئەوەی پارێزگارەکانی فەرەنسا لە بەرانبەر ئەم کابینەیەدا نیگەران و پەست بن و داوای گۆڕینی بکەن بەو بیانووەی کە ناکرێت فەرەنسا بەدەست جولەکەیەکی سۆسیالیستییەوە بێت، بۆیە چاوەڕێی هەڵێکیان دەکرد بۆ لەناوبردنی، لەلایەکی تریشەوە ئەم چاکسازییانەی بلۆم وەك یارمەتیدانی کرێکاران و کەمکردنەوەی کاتی کار، نارەزاییەکی نێودەوڵەتی خستبووەوە، بۆیە جگە لەوەی هەر یەکە لە هیتلەر و مۆسۆلینی سەرۆکایەتی جولەکەیەکی سۆسیالیستیان بە سوکایەتی بۆ کەسایەتی خۆیان دەزانی، هاوکات پارێزگارەکانی بریتانیاش دوژمنایەتی بلۆمیان دەکرد بەو بیانووەی کە دوژمنی ئەرستۆکراتەکان و خاوەن ئیمتیازەکانە، سەرەنجام لە ئەنجامی زیادبوونی نارەزاییە دەرەکی و ناوەکییەکان، لیۆن بلۆم لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٧دا ناچار بوو دەست لەکار بکێشێتەوە، ئەگەرچی تا مارتی ساڵی ١٩٣٨ وەکو جێگری سەرۆك مابووەوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٣٨دا کۆتایی بە کابینەکە هات و (ئێدوارد دیلادیا) کابینەیەکی نوێی دامەزراند و لێرەوە بوو بە یەکێك لەو کەسایەتییانەی کە رۆڵێکی بەرچاوی لە سیاسەتە نێودەوڵەتییەکانی بەر لە کەوتنەوەی جەنگی دووەمی جیهاندا گێڕا.

## سێیەم: ئەمەریکا

ئەمەریکا ئەو وڵاتە سەرکەوتووەی جەنگ بوو، کە زیانی زۆر لە وڵاتی تری بەشداربووی جەنگ کەمتر بوو، لەڕووی ماددیشەوە، ئەمەریکا یەکێك بوو لەو وڵاتانەی قازانجێکی زۆری کرد، چونکە بەهۆی جەنگەوە، ئەمەریکا بوو بە بازاڕی کەرەستە جەنگییەکانی هاوپەیمانان و شوێنی پیشەسازیی قورسی زۆر پێشکەوتوو، بە جۆرێك شاری نیویۆرك توانی شوێنی لەندەن بگرێتەوە وەك ناوەندی دارایی جیهان، دۆلاری ئەمەریکیش شوێنی بە جونەیهی ئەستەرلینی لەق کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە دوای جەنگ و تایبەت لە دوای ساڵی ١٩١٩ەوە ئاراستەیەك لە ئەمەریکا دەرکەوت کە بە توندی دژی جەنگ و تێوەگلان بوو لە کێشەکانی ئەورووپاوە.

لە دوای جەنگ و لە بیستەکانی سەدەی رابردوودا زۆربەی ساڵەکانی حوکمی ئەمەریکا بەدەست کۆمارییەکانەوە بوو، لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٢٠دا کۆمارییەکان توانیان بەسەر

دیموکراتەکاندا سەرکەوتن بەدەست بهێنن، دوای ئەوەی کە دیموکراتەکان لە ساڵی ١٩١٣ەوە حوکمی وڵاتیان دەکرد، بەڵام دواتر کۆمارییەکان توانیان بۆ ماوەی سێ خولی هەڵبژاردن حوکمی وڵات بگرنە دەست، ئەوانیش هاردینگ (١٩٢١-١٩٢٣)، کالڤن کۆلیدج (١٩٢٣-١٩٢٩) هێربەرت هۆڤەر (١٩٢٩-١٩٣٣).

لە راستیدا ئەو تەوژمە بەهێزەی کە ئارەزووی لە گۆشەگیری و کشانەوە لە کێشە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان بوو، لە دوای جەنگدا رەنگدانەوەیەکی گەورەی بەسەر سیاسەتی ئەمەریکاوە هەبوو، لەوانەش هەر لە سەرەتاوە ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکا پەیمانی ڤێرسای کۆمەڵەی گەلانی رەتکردەوە، هەرچەندە ئاراستەیەکی تر هەبوو کە پێی وابوو ئەمەریکا رۆڵی گەورەی بووە لە سەرکەوتنی بەرەی هاوپەیمانان بەسەر ئەڵمانیادا، بۆیە پێویست بە گۆشەگیری ناکات.

ئەم سیاسەتی گۆشەگیرییە لایەنی ئابووریشی گرتەوە، چونکە ئەمەریکا لەو کاتەدا ترسی لە کێبەرکێی وڵاتانی بێگانە و مامەڵەکردن لەگەڵ بازارە دەرەکییەکاندا هەبوو، بۆیە دەوڵەت لەو ماوەیەدا پەنای بۆ سیاسەتی سەپاندنی گومرگی زۆر برد، بۆ ئەوەی بتوانێت بەربەستێك بۆ هاوردە و هەناردە دابنێت، ئەوە بوو هەر لە دوای هاتنە سەرکاری کۆمارییەکان لە ساڵی ١٩٢٢دا بە جۆرێك گومرگیان بەرز کردەوە کە پێشتر شتی وەهای بەخۆیەوە نەبینی بوو، دوای ئەوەش چەند جارێکی تر ئەم بەرزکردنەوەیەیان ئەنجام دا، تا لە ساڵی ١٩٣٠دا گومرگ گەیشتە بەرزترین ئاستی خۆی لە مێژووی ئەمەریکادا، ئەم سیاسەتەی بەکاریان هێنا، تەنها نەبووە مایەی داخرانی بازارەکانی ئەمەریکا بەرووی بەرهەمی ئەوروپیدا، بەڵکو بازارەکانی ئەوروپیشی بەرووی ئەمەریکادا داخست، بەڵام شتێکی ئاساییە کە لە سیستەمی سەرمایەداریدا ئەم سیاسەتی گۆشەگیرییە ئابوورییە توانای پیادەکردنی تەواوی نییە، بۆیە لە توانای ئەمەریکادا نەبوو لەسەر ئەم سیاسەتی گۆشەگیرییە بڕ بکات، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٢٨دا ئەمەریکا وردە وردە خۆی خزاندەوە نێو کێشە نێودەوڵەتییەکانەوە، لەوانە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا (فرانك کیلۆك) بە هاوبەشی لەگەڵ (ئەرستید بریان)ی وەزیری دەرەوەی فەرەنسادا، پرۆژەیەکی سەبارەت تەحریمکردنی جەنگ پێشکەش کرد و دواتریش بەناوی گەلاڵەنامەی پاریسی (کیلۆك-بریان)ەوە ناسرا، کە لەلایەن ٢٣ وڵاتەوە مۆرکرا، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە ئاشتیی نێودەوڵەتی کاریگەرە لە سیاسەتی ئەمەریکا و بەرژەوەندییەکانی، بۆیە ناتوانێت لەم رووەوە خۆی دوورەپەرێز بگرێت و بە گۆشەگیری بمێنێتەوە، ئەمە وێرای ئەوەی کە لەرووی ئابوورییەوە سەرمایەی ئەمەریکی و بزنسمانەکانی

ئەمەریکا و بەرهەمی ئەمەریکا لە بەشی هەرە زۆری جیهاندا بوونیان هەبوو، ئەمە وایکردبوو کە ئەمەریکا لە زۆربەی کێشەکانی وڵاتاندا تێوەبگلێت، بۆ نموونە هەر لە ساڵی ١٩٢٢ەوە ئەمەریکا رۆڵی بەرچاوی لە کێشەکانی رۆژهەڵاتی دووردا بینی، لەو پەیماننامە نێودەوڵەتییەدا بەشدار بوو، کە لەبارەی سیادە و یەکێتی چینەوە ئەنجام درا، بەم جۆرە دەبینین کە زلهێزێکی وەکو ئەمەریکا سەرەڕای پیادەکردنی سیاسەتی گۆشەگیرانەش، نەیدەتوانی بە تەواوەتی خۆی لە کێشەکان دوورەپەرێز بگرێت.

لە ساڵی ١٩٢٣ەوە سەردەمی حوکمی (کۆلیدج) دەست پێدەکات، کە لە سەردەمی ئەودا بووژانەوەیەکی ئابووری باش وڵاتی گرتبووەوە، بەڵام ئەو بووژانەوەیە بەشێوەیەکی یەکسان و هاوتەریب نەبوو لە نێو کەرتە جیاجیاکانی ئابووری ئەمەریکادا، بۆ نموونە لایەنی کشتوکاڵی بەدرێژایی بیستەکان لە قەیراندا بوو، چونکە جوتیارانی ئەمەریکا هەر بەو نیازەی کاتی جەنگەوە بەرهەمیان دەهێنا، کە رۆژ بە رۆژ نرخ روو لە بەرزبوون بوو، بۆیە ئەوانیش تا دەهات بەرهەمیان زیاد دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی جەنگ کۆتایی پێهاتبوو، بازاڕە دەرەکییەکان داواکارییەکەی پێشوویان نەمابوو، بازاڕی نێوخۆییش لە ئاست ئەو هەموو بەرهەمەدا نەبوو، بۆیە نرخی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان رۆژ بە رۆژ لە دابەزیندا بوو و قەیرانی بۆ ژیانیان دروست دەکرد، کەچی بە پێچەوانەوە پیشەسازییە قورسەکان لە سەردەمی (کۆلیدج)دا بەڕادەیەکی زۆر پێشکەوت، بەڵام لە ساڵی ١٩٢٩دا، ئەم بووژانەوەیە وەستانێکی کتوپڕی بەخۆیەوە بینی، ئەوە بوو لە پاییزی ئەو ساڵەدا بازاڕی ئەمەریکا بە شێوەیەکی زۆر خراپ هاتە خوارەوە و بووە هۆی مایەپووچبوونی بەشی زۆری بانك و کۆمپانیا و وەبەرهێنەرەکان، کە ئەمەش قەیرانێکی دارایی گەورەی لە ئەمەریکا خستەوە، کە بە قەیرانی دارایی ١٩٢٩-١٩٣٣ ناسرا.

### قەیرانی دارایی

ئەم قەیرانە داراییە بە رادەیەك بوو لە ئەمەریکا، کە لە ساڵی ١٩٣٣دا ژمارەی بێکارانی خۆی لە ٢١ ملیۆن کەس دەدا، لە سەرەتادا بەشێك لە سیاسەتمدار و بزنسمانەکانی ئەمەریکا ئەمەیان بە گرژبوونەوە و قەیرانێکی ئابووری کاتی لە قەڵەم دەدا، بەڵام دواتر دەرکەوت کە ئەم قەیرانە لە قەیرانەکانی پێشووتر جیاوازە و نزیکەی چوار ساڵی خایاند، ئەم قەیرانە بە پێچەوانەی قەیرانەکانی پێشووتر لە ئەنجامی زۆری بەرهەمەوە بوو، نەك بەهۆی کەمی

بەرهەمەوە بێت، کە ئەمەش بەڵگەیەك بوو بۆ رزیوی و بێکەڵکی سیستەمی دابەشکردنی سامان لەو وڵاتەدا، قورسی ئەم قەیرانە بە جۆرێك بوو کە تەواوی بزنسمان و سیاسەتمەدارانی ئەو وڵاتەی ناچارکرد، بە دڵسۆزییەکی گەورەوە کار بۆ چارەسەرکردنی بکەن، بۆیە کاتێك کە (هۆڤەر) هاتە سەر حوکم، کاتی قەیرانە داراییەکە بوو، ناچار بوو داوا لە کۆنگرێس بکات بودجەی تایبەت بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکان و وەگەڕخستنەوەی بازاڕ دابنێن، (هۆڤەر) بە هەموو جۆرێك هەوڵی دەدا بەسەر قەیرانەکەدا زاڵ بێت، بەڵام تەواوی هەوڵەکانی بێ ئاکام بوون، هەر بۆیە لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٣٢دا دوای ماوەیەکی درێژ لە حوکمی کۆمارییەکان، جارێکی تر دیموکراتەکان توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێننەوە و لە ساڵی ١٩٣٣شدا (فرانکلین دیلانۆر رۆزفێلد) وەك سەرۆکێکی دیموکراتەکان دەستی بەکار کردەوە.

لەکاتێکدا بوو کە وڵات لە هەڕەتی قەیرانەکەدا بوو، بۆیە (رۆزفێلد) بەبایەخێکی زۆرەوە هەوڵی دا ئەم قەیرانە چارەسەر بکات، لەم پێناوەشدا سیاسەتێکی داڕشت، کە بە سیاسەتی نیودل (رێبازی نوێ) ناسراوە. ئەم سیاسەتەش بریتی بوو لە پشتبەستن بە مامۆستایانی زانکۆ، (رۆزفێلد) لە چوارچێوەی ئەم سیاسەتەدا، کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆی لە خۆی کۆکردەوە کە گرنگترینیان (ریمۆند مۆلی) و (تۆکوێل بوون)، ئەم مامۆستایانە رۆزفێلدیان بۆ کۆمەڵێك چاکسازی لە سەرجەم بوارەکاندا رێنوێنی کرد، ئەوە بوو (رۆزفێلد) کۆمەڵێك چاکسازی لە کار و پرۆژەکاندا ئەنجام دا، بەشێکی ئەم پرۆژەیە مەبەستی لە بووژانەوە و یارمەتیدان بوو، بەشەکەی تریشی وەك ریفۆرم وابوو، لە بواری یارمەتیدانەکاندا، یارمەتییەکی زۆری ئەو کەسانەی دا کە لە تەنگانەدا بوون، هەروەها قەرزێکی زۆریشی بۆ بواری بیناسازی و رێگەوبان بەخشی و بەمەش هەلی کاری رەخساند، هەروەها سیستەمێکی وردی بۆ یارمەتیدانی بێکارەکان دانا، لە بواری چاکسازیشدا، ئەم پرۆژەیە بەری بە سیاسەتی کێبەرکێی زیانبەخش گرت، هاوکات باجی سەر داهاتی چینە دەوڵەمەندەکان و کۆمپانیا گەورەکانی زیاد کرد، ئەمە جگە لەوەی کە لە بواری کشتوکاڵیشدا چەند هەنگاوێکی گرنگی نا، لەوانەش هەوڵێکی زۆری دا بۆ بەرزکردنەوەی نرخی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان تا بگەڕێتەوە بۆ ئاستی پێش جەنگ، هەروەها هەوڵێکی زۆریشی خستەگەڕ بۆ هێشتنەوەی زەوییەکان بەپیتی، هاوکات ئاسانکاری بۆ جوتیارەکان کرد لە بەدەستهێنانی پارە، کاریشی بۆ کردنەوەی بازاڕی نوێ لە دەرەوە و ناوەوە بۆ بەروبوومەکانیان کرد. لە بواری کاریشدا یەك زنجیرەی لە یاسا دەرکرد، لەوانەش یاسای بووژانەوەی نیشتمانی لە ساڵی ١٩٣٣دا، کە تیایدا

هەوڵی دا کاتژمێری کار کەمبکاتەوە و کرێ بەرز بکاتەوە و هەلی کار بڕەخسێنێت، لە ساڵی ١٩٣٧یشدا، کۆنگرێس زنجیرەیەك یاسای بۆ بیمەی کۆمەڵایەتی دەرکرد، لەوانە مووچەی بەساڵاچووان و بیمەی بێکاری و یارمەتی پەککەوتووان و ژنانی بێکار و منداڵانی کەمئەندام.

هەرچەندە ناوەناوە ناڕەزایەتی و گفتوگۆی توند لەبارەی ئەم سیاسەتەی (رۆزفێلد)ەوە دەکرا، هەندێك بەوەیان دەزانی کە دەستوەردانە لە مافە شەرعییەکانیان، کۆمارییەکانیش بەرهەڵستکاری بوون بەو بیانووەی کە سەرپێچی دەستووری ئەمەریکایە، بەڵام ئەم سیاسەتە رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە زاڵبوونی (رۆزفێلد) بەسەر کێشە ئابوورییەکان و قەیرانە داراییەکاندا، بۆیە لەوە بەدواوە بوو بە کەسایەتییەکی خۆشەویستی نێو گەلی ئەمەریکی و لە هەرسێ هەڵبژاردنی ١٩٣٦، ١٩٤٠، ١٩٤٤دا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و لە دەستپێکی جەنگی دووەمی جیهانیشدا هەر ئەو سەرۆکی ئەمەریکا بوو.

## چوارەم: یەکێتی سۆڤێت

هەرچەندە رووسیای قەیسەری هەر لە سەدەی حەڤدەوە یەکێك بوو لە زلهێزەکانی ئەوروپا و ئیمپراتۆریایەکی گەورە و فراوان بوو و سەنگ و قورسایی بەرچاوی هەبوو لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا و یەکێکیش بوو لەو وڵاتانەی کە لە کەوتنەوەی جەنگی یەکەمی جیهاندا رۆڵی بەرچاوی گێڕا، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەو سیستەمە ترادیسیۆنییە کۆنەی حوکمی قەیسەر و مانەوەی دەسەڵاتدارێتییەکەی بەدواکەوتوویی، هۆکارێك بوون بۆ قوڵبوونەوەی ناکۆکی نێوان کۆمەڵگەی گەشەسەندووی رووسیا و دەسەڵاتە کۆنەکەی، کە نەیتوانیبوو لەگەڵ ئەو گەشەسەندنانەدا بڕ بکات، بەڕادەیەك کە ئەم دەسەڵاتە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بۆ خۆپاراستن تا دەهات ستەمکار و توندوتیژتر دەبوو، هەر بۆیە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بزاڤێکی شۆڕشگێڕانەی توند لە رووسیا دەستی پێکرد، کە سەرەتا لە چوارچێوەی مانگرتنی کرێکارانە و راپەڕین و یاخیبوونی گەلانی نارووسەوە دەرکەوت و لە ساڵی ١٩٠٥-١٩١٠٧دا تەوژمی شۆڕشێکی گەورە رووسیای گرتەوە و ترسێکی گەورەیشی لەسەر خودی دەسەڵاتی قەیسەر دانا، بەڵام دەسەڵاتەکەی قەیسەر لەو قۆناغەدا توانی بەرێگەی زەبر و زەنگ و سەرکوتکردنەوە کۆتایی بەو شۆڕشە بهێنێت. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهاندا و کاریگەرییە نەرێنییەکانی بەسەر ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی رووسیاوە، بارودۆخ لە رووسیا

ئالۆزتر بوو، دەسەڵاتی قەیسەریش تادەهات لاوازتر دەبوو، زەمینەی دەرکەوتنی شۆڕشێکی سەرتاسەریش ڕۆژ بەرۆژ لە بارتر دەبوو، کە سەرەنجام شۆڕش لە ڕووسیا بە دوو قۆناغ توانی کۆتایی بە دەسەڵاتی قەیسەری بهێنێت و حکومەتێکی ڕووسی نوێ دابمەزرێنێت، کە دواتر لە ماوەیەکی کەمدا بوو بە یەکێك لە هێزە سەرەکییەکانی جیهان.

## – شۆڕشەکانی ساڵی ١٩١٧

### یەکەم: شۆڕشی مارتی ١٩١٧

هەروەکو پێشتر ئاماژەی پێکرا، بەدەستپێکردنی جەنگ، قەیرانەکانی ڕووسیا زیاتر قوڵ بوونەوە، چونکە ڕووسیا لە هیچ ڕوویەکەوە ئامادەی ئەم جۆرە جەنگە نەبوو، هەر بۆیە تێچوون و ئەرکەکانی جەنگ زۆر بەخێرایی بوون بە بارێکی قورس بەسەر شانی حکومەت و کۆمەڵگەی ڕووسییەوە، لەبەر ئەوەی ڕووسیا لەلایەکەوە هەر بۆخۆی کەموکوڕییەکی زۆری هەبوو لەڕووی کارگە چەکسازی و ئامێرە نوێیەکانی گواستنەوە و پێکهاتە و سەرکردایەتی نوێی سوپاوە، لەلایەکی تریشەوە ئەو سوپا زۆرەی کە بۆ جەنگ کۆی کردەوە، کە لە سێ ساڵی یەکەمی جەنگدا نزیکەی ١٥ ملیۆن دەبوون، لەسەرووی توانای ڕووسیاوە بوو و نەیدەتوانی پێداویستییە جەنگییەکان ڕەوانەی بەرەکانی جەنگ بکات لە خۆراك و چەك و پێداویستییەکانی تر، ئەم دۆخەش ڕۆژ بە ڕۆژ سەربازەکانی لەو حکومەتە بێزار دەکرد، جگە لەوەی ئەو ملیۆنەها سەربازە بەشی زۆریان لە جوتیارەکان بوون و لە زەوی و زار و کار دوورخرابوونەوە، ئەمەش بە ڕوویەکی تردا دەبووە مایەی کەمبوونەوەی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان و کاریگەر دەبوو لەسەر بژێوی ژیانی کۆمەڵگەی کشتوکاڵی ئەوکاتەی ڕووسیا، هاوکات لە پاڵ هەموو ئەمانەدا شکستە یەك لەدوای یەکەکانی ڕووسیا لە جەنگ، هێندەی تر دۆخی ڕووسیای قەیراناویتر دەکرد و زەمینەی شۆڕشی لە بارتر دەکرد، ئەمە جگە لەوەی هەر لەو سەروبەندەشدا بوو چەندین گروپ و کۆمەڵی ناڕازی لە کۆمەڵگەی ڕووسیدا دەرکەوتن کە بەردەوام و بەشێوەیەکی چالاکانە خۆیان بۆ شۆڕش و ڕاپەڕین ئامادە دەکرد، لەوانە دیموکراتەکان، دەستوورییەکان، سۆسیال-دیموکراتەکان و سۆسیالیستەکان.

بەم جۆرە لە سەرەتای ساڵی ١٩١٧دا ڕووسیا بە تەواوی لە قەیرانێکی سیاسیی-ئابووریدا دەژیا و سەرەنجامی ئەم قەیرانەش، شۆڕشێکی گەورە بوو، کە لە سەرەتای مانگی مارتدا دژ

به دەسەڵاتی قەیسەری دەرکەوت، لە ٨ی مارتی ١٩١٧دا لە شاری پەترۆگراتەوە خۆپیشاندانەکان بە دروشمی دژ بەقەیسەری، دەستیان پێکرد، دوای سێ ڕۆژیش یاخیبوون لە ریزەکانی سوپادا دەرکەوت، چونکە ئەوان رازینەبوون تەقە بەڕووی خۆپیشاندەراندا بکەن و بە پێچەوانەوە چوونە پاڵ خۆپیشاندەران، دوای ئەوەش توانیان بە تەواوی پایتەخت کۆنترۆڵ بکەن، دوای ئەوەی پایتەخت کۆنترۆڵ کرا، دوو لیژنەی شۆڕشگێڕانە دامەزرا، یەکێکیان ئەنجوومەنی نوێنەرایەتی (دۆما) بوو، کە میانڕەوەکان بوون، ئەویتریشیان ئەنجوومەنی سۆفیتاتی کرێکارەکان بوو (رادیکالەکان)، ئەم دوو لیژنەیە هەر لە سەرەتاوە ململانێکانیان لەسەر دەسەڵات دەستی پێکرد، دوای ئەوەی پایتەختیان کۆنترۆڵ کرد، شۆڕش تەواوی شارە گەورەکانی گرتەوە و سوپاش یاخیبوونی خۆی دەربڕی و ئەمەش (نیکۆلای دووەم)ی قەیسەری ناچارکرد دەست لە تەختی پاشایەتی بۆ برازاکەی هەڵگرێت، کە دوای ماوەیەکی زۆر کورت ئەویش دەستبەرداری تەخت بوو، بەمەش دەسەڵاتی بنەماڵەی ڕۆمانۆڤ لە رووسیا بە تەواوەتی کۆتایی پێهات.

به نەمانی بنەماڵەی ڕۆمانۆڤ، ململانێی نێوان دوو ئاراستەکە قوڵتر و توندتر بوو، کە لە سەرەنجامدا ئاراستەی بۆرجوازەکان یان میانڕەوەکان، بە سەرکردایەتی (لیفۆف)، توانیان حکومەتێکی کاتی دابمەزرێنن، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت (کیرنسکی) شوێنی (لیفۆف)ی گرتەوە.

## شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧

رەوتەکەی تر کە رادیکالەکان بوون و بە سەرۆکایەتی (لینین) بوو، هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەسەڵاتی حکومەتی کاتییەوە، کەوتنە بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەو حکومەتەدا، بەتایبەت کە حکومەتی کاتی نەیتوانی چاکسازییەکی ئەوتۆ لە بواری ئابووری و سیاسییەوە بکات و هیچ هەنگاوێکی راستەقینەشی بۆ دانانی دەستوورێکی نوێ بۆ وڵات و کشانەوە لە جەنگی یەکەمی جیهان نەدەنا، لە بەرانبەریشدا بەلشەفییەکان داواکاری گۆڕانکاری ریشەیی بوون لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە و پێداگریشیان لەسەر کشانەوە لە جەنگ دەکرد، ئەم ململانێیە رۆژ بە رۆژ توندتر دەبوو، تا لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩١٧دا بە تایبەتی دوای شکستی رووسیا لە بەرەکانی جەنگدا لەبەرانبەر هێزەکانی ئەڵمانیا لە مانگی حوزەیراندا قەیرانێکی سیاسیی نوێی لە وڵاتدا کەوتەوە، کە لە ئەنجامدا لە پەترۆگراد و مۆسکۆ و چەند

شارێکی تری رووسیا خۆپیشاندانی گەورە دەستی پێکرد، کە ئەم دۆخە زیاتر بەلشەفییەکانی بەهێزتر و فراوانتر دەکرد، سەرەنجام لە تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۱۷دا سەربازەکانی پایتەخت ئەوەیان راگەیاند کە چوونەتە پاڵ بەلشەفییەکان، لێرەوە حکومەتی کاتی زۆر بە توندی ویستی رووبەڕووی بەلشەفییەکان ببێتەوە و بە هەموو شێوەیەك هەوڵی سەرکوتکردنەوەی دان، هەر لە داخستنی رۆژنامەکانیان و راوەدوونانی ئەندام و سەرکردەکانیان و بەکارهێنانی سوپا لەبەرانبەریان، بەڵام هیچ یەکێك لەمانە ئەنجامێکی ئەوتۆی نەدا بەدەستەوە، بۆیە (کیرنسکی) بە ناچاری وڵاتی بەجێهێشت و روویکردە ئەمەریکا.

بەم جۆرەش لەبەرەبەیانی ۷ی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۱۷دا (لینین) سەرکەوتنی شۆڕشی سۆسیالیستی لە وڵاتدا راگەیاند و حکومەتی نوێی وڵاتی بە سەرۆکایەتی خۆی راگەیاند.

## – کارەکانی دەسەڵاتی نوێ سۆڤێتی لە دوای شۆڕش

دوای سەرکەوتنی شۆڕش، حکومەتی نوێی بەلشەفییەکان بۆ پاراستنی شۆڕش و جێگیرکردنی دەسەڵاتەکەی، ناچار بوو ئەو بەڵێنانەی دابووی، جێبەجێ بکات. ئەوەبوو لەدوای سەرکەوتنیان راستەوخۆ دوو بەیاننامەی سەرەکییان راگەیاند، یەکێکیان بە (بەیاننامەی ئاشتی) ناسراوە، کە تیایدا داوای دەستپێکردنی گفتوگۆ و وەستانی جەنگی یەکەمی جیهانیان دەکرد و ئەویتریشیان بە (بەیاننامەی زەوی) ناسراوە، کە تیایدا سەرجەم زەوییەکانی وڵات لەژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی دەرەبەگ و موڵکدارەکاندا هێنرایە دەر و هەروەها کۆنترۆڵی دەوڵەت بەسەر تەواوی دەزگا پیشەسازییەکانی وڵاتدا سەپێنرا، سەبارەت بە هەڵوێستی بەلشەفییەکان لە شەڕی یەکەمی جیهانی ، ئەوا وەك پێشتر باسکراوە، رووسەکان دوای ئەوەی لە رازیکردنی وڵاتە شەڕکەرەکان بۆ وەستاندنی جەنگ سەرکەوتوو نەبوون، ئەوە بوو یەکلایەنانە ئاشتییان لەگەڵ ئەڵمانیادا راگەیاند، بەتایبەت دوای ئەوەی هێزەکانی ئەڵمانیا بە رووبەرێکی زۆر هاتبووە ناو خاکی رووسیاوە، بۆیە لە ۳ی مارتی ۱۹۱۸دا، روسیای نوێ بەپێی پەیماننامەی (بریست لیوتۆفسك) لەگەڵ ئەڵمانیادا رێککەوت، کە تیایدا دەستبەرداری بەشێکی زۆر لەناوچەکانی و بەرژەوەندییەکانی بوو.

بەم جۆرە رووسیای سۆڤێتی لە جەنگی یەکەمی جیهان هاتەدەرەوە، هەرچەندە زۆر لەسەری کەوت، بەڵام ئاشتی لە وڵاتدا بەرقەرار کرد و لێرەوە دەستی بە رێکخستنی کاروباری ناوخۆی وڵات کرد، بۆیە هەر دوای بەستنی ئاشتینامەکە، هەنگاوی دووەمی دەست پێکرد، کە دانانی دەستوورێکی نوێ بوو بۆ وڵات، ئەوە بوو لە ١٠ی تەمموزی ساڵی ١٩١٨دا لە کۆنگرەی پێنجەمی سۆفیداتەکانی رووسیادا، یەکەم دەستووری کۆماری رووسیای یەکێتی سۆڤێتی لەسەر بنەمای سۆسیالیستی راگەیەنرا. لە دەستوورەکەدا موڵکایەتی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان هەڵوەشێنرایەوە، سەرجەم بانك و بازرگانییە دەرەکییەکان و بەشێکی زۆری جومگە ئابوورییەکانی تر خرانە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتەوە، لەرووی سیاسییشەوە بەپێی بەندەکانی دەستوور، دەسەڵاتی سیاسیی وڵات خرایە ژێر دەستی چینی کرێکاران بە هاوپەیمانێتی لەگەڵ جوتیاران و رۆشنبیرە شۆڕشگێڕەکان، هەروەها مافی هەڵبژاردن درا بە هەموو هاووڵاتییەکی رووسی کە تەمەنی لە ١٨ ساڵ بەسەرەوە بێت بەبێ جیاوازی رەگەز و نەتەوە. هەروەها لە دەستووردا بڕیار لەسەر یەکسانی رەهای هاووڵاتیان لە مافەکانیان درا بەبێ رەچاوکردنی نەتەوایەتییان.

## – جەنگی نێوخۆیی لە سۆڤێت

دەسەڵاتی سۆڤێتی ئەگەرچی زۆر بە خێرایی ئەم دەستوورەی راگەیاند، بەڵام لەجێبەجێکردنی بەندەکانی دەستوورەکە و پیادەکردنی بەرنامە چاکسازییەکان، نەیتوانی بەو خێراییە هەنگاو بنێت کە خۆی دەیەویست، چونکە لەو کاتەدا چەندین گرفت و بەربەستی جۆراوجۆر لەلایەن دوژمنە دەرەکی و ناوخۆییەکانی شۆڕشەوە خرانە بەردەم ئەو هەنگاوانە و لەو ماوەیەشدا شەڕێکی نێوخۆیی گەورە و دەستێوەردانێکی دەرەکی لە یەك کاتدا روویان دا، چونکە زۆر ئاسایی بوو کە دوژمنانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ناوەوە و دەرەوە هەوڵی بەربەستکردنی هەنگاوەکانی ئەم شۆڕشە بدەن، بۆیە تەنها دوای چەند رۆژێکی کەم (کیرنسکی) و بەشێك لە سەرکردە سەربازییەکانی هەوڵیان دا دەسەڵاتی سۆڤێتی لە پەترۆگراد بەر لەوەی جێگیر بێت، لەناوبەرن و توانیان خەڵکێکی زۆر لە دژی شۆڕش لە دەوری خۆیاندا کۆبکەنەوە، دەسەڵاتی سۆڤێتی لەو کاتەدا لە توانایدا بوو زۆر بەخێرایی دوژمنە ناوخۆییەکانی لەناو بەرێت، بەڵام پشتیوانییە دەرەکییە زۆرەکان وایانکرد دەسەڵاتی سۆڤێتی

نەتوانێت ئەم هەنگاوە زۆر بەخێرایی ئەنجام بنێ، ئەوە بوو لە ساڵێ ١٩١٨دا سوپای بریتانی و ئەمەریکی و فەرەنسی و ژاپۆنی لە ناوچەکانی کافکاسەوە هێرشیان کردە سەر رووسیا، جگە لەمانە، چەندین دەوڵەتی تری وەك تورکیا و رۆمانیاو پۆلەندا و تەنانەت ئەڵمانیای خاوەن پەیماننامەش هێرشیان کردە سەر رووسیا، بە جۆرێك نزیکەی ١٤ سوپا بەشدار بوون لە شەڕی دژە رووسیا، کە ئەم سوپایە بە سوپای سپی ناسرابوو و چوار یەکی رووبەری رووسیایان داگیرکرد، ئەم شەڕە لە راستیدا بارودۆخێکی زۆر خراپی بەسەر رووسیادا هێنا بە تایبەت لەڕووی ئابوورییەوە، جگە لەوەی لەڕووی سیاسییەوە بارودۆخی وڵاتی شپرزە کرد و دەسەڵاتی سۆڤێتی تەواوی تواناکانی بۆ بردنەوەی ئەم شەڕە تەرخانکرد، سەرەنجام لە دوای سێ ساڵ لە شەڕ، لە ساڵی ١٩٢١دا سوپای سووری سۆڤێتی توانی بەسەر سوپای سپیدا سەربکەوێت و کۆتایی بە جەنگە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی بهێنێت.

### – سیاسەتی نوێی ئابووری

هەردوو جەنگی جیهانی و جەنگی ناوخۆیی کاریگەرییەکی نەرێنی زۆر گەورەیان بەسەر ئابووری رووسیاوە بەجێهێشت، بۆیە یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی حکومەتی نوێ ئەوە بوو لەڕێی سیاسەتێکی ئابووری نوێی گشتگیرەوە چارەسەری کێشە ئابوورییەکانی وڵات بکات، هەر بۆیە لینین خودی خۆی چاودێری دارشتنی ئەو سیاسەتە ئابوورییە نوێیەی کرد کە لە کۆنگرەی ١٠ی ئازاری ١٩٢١دا پارتی کۆمونیستی سۆڤێتی رایگەیاند، لەم سیاسەتە ئابوورییە نوێیەدا تەواوی لایەنە ئابوورییەکان خرانە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتەوە، بەڵام هەندێك لە چالاکییە تاکەکەسییەکان بە شێوەیەکی کاتی مانەوە، بەتایبەتی لە بواری پیشەسازی و بازرگانی ناوخۆیی سنووردار، هەروەها ئەم سیاسەتە نوێیە هەوڵی دا سوود لە ئەزموونی وڵاتە سەرمایەدارییەکان وەربگرێـت، کە ئەمە توندڕەوەکانی لە دژی لینین وروژاند، بەڵام لینین بەو بیانووەی کە ئەمە تاکە رێگای رزگارکردنی وڵاتە، بەرگری لە بۆچوونەکانی خۆی کرد.

سیاسەتی ئابووری نوێ زیاتر پشتی بە پلانێکی سۆسیالیستی و پلانی پێنج ساڵە بەست، کە ئەمانە بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك و بە سەرکەوتنێکی بەرچاو بەرێوەدەچوو، ئەوە بوو لە بواری کشتوکاڵیدا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا، لە بواری پیشەسازیشدا، سیاسەتی نوێی ئابووری جەختی لەسەر پێشخستنی پیشەسازی قورس دەکردەوە، هەروەها بایەخێکی

زۆریشی بە بەرهەمهێنانی وزە، بەتایبەتیش کارەبا دەدا، جێبەجێکردنی سیاسەتی نوێ لە راستیدا فشار و توندوتیژییەکی زۆری لەلایەن دەسەڵاتی سۆڤێتییەوە ویست، بەتایبەتیش لە سەردەمی ستالیندا، کە بە هەزاران کەسی کردە قوربانیی پیادەکردنی سیاسەتە ئابوورییەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەستکەوتێکی گەورەی بۆ یەکێتی سۆڤێت لێکەوتەوە، کە وایلێکرد بە ماوەیەکی کەم پلەی یەکەمی ئەوروپا بگرێت لە بواری بەرهەمهێناندا، لە جیهانیشدا ببێت بە پلەی دووەم، بۆ نموونە قەبارەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی سۆڤێتی لە **١٩٣٢**دا سێ بەرانبەریساڵی **١٩١٣** بوو، کە هاوشان لەگەڵ ئەو گەشەسەندنە ئابوورییانەشدا، گەشەسەندنێکی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی گەورەش وڵاتی گرتەوە، بە رادەیەك لە سییەکانی سەدەی رابوردوودا ژمارەی خوێندکارانی پەیمانگا تەکنیکییەکان و زانکۆکان و پەیمانگا باڵاکان بەرِادەی سێ بەرانبەر زیادی کردبوو، ژمارەی پەیمانگا و زانکۆکانیش پێنج بەرانبەر زیادی کردبوو.

### – راگەیاندنی یەکێتی سۆڤێت

دوابەدوای سەرکەوتنی سوپای سوور و وەدەرنانی سوپای بێگانە لە خاکی رووسیادا، هەنگاوەکانی جێگیرکردنی وڵات لەناوخۆوە دەستی پێکرد، ئەوەبوو لە ساڵی **١٩٢٢**دا کۆمارەکانی رووسیای یەکگرتوو، ئۆکرانیا و بیلارووسیا و یەکێتی کۆمارەکانی پشتەوەی کافکاس کە لە ئازربایجان و ئەرمینیا و جۆرجیا پێکهاتبوو، دەوڵەتێکی نوێیان دامەزراند کە بە یەکێتی کۆمارە سۆسیالیستە سۆڤێتییەکان ناسرابوو و نزیکەی **١٥** کۆمار و چەند یەکەیەکی سیاسیی تر لەخۆدەگرت، لە ساڵی **١٩٢٣**شدا دەستوورێکی تایبەت بۆ ئەم یەکێتییە دانرا.

### – کێشە ناوخۆییەکانی سۆڤێت

یەکێك لە گرفتە سەرەکییەکانی یەکێتی سۆڤێت، وڵاتە سەرمایەدارییەکان بوون و ترسی سۆڤێت بوو لە دەستێوەردانی ئەو وڵاتانە لە ناوەوەی سۆڤێت، بۆیە لە سۆڤێتدا بەردەوام بەرهەڵستکارەکان بە دەستکردی وڵاتانی دەرەوە و سەرمایەدارەکان لەقەڵەم دەدران و زۆر بێبەزەییانە سەرکەوت دەکران، خاوەن موڵکە فراوانەکان و ئەو کێشانەی کە لە لادێکاندا لە سەرەتای خۆماڵیکردنی زەوییەکاندا دەستیان پێکرد یەکێك بوون لە کێشە ناوخۆییەکانی

سۆڤیێت،لەدوای ئەوەی کە حکومەت سەرجەم زەوییەکانی لە خاوەن موڵکە گەورەکان وەرگرتەوە، چەندین یاخیبوون و جوڵانەوەی چەکدارییانە لە دژی دەسەڵات دەرکەوت، کێشەیەکی تری دەسەڵاتی سۆڤیێت لە ناوخۆدا کێشەی ئەو ململانێ توندە بوو کە لە دوای مردنی لینینەوە لە ساڵی ١٩٢٤ لە نێوان رەوتە جیاجیاکاندا لەسەر دەسەڵات دەرکەوت، بەتایبەتی کێشەی نێوان (ترۆتسکی) و (ستالین)، کە سەرەنجامەکەی سەرکەوتنی (ستالین) و دامەزراندنی دەسەڵاتێکی تاکڕەوانەی ستالینی بوو.

لە دوو بواری تردا، سیستەمی سۆڤیێتی رووبەڕووی بەرهەڵستکاری بووەوە، بوارێکیان بواری ئایینی بوو، چونکە شۆڕش لەڕووی ئایینییەوە کڵێسای ئەرتۆدۆکسی لە تەواوی دەسەڵات و موڵکەکانی داماڵی و هیچ رۆڵێکی سیاسیی بۆ نەهێشتەوە، لەلایەکی تریشەوە لەڕووی فەلسەفییەوە دەوڵەتی سۆڤیێتی لەسەر بنەمای سۆسیالیزم دەڕۆیشت، کە بە هەموو هێزییەوە داوای دوورخستنەوەی کڵێسای دەکرد لە دەسەڵات و بە تەواوی دژایەتیی بانگەشە و سروتە ئایینییەکانی دەکرد و تەواوی دەزگا و ناوەندە فێرکارییەکانی کڵێسای داخست و سەرجەم بۆنە و سروتە ئایینییەکانیشی قەدەغە کردبوو، کە ئەمە بۆخۆی کێشەیەکی قورسی کۆمەڵایەتی بۆ یەکێتی سۆڤیێت نابۆوە و نارەزایەتییەکی زۆر بەرانبەر بەم سیاسەتەی حکومەت لەناو کۆمەڵگادا هەبوو، بۆیە وردە وردە لەدوای ساڵی ١٩٣٦ەوە بواری بۆ لایەنە ئایینییەکان دەرەخساندەوە، لایەنەکەی تریش لایەنی نەتەوەیی بوو، چونکە هەر زۆر خێرا ئاراستەیەکی نەتەوەیی لە ناوچەکانی ئەورووپا بە تایبەت لە وڵاتانی بەلتیك و ئۆکرانیا لەدژی دەوڵەتی سۆڤیێتی دەرکەوت، ئەمە جگە لەوەی کە لە ناوچە ئاسیاییەکاندا هاوپەیمانێتییەکی توند لە نێوان جوڵە ئایینی و جوڵە نەتەوەییەکان لە دژی دەسەڵاتی سۆڤیێتی دەرکەوتن و بەرهەڵستکارییەکی گەورەی ئەو دەسەڵاتەیان دەکرد، ئەمەش وایکرد سۆڤیێت هەر لە ساڵی ١٩٣٨ەوە چەند بڕیارێکی بۆ رەچاوکردنی مافە ئایینی و نەتەوەییەکانی ئەو وڵاتانە دەکرد، لەلایەکی تریشەوە یەکێك لە کێشەکانی دەوڵەتی سۆڤیێتی بریتی بوو لە دەسەڵاتی شمولی تاك پارتیانە، هەروەها سیاسەتی ستەمکاری و بەکارهێنانی توندوتیژی و ئەشکەنجە و کوشتن لەبەرانبەر هاووڵاتیان و پێشێلکردنی مافە مەدەنییەکانی هاووڵاتییەکان بەتایبەت لە سەردەمی ستالیندا.

## – سیاسەتی دەرەکی سۆڤێت

بە حوکمی ئەو گۆشەگیرییەی کە لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە سۆڤێتی گرتبۆوە، سۆڤێت لەڕووی سیاسەتی دەرەکییەوە بەردەوام هەوڵی دەدا سیاسەتێکی میانڕەوانە بەکاربهێنێت تا بتوانێت لەو گۆشەگیرییە رزگاری بێت، ئەوەی یارمەتی سۆڤێتی دا بۆ دەرچوون لەو گۆشەگیرییە، ئەو ململانێ نێودەوڵەتییە بوو کە لەدوای جەنگەوە لە نێو وڵاتانی جیهان هەبوو، تایبەت براوە و دۆڕاوەکانی جەنگ، بۆیە هەر لە سەرەتای بیستەکانەوە یەکێتی سۆڤێت توانی پەیوەندییە ئابووریی و دیپلۆماسییەکانی لەگەڵ چەند دەوڵەتێکی ئەورووپی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ببەستێت،لە ئەوروپا توانی لە ساڵی **١٩٢٦**ەوە پەیوەندی لەگەڵ ئەڵمانیا ببەستێتەوە، لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش توانی پەیوەندی لەگەڵ تورکیا و ئێران و ئەفغانستاندا ببەستێت، دواتریش پەیوەندی لەگەڵ فنلاند و وڵاتانی بەلتیکدا بەست، بەڕادەیەك بەر لە کۆتاییهاتنی دەیەی بیستەمی سەدەی رابوردوو، یەکێتی سۆڤێت پەیوەندییە بازرگانی و دیپلۆماسییەکانی لەگەڵ چەند وڵاتێکی تریشدا بەست لەوانە بریتانیا و فەرەنسا، ئەگەرچی ئەم پەیوەندییانە جێگیر نەبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکێتی سۆڤێت لە سییەکاندا لە چەند کۆبوونەوە و کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتیدا بەشداربوو، لە ساڵی **١٩٣٣**شدا توانی سەرکەوتنێکی دیار لە سیاسەتی دەرەکیدا بەدەست بهێنێت بەوەی کە لەو ساڵەدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دانی بە یەکێتی سۆڤێت دانا، هەر لەو ساڵەشدا توانی پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ ئیسپانیا وئۆراگوای و چەند وڵاتێکی تریشدا ببەستێـت.

بە شێوەیەکی گشتی لە سییەکانی سەدەی رابوردوودا یەکێتی سۆڤێت لە سەرجەم رووەکانی ئابووری و سیاسەتی ناوخۆیی و سیاسەتی دەرەکیدا رۆژ بە رۆژ زیاتر دەچووە پێش و بە رادەیەك بەر لە دەستپێکردنی جەنگی دووەمی جیهان، لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا سەنگی یەکێتی سۆڤێت بەشێوەیەکی زۆر دیار زیادی کرد.

## پێنجەم: ژاپۆن

ژاپۆن یەکێك بوو لەو وڵاتە ئاسیاییانەی، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە هەنگاوە ئابوورییەکانی وردە وردە بەرەو گەشەسەندن دەستیان پێکردبوو و بەرهەمی پیشەسازی و بازرگانی لە ناوەوەی ژاپۆندا برەویان دەسەند و هێڵە ئاسنینەکانی فراوانتر دەبوون، بەڵام هەنگاوی راستەقینەی ژاپۆن زیاتر لە دوای جەنگی ساڵی ١٩٠٤ی رووسی-ژاپۆنییەوە خێرا بوو، کە لێرە بەدواوە رۆڵی بازرگانی و پیشەسازی ژاپۆن تا دەهات لە برەوسەندندا بوو، بۆیە لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهاندا، ژاپۆن وەك یەکێك لە زلهێزەکانی ناوچەکەی خۆی دەرکەوتبوو و چاوی بڕیبووە داگیرکردنی ناوچەکانی دەوروبەری، کە ئەمەش زیاتر لەسەر حسابی داگیرگە ئەڵمانییەکان بوو، کە دواجار هەر لەبەر ئەمەش لە ئابی ساڵی ١٩١٤ەوە ژاپۆن لەپاڵ هاوپەیمانانەوە چووە ناو جەنگی یەکەمی جیهانەوە تا بتوانێت دەست بەسەر داگیرگە ئەڵمانییەکانی زەریای هێمن و ناوچەکانی چیندا بگرێت و لەلایەکی تریشەوە بەر بە فراوانخوازییەکانی ئەمەریکا بگرێت لە رۆژهەڵاتی دوور.

لە راستیدا جەنگی یەکەمی جیهان کاریگەری ئەرێنی بەسەر ژاپۆنەوە هەبوو، چونکە لە رووی ئابوورییەوە بەهۆی پەککەوتنی کارگەکانی ئەوروپاوە، کارگەکانی ژاپۆن قازانجی گەورەیان کرد و بەرهەمهێنان لەژاپۆن تا دەهات زیادی دەکرد و کۆمپانیاکان فراوانتر دەبوون، لە ساڵی ١٩١٧شەوە دوای رووخانی سیستەمی قەیسەری لە رووسیا، بواری زیاتر بۆ ژاپۆنییەکان رەخسا کە لە ناوچەکانی سیبریا فراوانخوازی بکەن، هەرچەندە ئەم فراوانخوازییە ململانێ و ناکۆکیی لە نێو حکومەت و سوپای ژاپۆندا دروست کرد و دواتر بووە مایەی لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی حکومەتەکەی (تیراوشی) کە دوایین دەسەڵاتی ترادیسیۆنی بوو لە ژاپۆن، لێرەشەوە بۆیەکەمجار حکومەتێك لە ژاپۆن بە سەرۆکایەتی (هارای) سەرۆکی پارتی (سایۆکای) دامەزرا، کە لەسەر بنەمای سیستەمی پارتایەتی بێت، چونکە (هارای) سەر بە هیچ بنەماڵەیەکی ئەریستۆکراتی و بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداری ترادیسیۆنی نەبوو، لێرەشەوە سەرەتاکانی لیبرالیزم لە ژاپۆن سەریان هەڵدا.

لەدوای جەنگەوە بووژانەوەیەکی گەورە بەسەر ئابووری ژاپۆندا هات و ژاپۆن لەڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە بە تەواوەتی بەڕووی ناوچەکانی تردا کرایەوە بەتایبەتیش ئەورووپا، کە راستەوخۆ ئەم کرانەوەیە کاریگەربوو لە کولتوور و ئەدەب و تەنانەت شێوازی ژیانیش لە ژاپۆن، لەوێوە ئیتر پیشەسازی بەڕادەیەکی زۆر پێشکەوت و شارە گەورەکان دەرکەوتن و رۆڵی چینی بۆرژوازی و بازرگان و پیشەسازی تادەهات زیاتر دەبوو و هاوکات جیاوازییە چینایەتییەکان قوڵتر دەبوون و ژمارەی کرێکاران و فەرمانبەران و خوێندکاران زیاتر دەبوون، بەمەش کێشمەکێش و ململانێ کۆمەڵایەتییەکان زیاتر و هەمەلایەنتر دەبوون، ئیدی لەم کۆمەڵگە نوێیەدا داواکاری بۆ مافە سیاسییەکان و مافی خۆڕێکخستن و سەندیکاییەکان زۆرتر دەبوون، هەموو ئەمانەش لە کاتێکدا بوون کە ئەو حکومەتەی هارا (١٩١٨-١٩٢١) هەرچەندە لەسەر بنەمای پارتایەتی و سەرەتای لیبرالیزم بوو، بەڵام هیچ هەنگاوێکی بۆ گۆڕانکاری لە دەسەڵاتدا نەنابوو، تا لەگەڵ گەشەسەندن و پێشهاتە نوێیەکاندا بگونجێت، بۆیە لەو ماوەیەدا لە ژاپۆن کێشەی دەستکاریکردنی حکومەت و شێوازی بەڕێوەچوونی دەسەڵات تا دەهات قورستر دەبوو و داواکارییەکانی گۆڕینی سیستەم بۆ سیستەمی هەڵبژاردن و مافەکانی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن زیاتر برەویان دەسەند. بە شێوەیەکی گشتی ئەم ماوەیە لە مێژووی ژاپۆن ماوەی کێشمەکێشە لیبرالییەکان و کرانەوەی دەستووری و هەڵبژاردن و فرەیی و فراوانبوونی پارتەکان بوو، کە هاوتەریب بوو لەگەڵ گەشەسەندنەکانی ژاپۆندا.

بەڵام لەسەرەتای سییەکاندا چەند گۆڕانکارییەکی گەورەی نێوخۆیی و دەرەکی روویان دا کە کاریگەریی گەورەیان هەبوو لەسەر سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی ژاپۆن، کە یەکێکیان قەیرانی ئابووریی جیهانی ساڵی ١٩٢٩ بوو، دوای ماوەیەك لە دەرکەوتنی، ئەم قەیرانە ژاپۆنیشی گرتەوە و زۆر بە خێرایی ژمارەی بێکاران زیادیکرد و بەڕادەیەك رێژەکەی گەیشتە سێ ملیۆن کەس و داهاتی نەختینەیی بەڕادەیەکی بەرچاو دابەزی، هەرچەندە حکومەت لە ساڵی ١٩٣١ەوە وردە وردە توانی ئەم کێشەیە چارەسەر بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پشێوی و شڵەژانێکی گەورەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی لە ژاپۆندا خستەوە، یەکێکی تر لە کێشەکان کە بەرەو رووی ژاپۆن بۆوە لەو ماوەیەدا بریتی بوو لە بووژانەوەی هەستی نەتەوەیی دژ بە ژاپۆن لە مەنشوریا، کێشەی مەنشوریا یەکێك بوو لەو کێشانەی کە دۆخێکی قورسی بەسەر ژاپۆندا هێنا، ئەوە بوو لە سەرەتای سییەکانەوە لە مەنشوریا جووڵانەوەکان دژ بە ژاپۆن دەرکەوتن، کە هاوکات بوون لەگەڵ ئەو قەیرانە داراییەی ژاپۆنی خستبووە شڵەژانێکی ئابووری قورسەوە،

هەر بۆیە سەربازییەکان بۆ دامرکاندنەوەی ئەو جوڵانە و چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییەکانی ژاپۆن، پێداگریان لەسەر ئەوە دەکرد ژاپۆن ناوچەکانی مەنشووریا داگیربکات، ئەمەش بووە هۆکاری ناکۆکی نێوان سوپا و سیاسییەکان لە ژاپۆن، چونکە سوپا لە مێژووی ژاپۆندا سەربەخۆیی تەواوی خۆی هەبوو و راستەوخۆ پەیوەست بوو بە ئیمپراتۆرەوە، ژەنەراڵەکان کاریگەریی راستەوخۆیان بەسەر سیاسەتی ژاپۆنەوە هەبوو، بەڵام بە دەرکەوتنی پارتە سیاسییەکان و زیادبوونی رۆڵیان، رۆڵی سوپا وردە وردە بەرتەسك بۆوە تا کاتی دەرکەوتنی کێشەی مەنشوریا، لەبەر ئەوەی سەربازییەکان ناوچەی مەنشوریایان بە ناوچەی دەسەڵاتی خۆیان دەزانی، بۆیە کاتێك بەرژەوەندییەکانیان لەوێدا کەوتە ژێر هەڕەشەی هەستی نەتەوایەتی چینییەوە، جارێکی تر سەربازەکان خۆیان لە سیاسەتی ژاپۆنی هەڵقورتاندەوە و سەرکێشانە هێرشیان کردە سەر ناوچەکە و ناوچەی (مەگدن)یان داگیرکرد و دەوڵەتی (مەنشۆکۆ)یان لەوێ دامەزراند، ئەمەش بووە هۆکاری کێشەیەکی نێودەوڵەتیی گەورە بۆ ژاپۆن، چونکە لە بەرانبەر ئەم کردارەی ژاپۆندا، نارەزایەتییەکی نێودەوڵەتیی گەورە هاتە ئاراوە و سەرەنجامی کێشەکەش کشانەوەی ژاپۆنی لە کۆمەڵەی گەلان لێکەوتەوە لە ساڵی ١٩٣٣، لە ناو ژاپۆنیش بووە هۆکاری ململانێیەکی توندی نێوان سەرباز و سیاسییەکان، ئەوە بوو هەر لە ئەنجامی ئەو ململانێیەدا، لە کۆتایی ساڵی ١٩٣١دا حکومەتی (داکاتسکی) هەڵوەشایەوە و حکومەتێکی تر بە سەرۆکایەتی (ئەنۆکای) دامەزرا.

حکومەتەکەی (ئەنۆکای) هەوڵی دا لەگەڵ چیندا بکەوێتە گفتوگۆ، بەڵام سەربازییەکان بەم گفتوگۆیە رازینەبوون و سەرەنجامیش لە ساڵی ١٩٣٢دا (ئەنۆکای) تیرۆرکرا، بە تیرۆرکردنی (ئەنۆکای) ئیدی وردە وردە رۆڵی سیاسییەکان کەم دەبووەوە و لە بەرانبەریشدا رێگە بۆ سەربازییەکان واڵا بوو، کە جارێکی تر دەست لە دەسەڵاتی سیاسیی وەربدەنەوە و رۆڵیان لە سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی ژاپۆندا زیاد بکات، بەمەش زیاتر ژاپۆنیان بەرەو سەرکێشییەکان برد، کە ئەم ململانێ سەربازی و سیاسییە تا نزیکەی ساڵی ١٩٣٧ هەروا بە توندی مایەوە.

یەکێکی تر لە رووداوەکانی سییەکان کە کاریگەر بوو بەسەر سیاسەتی ژاپۆنەوە، هاتنەسەرکاری مۆسۆلینی لە ئیتالیا و هیتلەر لە ئەڵمانیا بوو، دوای ئەوەی کە ژاپۆن لە کۆمەڵەی گەلان کشایەوە، دووچاری گۆشەگیرییەکی سیاسیی بوو لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، بۆیە بەدوای هاوپەیمانێکدا دەگەڕا کە لەو گۆشەگیرییە رزگاری بێت، ئەوە

بوو لەو کاتەدا هەریەکە لە مۆسۆلینی و هیتلەر هاتبوونە سەر حوکم و لە سیاسەتەکانیاندا بەڕادەیەکی زۆر لە سیاسەتی ئەو کاتی ژاپۆنەوە نزیك بوون، بەتایبەتی لە دژایەتیکردنی یەکێتی سۆڤێت و بەندەکانی پەیماننامەی ئاشتی ١٩١٩، بۆیە وردە وردە ژاپۆن لەگەڵ ئەڵمانیادا نزیك بۆوە، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٣٦دا پەیماننامەی دژە ئەنتەرناسیۆنالیستی لەگەڵ ئەڵمانیادا بەست، هەرچەندە لە ساڵی ١٩٣٩ هەوڵی دا پەیماننامەیەکی تر لەگەڵ ئەڵمانییەکاندا ببەستێت، بەڵام سەری نەگرت، ئەوە بوو ئەڵمانیا لەگەڵ سۆڤێتدا پەیماننامەیەکی گرێ دا، بەڵام گۆڕانکارییەکانی ئەو ماوەیە وایکرد کە نزیکبوونەوە لە نێوان ئەڵمانیا و ژاپۆن دروست ببێتەوە، دواتریش هەر یەك لە ئەڵمانیا و ژاپۆن و ئیتالیا بە تەواوەتی لە یەکتری نزیك بوونەوە و لە ٢٧ی ئەیلوولی ١٩٤٠دا پەیماننامەیەکی گەورە بەناوی (رۆما-بەرلین-تۆکیۆ) ببەستن.

## شەشەم: ئیتالیا

ئیتالیا یەکێك بوو لەو وڵاتانەی کە لە جەنگی جیهانیدا لە پاڵ هاوپەیمانان بەشدار بوو و بەسەرکەوتوویی لە جەنگ هاتبووە دەرەوە، بەڵام رۆڵی وەکو فەرەنسا و بریتانیا نەبوو، کێشەی ئیتالیا ئەوە بوو، کە پێیوابوو ئەو رۆڵی گەورەی لە جەنگەکەدا گێڕاوە و بەهۆی ئەوەوە هاوپەیمانان سەرکەوتوون، بۆیە دەبێت پشکی شێر لە ئەنجامەکان وەربگرێت، چونکە ئەو خۆی هەر بەو مەبەستە چووبووە شەڕەوە، کە هاوپەیمانان بەپێی پەیماننامەی نهێنیی لەندەن لە ساڵی ١٩١٥ بەڵێنیان پێدابوو، بەڵام هەر وەك پێشتر باس کرا شاندی ئیتالی نەیتوانی لە کۆنگرەی ڤێرسای ئەو دەستکەوتانە بەدەست بهێنێت، کە بۆی چووبوو، بۆیە هەرچەندە چەند ناوچەیەکی بەرکەوت، بەڵام بەلای ئەوانەوە ئەمە بەقەد ئەو زیان و رۆڵە نەبوو، کە ئەوان لە جەنگەکەدا بینیبوویان، بۆیە هەر لە دوای گەڕانەوەی (ئۆرلاندۆ)ی سەرۆکی شاند و سەرۆکی ئەوکاتی وەزیران، کۆتایی بە کابینەکەی هات و کابینەیەکی نوێ بە سەرۆکایەتی (فرانسیسکۆ بینیتی)، سەرۆکی سۆسیالیستەکان دامەزرا، بەڵام بەهۆی بارودۆخی خراپی ئیتالیاوە لەوکاتە، کابینەکەی ئەویش لە ساڵێکدا سێ جار هەڵوەشایەوە و دایمەزراندەوە.

ئیتالیا هەروەکو وڵاتانی تری ئەوروپا لە بارودۆخێکی دژواردا دەژیا، لەلایەکەوە خەڵکی ئیتالیا بە تەواوی لەبەندەکانی ڤێرسای ناڕازیبوون و لەلایەکی تریشەوە بێکاری بە تایبەت دوای چوونەوە ماڵی دوو ملیۆن سەرباز، رۆژ بەڕۆژ زیادی دەکرد، هاوکات بەهای دراویش لە نزمبوونەوەی بەردەوامدا بوو، پیشەسازی ئیتالیاش لە دۆخێکی خراپدا بوو و مانگرتنی کرێکاران لە هەموو شوێنێکی ئیتالیادا بەردەوامی هەبوو، ئەمە جگە لەوەی کە جوتیاران لە خاوەن زەوی و کێڵگە گەورەکان یاخیبوون و لەزۆر جێگە دەستیان بەسەر زەوییەکانیاندا گرتبوو و لە هەندێك شوێنیش کرێکانیان نەدەدانێ، ئەوەی لە هەموو شتێك دژوارتر بوو بۆ ئیتالیا، ئەوە بوو کە لەو کاتەدا حکومەت رۆڵێکی ئەوتۆی نەبوو لە هێورکردنەوەی دۆخەکە و سیاسەتێکی روونی نەبوو بەرانبەر بەم رەوشە، ئەمە جگە لەوەی کە هەر ئیتالیا بۆ خۆی مێژوویەکی قوڵی لە دێمۆکراسیدا نەبوو، بۆیە ئەمە کێشەیەکی گەورەی بۆ سیستەمی دیموکراتی و حکومەتەکانی ئیتالیا لەو ماوەیەدا دروست کرد و لەو ماوەیەشدا قەیرانێکی گەورە لە کابینە وەزارییەکاندا رووی دا و کابینەیەکی جێگیر نەدەهاتە سەر کار.

لەلایەکی تریشەوە هەر لەو ماوەیەدا و بە تایبەت لە نێوان ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٠ کۆمونیزم بە شێوەیەکی بەرچاو لە ئیتالیا بڵاوبووبۆوە، بەتایبەتیش لە ناوچە کشتوکاڵییەکاندا، کە بووبوونە مایەی یاخیبوونی جوتیاران و نانەوەی کێشە بۆ کەرتی کشتوکاڵی لە وڵات، هاوکات لەکایەی پیشەسازیشدا لەوکاتەدا بەدەیان مانگرتن و وەستاندنی کار لەشارە گەورەکاندا هەبوو، کە لە ساڵی ١٩٢٠دا نزیکەی نیو ملیۆن کرێکار مانی گرتبوو، ئەم بارودۆخە بەڕادەیەك دۆخی ئیتالیای شپرزە کردبوو، کە لە ماوەی نێوان ١٩١٩-١٩٢٢ نزیکەی چوار کابینە لە ئیتالیا گۆڕا، بۆیە بەناچاری لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا پاشا ناچار بوو (بەنیتۆ مۆسۆلینی) بۆ پێکهێنانی کابینەیەکی نوێ بانگهێشت بکات.

## - بەنیتۆ مۆسۆلینی

مۆسۆلینی لە ساڵی ١٨٨٣ لە گوندی (فۆرلی) لە ویلایەتی (رۆمانا)ی باکوری ئیتالیا لەدایکبووە، باوکی مۆسۆلینی ئاسنگەر بووە و دایکیشی مامۆستای سەرەتایی بووە، مۆسۆلینیش بۆ خۆی لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا بووەتە مامۆستا و دوای ئەوەش چووەتە سویسرا و لە زانکۆکانی لۆزان و ژنێف خوێندوویەتی، لەوێش پەیوەندیی بە سەندیکا کرێکارییەکانەوە

کردووە و رۆڵێکی باشی لە هاندانی کرێکاران بۆ مانگرتن گێڕاوە، بۆیە حکومەتی سویسرا لە وڵاتەکەی دەریکردوە. کاتێك گەڕاوەتەوە بۆ ئیتالیاش، مۆسۆلینی بەشداری بەرچاوی بووە لەو مانگرتنانەی کە لە ناوچە گوندنشینەکاندا ئەنجام دراون، بۆیە لە ساڵی ١٩٠٨دا دەستگیر کراوە، دوای ئازادبوونیشی، چۆتە فەرەنسا و دواتریش نەمسا، هەر لەبەر ئەو هەڵوێستانەی لەو وڵاتانەش نەماوەتەوە و لە ساڵی ١٩٠٩دا گەڕاوەتەوە بۆ ئیتالیا و لەوە بەدواوە هەفتەنامەیەکی دەرکردووە بەناوی ململانێی چینایەتی.

مۆسۆلینی یەکێك بوو لەو کەسانەی کە رەخنەی لەو هێرشە گرت، کە ئیتالیا لە ساڵی ١٩١١دا کردیە سەر لیبیا، بۆیە لە ئەنجامی ئەو هەڵوێستەیدا ماوەی پێنج مانگ زیندانی کرا. دوای ئازادکردنی، لە کۆتایی ساڵی ١٩١١دا کرا بە سەرنووسەری رۆژنامەی (ئاڤانتین)ی زمانحاڵی پارتی سۆسیالیستی ئیتالیا، لە ساڵی ١٩١٣یشدا مۆسۆلینی خۆی کاندیدکرد بۆ ئەندامێتی پەرلەمان، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهاندا، مۆسۆلینی لەگەڵ ئەوەدا بوو ئیتالیا بێلایەنی بپارێزێت، بەڵام بە کوتوپڕی لە تشرینی یەکەمی ١٩١٤دا ئەم بۆچوونەی گۆڕی و داوای ئەوەی دەکرد کە ئیتالیا لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا بچێتە جەنگەوە، ئەم هەڵوێستەشی لەگەڵ هەڵوێستی پارتی سۆسیالیستی ئیتالیدا دژ یەك بوو، بۆیە هەم لە پارت دەرکرا و هەم لە سەرنووسەری رۆژنامەکەش لابرا و بەوەش تاوانبارکرا کە پارەی لە حکومەتی فەرەنسا وەرگرتووە، دوای ئەمە مۆسۆلینی روویکردە شاری میلان و لەوێ رۆژنامەیەکی نوێی دەرکرد بە ناوی رۆژنامەی (گەل)ەوە، کە تیایدا بانگەشەی بۆ بەشداریکردنی ئیتالیا لە جەنگ دەکرد، هەر لەو ماوەیەشدا بوو کە شانە سەرەتاییەکی فاشیزم لە ئیتالیا وردە وردە پەرەیان دەسەند، ئەوە بوو مۆسۆلینی بوو بە بەرپرسی رێکخراوەی فاشیزم لە میلان. لە ساڵی ١٩١٥دا مۆسۆلینی داوای لەسەرجەم رێکخراوە فاشییەکانی ئیتالیا کرد بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی گشتی، کە نزیکەی ٩ هەزار ئەندام لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوون و سەرەنجامی کۆنگرەکەش داواکردنی بەشدار بوون بوو لەجەنگ. هەر لە ساڵی ١٩١٥دا بوو کە مۆسۆلینی خۆبەخشانە چووە ناو سوپاوە و لەبەر لێهاتوویی زۆر بەخێرایی پلەکانی بڕی و بوو بە عەریف، لە ساڵی ١٩١٧دا مۆسۆلینی لە جەنگدا بریندار کرا، لەدوای چاکبوونەوەی برینەکەی، جارێکی تر دەستی کردەوە بە دەرکردنەوەی رۆژنامەی (گەل)، لە مارتی ١٩١٩دا مۆسۆلینی بانگهێشتی سەرجەم کۆنە جەنگاوەر و ئەفسەرەکانی ئیتالیای کرد بۆ ئەوەی کۆببنەوە و کێشەکانی ئیتالیا

تاوتویێ بکەن، لەو کاتەشدا فاشییەکان وردە وردە لە برەوسەندندا بوون، کە بەشی هەرە زۆریان لە گەنجەکان پێکدەهات، بۆیە هەر لەو ساڵەدا مۆسۆلینی جارێکی تر خۆی بۆ پەرلەمان کاندید کردەوە و لە بانگەشەکانیدا، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە حکومەت زۆر لاوازە و هیچ توانایەکی نییە نە لەڕووی ناوخۆییەوە نە لەڕووی دەرەوە، بەڵام جارێکی تر سەرکەوتوو نەبوو لەوەی بگاتە پەرلەمان.

لە سەرەتادا کە کۆمونیستەکان دەستدرێژیان دەکردە سەر کێڵگە کشتوکاڵییەکان، مۆسۆلینی بێلایەنی خۆی نیشان دا، بەڵام کاتێ زانی کە سەرکەوتوو نابن و تەنها ئاژاوە دەنێنەوە، کەوتە دژایەتیکردنیان و شانە فاشیستییەکانی لە ناوەڕاست و باکووری ئیتالیا دامەزراندەوە و بە پاڵپشتی ئەفسەرە کۆنەکان و خاوەن زەوی و کارگەکان، دەستی کرد بە رووبەڕووبوونەوەی کۆمونیستەکان، لە گوتارەکانیدا مۆسۆلینی خەڵکی و بەتایبەتیش کراس رەشە فاشیستەکانی لە دژی کۆمونیستەکان هان دەدا، لەم کارەی مۆسۆلینیشدا، حکومەت لەبەر ئەوەی هیچ توانایەکی رووبەڕووبوونەوەی کۆمونیستەکانی نەبوو، بە هەموو جۆرێك یارمەتی مۆسۆلینی دەدا، وەك پێدانی چەك و رێگەپێدانیان بۆ بەکارهێنانی ئامێرەکانی گواستنەوە بەخۆڕایی، بەم هەنگاوەش پێگەی فاشییەکان وردە وردە لەنێو کۆمەڵگەدا زیادی دەکرد، هەر بۆیە لە هەڵبژاردنەکاندا ٣٥ کورسی پەرلەمانیان بەدەست هێنا، لەبەر ئەوەی فاشییەکان لەڕێی دروشمەکانیانەوە توانیبوویان لەنێو بەشێکی زۆری کۆمەڵدا بڵاوببنەوە، لەلایەك خاوەن کارگەکان پێیانوابوو لەڕێگەی ئەم بزاڤەوە یاخیبوونی کرێکاران نامێنێت و کرێکارەکان دەگەڕێنەوە سەر کار، خاوەن زەوییەکانیش وایان دەزانی فاشیزم لە هێرش و دەستدرێژی جوتیارەکان دەیانپارێزێت، چینی بۆرژوازیش پێیوابوو لەڕێی ئەمانەوە ئاساییش و جێگیری بۆ وڵات دەگەڕێتەوە، کە ئەوەش لە بەرژەوەندی ئەواندا بوو. لەولاشەوە نیشتمانپەروەرەکان لەوباوەڕەدا بوون کە فاشیزم پێداگرە لەسەر نەتەوایەتی و گەڕانەوەی سەروەرێتی رۆمانی کۆن و بەهێزبوونەوەی وڵات، بۆیە تەواوی ئەم چینانە پشتگیرییان لە فاشیزم دەکرد و لاوەکانیان دەچوونە نێو کراس رەشەکانەوە و بەمەش مۆسۆلینی وەك سمبولی ئاشتی و ئاساییش و سەروەری وڵات دەرکەوت. بە کورتی لاوازی حکومەت و شکستی کۆمونیستەکان لە کۆنترۆڵکردنی وڵات و بوژانەوەی چینی بۆرژوازی و بڵاوبوونەوەی گیانی نیشتمانپەروەری و رقئەستووری بەرانبەر بە کۆنگرەی ئاشتی پاریس، هاوکات ویستی

کۆمەڵگە بۆ  بەدەستهێنانی حکومەتێکی بەهێز سەرجەمیان ڕێخۆشکەر و زەمینەساز بوون بۆ سەرکەوتنی فاشیستەکان.

لە ساڵی ١٩٢١دا بزووتنەوەی فاشیزم وەرچەرخانێکی گەورەی بەسەردا هات، ئەوە بوو لەو ساڵەدا پارتی فاشیستی ئیتالیا ڕاگەیەنرا و لەڕێی بانگەشە و دروشمەکانییەوە، کە تەواو سوودیان لەو دۆخە وەرگرتبوو، توانی خەڵکێکی زۆر لەخۆی کۆبکاتەوە، گرنگترین دروشمی فاشیستەکان ئەوە بوو کە کۆمونیستەکان هۆکاری شکستی وڵاتن و حکومەتیش زۆر لاوازە لە چارەسەرکردنی کێشەکان، ئەمەش وردە وردە پێگەیانی فراوانتر کرد بە ڕادەیەك هەر لەو ساڵەدا مۆسۆلینی داوای لە (فاکتا)ی سەرۆك وەزیر کرد دەست لەکار بکێشێتەوە و کابینەیەکی نوێ دابمەزرێنێت، کە پێنج وەزیری فاشیستی تێدابێت، بەڵام (فاکتا) ئەمەی ڕەتکردەوە، هەر بۆیە لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ لە ناپۆلی کۆبوونەوەی گشتیی فاشیستەکان ئەنجام درا و سەرەنجامیش مۆسۆلینی جارێکی تر هەڕەشەی لە حکومەت کردەوە کە یان دەست لەکار بکێشێتەوە یان ئەوان هێرش دەکەنە سەر ڕۆما و داگیری دەکەن، دوای ئەمەش فاشیستەکان پایتەختیان ئابلۆقە دا و ئەگەری کەوتنەوەی جەنگی ناوخۆیی هاتە پێش، بۆیە پاشا بەناچاری داوای لە (فاکتا) کرد دەست لە حکومەت بکێشێتەوە و مۆسۆلینیشی بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی نوێ بانگهێشت کرد.

## – مۆسۆلینی لەسەر دەسەڵات

کابینەکەی مۆسۆلینی لە سەرەتادا کابینەیەکی ئیئتلافی بوو، بەڵام زۆربەی وەزیرەکانی لە فاشییەکان بوو. دوای ماوەیەك مۆسۆلینی وردە وردە هەنگاوەکانی بەرەو حوکمی تاکڕەوی دەست پێکرد، لەوانە داوای لە پەرلەمان کرد تا کۆتایی ساڵی ١٩٢٣ دەسەڵاتی تاکڕەوانەی پێببەخشێت، دوای ئەوەش پەرلەمانی ناچارکرد کە یاسایەك دەربکات و بەپێی ئەو یاسایە ئەو دەسەڵاتە بە حکومەت ببەخشێت، ئەو فەرمانبەرانە لەسەر کار لابەرێت کە باوەڕیان بە بیروبۆچوونەکانی مۆسۆلینی نییە، هەر لەو سەروبەندەشدا بوو کە مۆسۆلینی گەڵاڵەنامەیەکی دا بە پەرلەمان بە مەبەستی ڕێکخستنەوەی مەرجەکانی هەڵبژاردن کە بە جۆرێك بوو زۆرینە بۆ فاشیستەکان مسۆگەر بکات، ئەوە بوو لە هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٢٤دا فاشیستەکان لە ٦٠٪ی کورسییەکانیان بەدەستهێنا، بەم جۆرەش بەسەر پەرلەماندا زاڵ بوون، دوای ئەوەی

بەسەر پەرلەماندا زاڵ بوون، ئیدی یاسادانان کەوتە دەستی فاشیستەکان و بەپێی ویستی خۆیان یاساکانیان دادەڕشت.

یەکێك لەو هەنگاوە ترسناکانەی کە فاشیستەکان نایان ئەوە بوو کە لە ساڵی ١٩٢٥-١٩٢٦ بەهیچ جۆرێك هەڵبژاردنی شارەوانی و هەرێمییەکان لە وڵاتدا نەمان، بەمەش دەسەڵاتی میللەت بەسەر بەڕێوەبردنە خۆجێیەکاندا نەما، دوای ئەوەش مۆسۆلینی بوو بەو دیکتاتۆرەی کە تەنها بەرانبەر بە پاشا بەرپرسیار بوو نەك بەرانبەر بە پەرلەمان، هەروەها دەسەڵاتی تەواویشی بەسەر هێزی دەریایی و وشکانی و ئاسمانی وڵاتدا سەپاند، ئەو لەڕێی چەند فەرمانێکەوە حوکمی دەکرد کە وەك یاسا وابوون، نەدەبوو هیچ پێشنیارێك بخرێتە بەردەستی پەرلەمان بێ ڕەزامەندی ئەو، دواتریش ئەو نازناوی سەرۆکی حکومەتی لێنرا نەك سەرۆکی وەزیران، هەرچەندە مۆسۆلینی لەم هەنگاوانەیدا رووبەڕووی نارەزایەتی و بەرهەڵستکاری زۆر بووەوە، بەڵام زۆر بە توندی و بە هەموو رێگەیەکی گرتەبەر بۆ سەرکوتکردنەوەیان. جگە لەمانە مۆسۆلینی سانسۆرێکی توندی خستە سەر رۆژنامەگەری و سەرجەم رۆژنامە و راگەیاندنەکانی داخست و تەنها رۆژنامەگەری فاشیستییەکانی هێشتەوە، هەروەها تەواوی پارتەکانی تری داخست و تەنها پارتی فاشیزم مایەوە، هەروەها سەرجەم بەڕێوەبەری خوێندنگا و سەرۆکی زانکۆ و راگری پەیمانگاکان کران بە ئەندامانی فاشیستی، بەهیچ جۆرێك مەرجی توانا و توانستی زانستی بۆ ئەم مەبەستە رۆڵی نەما، بەڵکو تاکە مەرج فاشیستی بوون بوو، هەروەها مامۆستایان ناچار کران سوێندنی (وەلا) بۆ فاشیزم بخۆن، ئەوانەی پێچەوانەی ئەم بڕیارەش بوون لە ئەرکەکەیان دەرکران، سەرەڕای ئەمانەش مۆسۆلینی پۆلیسێکی نهێنی زۆر تۆکمەی بۆ سەرکوتکردنی نەیارانی دامەزراند، کە زۆرجار لەڕێگەی تیرۆر و تۆقاندن و رفاندنەوە کارەکانیان ئەنجام دەدا. بەلای مۆسۆلینییەوە دیموکراسییەت بەسەرچوو بوو، هەروەها لیبرالی و ئازادی بازرگانی و سەرمایەداری و مارکسیزمیش بەسەرچووبوون، ئەو لەبری ئەمانە، داوای یەکێتی نەتەوەیی و دامەزراندنی وڵاتێکی یەکگرتووی دەکرد لە ژێر سایەی سەرکردەیەکی ئازا و زانادا.

## – دەوڵەتی سەندیکایی لە ئیتالیا

فاشیستەکان جەختێکی زۆریان لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی سەندیکایی بەپێی کۆمەڵە بەرهەمهێنەرە سەرەکییەکان دەکردەوە، واتا دەستەجەمعی ژمارەیەك بەرژەوەندی یان کۆمپانیای تایبەت و کۆنترۆڵکردنی بەرژەوەندییە گەورەکان لەلایەن حکومەتەوە، هەروەها کۆنترۆڵکردنی کرێکاران لەلایەن دەوڵەتەوە و دەوڵەتیش ئابووریی نیشتمانی ڕێك بخات، کە مەبەستیان لەم هەنگاوە ئەوە بوو ئیتالیا پشت بە وڵاتانی تر نەبەستێت. لەسایەی سیستەمی فاشیزمدا تەواوی سەندیکا کۆنەکان هەڵوەشێنرانەوە و ڕێکخراوە کرێکارییە فاشیستییەکان شوێنیان گرتنەوە، سەندیکاکان لە سیستەمی فاشیزمدا خاوەنکارەکانیشی لەخۆدەگرت، بۆ سەندیکاکان ئەو کەسانە هەڵدەبژێردران کە حکومەت خۆی داینابوون و هەموو قسەکردنێکیش لەبارەی خۆپیشاندان و مانگرتنەوە قەدەغە بوو، ئەم سیستەمی سەندیکاییە لە ئیتالیا بە قۆناغێکی ئاڵۆزدا تێپەڕی و لە ساڵی ١٩٣٠دا شێوەی کۆتایی خۆی وەرگرت کە سەرجەم لایەنەکانی ژیانی ئابووری بەسەر ٢٢ بەشدا دابەش کرا، هەر بەشێکیش لەمانە سەندیکایەکی تایبەتی بۆ دانرا، کە نوێنەرانی کرێکاران و خاوەنکار و حکومەت واتا (پارت)ی تێدا کۆدەبۆوە بۆ تاوتوێکردنی کێشەکانی کار و کرێ و نرخ، هەروەها نوێنەری سەرجەم سەندیکاکان لە ئەنجوومەنی نیشتمانی کۆدەبوونەوە بۆ داڕشتنی ئەو پلانانەی کە لە توانایاندایە خۆبژێوی ئیتالیا دەستەبەر بکەن، بەڵام لە هەموو کایەکاندا حکومەت خۆی یەکلاکەرەوە بوو، لە هەنگاوی کۆتاییشدا ئەم سەندیکایانە بە تەواوی ئاوێتەی حکومەت بوون، لێرەشەوە فاشیستەکان سەرجەمی کار و پرۆسەی بەرهەمهێنانی وڵاتیان کۆنترۆڵ کرد، کە لە دواجاریشدا لە ساڵی ١٩٣٨دا ئەنجوومەنی ڕێکخراوە سەندیکاییەکان بە تەواوەتی شوێنی پەرلەمانی گرتەوە.

## – قەیرانی دارایی لە ئیتالیا

لەکاتی قەیرانە ئابوورییەکەدا دەسەڵاتی ئابووری ئیتالیا لە توانایدا نەبوو ڕووبەڕووی ئەو قەیرانە ببێتەوە، مۆسۆلینیش بۆ چارەسەرکردنی قەیرانەکە و خۆپەڕاندنەوە لە کێشەکان، تەواوی کێشە ئابوورییەکانی دەخستە ئەستۆی ئەو قەیرانە جیهانییەوە. مۆسۆلینی دەیەویست بەرنامەیەکی چالاك بۆ خزمەتکردنی گشتی و زیادکردنی خۆبژێوی ئابووری دابڕێژێت، کە سەرەتای هەنگاوەکانی بە (جەنگی گەنم) دەستی پێکرد، کە بریتی بوو لە

هەوڵدان بۆ بەرزکردنەوەی بەرهەمە خۆراکییەکان، لەم پێناوەشدا هەوڵی دا زەوییەکان بەپیتتر بکات و زۆلگاوەکان پڕ بکاتەوە وەك زەوی کشتوکاڵی بەکاریان بهێنێت، هەروەها لایەنێکی تری هەوڵەکانی باشترکردنی بەرهەمهێنانی کارەبا بوو، وەك جێگرەوەیەك بۆ خەڵوز و بۆ ئەوەی ئەمانە هاندەرێك بن بۆ بەرەوپێشچوونی پیشەسازی و دامەزراندنی پیشەسازی گەورە، لە ساڵی ١٩٣٣یشدا قەرزێکی درێژخایەنی بەخشییە بوارە پیشەسازییەکان، تایبەت ئەو بوارە پیشەسازییانەی کە لە قەیراندا بوون، لەگەڵ هەموو ئەو هەنگاوانەشدا، قەیرانەکە کاریگەری خۆی هەر هەبوو، بەڕادەیەك لە ساڵی ١٩٣٣دا یەك ملیۆن بێکار لە ئیتالیا هەبوو، بۆیە یەکێك لە هەنگاوەکانی تری مۆسۆلینی کردنەوەی چەند پرۆژەیەك بوو بۆ کەمکردنەوەی بێکاری و هەروەها کاتی کاری بۆ هەشت سەعات لە رۆژێکدا چل سەعات لە حەفتەیەکدا دیاریکرد و کرێی کاریشی بەرزکردەوە، هەرچەندە ئەم هەنگاوانەی مۆسۆلینی تا رادەیەك کاریگەرییان لە کەمکردنەوەی کێشە داراییەکان هەبوو، بەڵام کێشەی حەبەشە لە ساڵی ١٩٣٥ و دەستێوەردانی ئیتالیا لە جەنگی نێوخۆیی ئیسپانیا ١٩٣٦-١٩٣٩ جارێکی تر کاریگەریی خراپیان لەسەر ئابووری ئیتالیا دانا، بە رادەیەك کە سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەی فاشیستەکان لە بواری ئابووریدا، نەیانتوانی گرەنتی ئابووری بۆ تاکەکانی ئیتالیا دابین بکەن.

## – مۆسۆلینی و پاپا

سەبارەت بە پەیوەندیی مۆسۆلینیش لەگەڵ پاپادا، ئەوا مۆسۆلینی توانی کۆتایی بەو کێشەیە بهێنێت کە لە ساڵی ١٨٧٠ەوە لە نێوان پاپا و حکومەتی ئیتالیدا هەبوو، ئەویش بە بەستنی رێککەوتننامەی (لاتیران) شوباتی ساڵی ١٩٢٩ لەگەڵ پاپادا، کە بەپێی ئەو رێککەوتننامەیە، دەسەڵاتی دونیایی پاپا تەنها بەسەر ناوچەیەکی دیاریکراوی ڤاتیکاندا مایەوە، کە رووبەرەکەی ١٠٨ دۆنم بوو، لەوێدا دەوڵەتی سەربەخۆ بۆ پاپا دامەزرا و ئایینزای کاتۆلیکیش بوو بە ئایینزای فەرمی وڵاتەکە، لە بەرانبەریشدا حکومەتی ئیتالیا لەبری ئەو زەوی و زارەی کە هەیبوو قەرەبوویەکی زۆری دا بە پاپا، بەپێی ئەو رێککەوتننامەیەش، پاپا مافی بەستنی پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ وڵاتانی تردا هەبێت، لە ئیتالیاش نە پاپا دەست لە کاروباری حکومەت وەردەدات و نە حکومەتیش دەست لە کاروباری پیاوانی ئایینی.

### – سیاسەتی دەرەوە

لەبارەی سیاسەتی دەرەوەش مۆسۆلینی مەیلی لە دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێك بوو کە بەسەر تەواوی دەریای ناوەڕاست و دەریای ئەدریاتیکیدا زاڵ بێت، کە ئەمەش دەبووە هۆکاری تێکچوونی پەیوەندی ئیتالیا لەگەڵ بریتانیا و فەرەنسا و یۆنان و یوگسلاڤیا، هەرچەندە ئیتالیا لەساڵی ۱۹۳۳دا گەڵاڵەنامەیەکی بۆ وڵاتانی ئەوروپا پێشنیارکرد بۆ هەرەوەزی و یەکگرتوویی لە چارەسەرکردنی کێشە سیاسییەکاندا، بەڵام وڵاتە ئەوروپییەکان پێی رازینەبوون، لە ساڵی ۱۹۳٤یشدا مۆسۆلینی پرۆتۆکۆلی رۆمای لەگەڵ نەمسادا مۆرکرد، کە تایبەت بوو بە هاوکاری بازرگانی.

لە ساڵی ۱۹۳۵ بەدواوە پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئیتالیا روو لە خراپی چوو، چونکە لەو ساڵەدا ئیتالیا هێرشی کردە سەر ناوچەی حەبەشە و داگیریکرد، کە ئەمە بووە هۆکاری کشانەوەی لە کۆمەڵەی گەلان و دووچاری گۆشەگیری سیاسیی کرد، بۆیە لە ساڵی ۱۹۳٦ بەدواوە، ئیتالیا بۆ خۆڕزگارکردن لەو گۆشەگیرییە، لە ئەڵمانیا نزیك کەوتەوە و باڵی (رۆما-بەرلین)یان دامەزراند، دواتریش لە جەنگی ئیسپانیادا ئەڵمانیا لەپاڵ ئیتالیاوە وەك بەشێك لە پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی لەگەڵ سۆڤیێتدا پشتگیریی لە بەرەی فرانکۆ کرد، هەروەك دژایەتی بۆ رووسیای سۆڤیێتی ئیتالیا لە ساڵی ۱۹۳۷یشدا هاوپەیمانێتی لەگەڵ ژاپۆندا گرێیدا.

## حەوتەم: ئەڵمانیا

### – کۆماری ڤایمار

بەدۆڕاندنی ئەڵمانیا لە جەنگی یەکەمی جیهاندا، وڵاتەکە رووبەڕووی کۆمەڵێك کێشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی بووەوە، کە ئەنجامەکەی زنجیرەیەك راپەڕین و شۆڕش بوو لە دژی دەسەڵاتی ئیمپراتۆر ویلیەمی دووەم، کە وەك پێشتر ئاماژەمان پێکردووە، ناچار بوو دەستبەرداری تەخت بێت، دوای رۆیشتنی ئیمپراتۆریش، ئەنجوومەنێکی نیشتمانی لە کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۱۹دا بۆ دانانی دەستووری ئەڵمانی بەسترا، ئەم ئەنجوومەنە بەشێوەیەکی کاتی لە شاری ڤایمار کۆبووەوە، چونکە لەو کاتەدا بەرلین پڕبوو لە کێشە، لە ئەنجامی کۆبوونەوەکانی ئەم ئەنجوومەنەش، کۆمارێکی نوێ هاتە ئاراوە، کە لە مێژووی ئەڵمانیا بە

کۆماری ڤایمار ناسراوە و یەکەم سەرۆکیشی (ئێبەرت) بووە، کە کەسایەتییەکی سۆسیال-دیموکرات بوو، بەپێی ئەو دەستوورەی ئەنجوومەنی نیشتمانی دایںابوو، دەسەلاتی بالاّ لە ئەلّمانیا درابووە رایشتاگ (پەرلەمان) و هەموو سەرۆکی دەولّەت و وەزیرەکان بەرپرس بوون لە بەرانبەر رایشتاگدا، هەر بەپێی ئەو دەستوورە، سەرۆکی ولاّت حەوت سالّ جارێك بەرێی هەلّبژاردنی راستەوخۆوە دەستنیشان دەکرا، کە دەسەلاّتێکی فراوانی هەبوو بەجۆرێك دەیتوانی رایشتاگ هەلّوەشێنێتەوە، یان هەلّبژاردنێکی نویّ رابگەیەنێت، لە حالّەتی نائاساییشدا توانای راگەیاندنی جەنگی هەبوو.

حکومەتی ڤایمار بەپێی ئەو بارودۆخەی کە تیایدا دامەزرابوو، رووبەرووی کۆمەلّێك کێشەی زۆر دژوار بووەوە، چونکە خەلّکی ئەلّمانیا زۆر بەو شکست و دۆڕان و ملکەچییە نیگەران بوون، کە لە سەردەمی ئەماندا بەرانبەر هاوپەیمانان روویان دابوو، هەروەها گەلی ئەلّمانیا پێیان وابوو ئەمان بوون مەرجەکانی ئاگربەستیان قبولّیان کرد و پەیماننامەی ڤێرسایان مۆرکرد، بۆیە وایان دادەنا کە بەرپرسیارێتی سەرجەمی ئەو شکست و ئابڕووچوونەی ئەلّمانیا لە ئەستۆی ئەم حکومەتەدایە و هەموو ئەمانەیان بە پەلّەیەکی رەش بە ناوچەوانی ئەم سیستەمە کۆمارییەوە دەزانی. ئەوەی زیاتر دۆخەکەی بۆ ئەو حکومەتە ئالّۆزتر کردبوو، ئەو دارِمانە ئابوورییە گەورەیە بوو کە ئەلّمانیا لە ئەنجامی جەنگ و قەرەبووەکان و دواتریش لە دەستدانی شاری رۆهەرەوە تێی کەوتبوو، کە لەو کاتەدا ئەلّمانیا لە هەلاّوسانێکی بیّ وێنەدا دەژیا و بەهای مارکی ئەلّمانی بەجۆرێك دابەزیبوو کە پێشتر شتی وەهای بەخۆیەوە نەبینیبوو. هەموو ئەمانە زۆر بە خراپی کاریگەریی خراپیان بەسەر هەلّوێستی گەلی ئەلّمانیاوە هەبوو بەرانبەر بە کۆماری ڤایمار، بۆیە کۆماری ڤایمار بۆ مانەوەی خۆی، دەبوو بەسەر تەواوی ئەم دژوارییانەدا زالّ بێت کە لەتوانایدا نەبوو.

## - هێزە بەرهەلّستکارەکان

هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە، حکومەتی ڤایمار رووبەڕووی زنجیرەیەکی یەك لەدوای یەك لە بەرهەلّستکاری بووەوە چ لەلایەن چەپڕەوەکانەوە یان لە لایەن پارێزگارەکانەوە بێت. سەبارەت بە چەپڕەوکان، لەوکاتەدا کۆمونیستە رادیکالەکان بوون، ئەوان بە شۆڕشی ١٧ی ئۆکتۆبەری رووسی کاریگەربوون و ئەم بیرۆکەیە لە نێو کرێکاران و توێژێکی دیاریکراوی

سەربازاندا، بوو بوو بە بزووتنەوەیەکی کۆمونیستانە و لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٩دا شۆڕشی (سپارت)یان* راگەیاند و توانیان بۆ ماوەیەك بەرلینی پایتەخت بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە و حکومەتێکی کاتی دابمەزرێنن، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت کۆمارییەکان توانیان لەناویان بەرن. یەکێکی تر لە بەرهەڵستکارەکانی کۆماری ڤایمار پارێزگارەکان بوون، ئەوان داوای گەڕانەوەی سیستەمی پاشایەتی و ئەریستۆکراتی سەربازییان دەکرد، ئەمانە هەرچەندە ئیمپراتۆر ویلیەم بۆ هۆڵەندا هەڵهاتبوو، بەڵام ئەوان هەوڵیان دەدا جارێکی تر پاشایەتی و ئیمپراتۆر بۆ ئەڵمانیا بگێڕنەوە. لە مارتی ١٩٢٠دا ئەم پارێزگارانە کۆمەڵێك داواکارییان خستە بەردەم حکومەتی ڤایمار، کە تیایدا داوایان کردبوو کۆنگرەی ڤێرسای رەتبکرێتەوە و کەمکردنەوەی سوپا و چەکداماڵینیش رابگیرێت، ئەم ئاراستەیە لەلایەن هەندێك لە سەربازە دیارەکانی ئەڵمانیاوە پشتگیرییەکی زۆری لێدەکرا و ئەمانیش بۆ ماوەیەك توانیان کۆنترۆڵی پایتەخت بکەن، بەڵام ئاکامێکی وەهایان بەدەست نەهێنا و لە دوائەنجامدا شکستیان هێنا.

بەم جۆرە حکومەتی ڤایمار هەر لە سەرەتاوە رووبەڕووی چەندین کێشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی بووبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەدوای ساڵی ١٩٢٣ەوە بارودۆخی ئابووری و سیاسیی ئەڵمانیا تا ڕادەیەك باشتربوونی بەخۆیەوە بینی، تایبەت دوای ئەوەی (گۆستاڤ شتریسمان) بوو بە راوێژکار، واتا سەرۆك وەزیرانی ئەڵمانیا. بەهاتنی (شتریسمان) حکومەت توانی بەهای مارکی ئەڵمانی بە رادەیەکی بەرچاو بەرزکاتەوە و فەرەنسا بە کشانەوە لە رۆهەر رازیبکات، جگە لەوەی هەر لەو سەردەمەدا و لە ساڵی ١٩٢٦دا ئەڵمانیا بوو بە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان و پێگەی نێودەوڵەتی بۆ گەڕایەوە، بۆیە ماوەی نێوان ساڵی ١٩٢٤-١٩٢٩ ماوەی بووژانەوەی ئابووری و سیاسیی و گەڕانەوەی پێگەی نێودەوڵەتیی ئەڵمانیا بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٢٩دا بەهۆی قەیرانی دارایی جیهانییەوە، ئەڵمانیا جارێکی تر رووبەڕووی کێشە بووەوە.

### – قەیرانی دارایی و کۆتاییهاتنی ڤایمار

ساڵی ١٩٢٩ لەلایەکەوە ساڵی قەیرانی دارایی بوو، لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەڵمانیا ساڵی مردنی (شتریسمان) و بەرەوقەیرانچوونی ئەڵمانیا بوو. دوای مردنی شتریسمان، (براونگ)

---

* لە ناوی شۆڕشی سپارتاکۆسی رۆمانییەوە وەرگیراوە

هاته شوێنەکەی، بەمەش سەردەمێکی نوێ لە کارەساتەکاتی ئەڵمانیا دەستی پێکردەوە، هەر لەو کاتەشدا بوو قەیرانی دارایی لە ئەمەریکا دەستی پێکردبوو و کاریگەرییەکانی وردە وردە وڵاتانی تریشی دەگرتەوە، کە ئەڵمانیا یەکێك لەو وڵاتانەی زۆر بە خێرایی رووبەڕووی کاریگەرییەکانی ئەم قەیرانە بووەوە، چونکە بە دەرکەوتنی قەیرانی دارایی لە ئەمەریکا، زۆر خێرا ئەمەریکا بڕیاری کێشانەوەی تەواوی سامان و قەرزەکانی خۆی لە ئەڵمانیا دەرکرد، کە ئەمە کارەساتێکی گەورەی لە ئەڵمانیا خستەوە، چونکە لەڕووی داراییەوە ئەڵمانیا پشتی زۆر بەو قەرز و سامانە ئەمەریکییە دەبەست، بۆیە ئەم کارەی ئەمەریکا بووە هۆی ئەوەی بەشێکی زۆر لە بانکەکان دەرگا دابخەن و کارگەکان دەست بە دەرکردنی کرێکارەکان بکەن و بەرهەمهێنان بەڕادەیەکی بەرچاو بێــتە خوارەوە و ژمارەی بێکاریش بگاتە چەندان ملیۆن.

بارودۆخەکە بەڕادەیەك ئاڵۆز بوو، کە زۆر ئەستەم بوو بەوەها حکومەتێك چارەسەر بکرێت و ئەم دۆخەش رۆژ بە رۆژ زیاتر کرێکارانی تووشی ترس و دڵەڕاوکێ دەکرد، لەم پێناوەشدا داواکارییەکانیان بۆ باشترکردنی ژیانیان زیاتر دەبوو، ئەم بارودۆخە بەڕادەیەك ئاڵۆز بوو، کە چەندین دیاردەی تیرۆر و تۆقاندن لەلایەن چەند پارتێکی چەپڕەو و راستڕەوەوە لە دژی حکومەت ئەنجام دەدران، کاتێکیش (براونگ) هەوڵی دا ئەو جوڵانە سەرکوت بکاتەوە، ئەوان زۆر بە توندییەوە رووبەڕووی بوونەوە و (براونگ)یش بەمە زیاتر پێگەی خۆی لەدەست دا، لە ساڵی ١٩٣٢شدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئابووری وڵات، (براونگ) خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکانی کەمکردەوە و کەوتە کەمکردنەوەی بیمەی بێکاری و مووچەی فەرمانبەران و خانەنشینان و نەدانی قەرەبووەکان...هتد، کە ئەمانە هەمووی رۆڵیان هەبوو لەوەی کە لە دوای ئەوەی لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٣٢دا کاتێك (هیندنبێرگ) بوو بە سەرۆك کۆمار، لە شوێنی (براونگ)دا، (فۆن بابن) بکات بە سەرۆکی وەزیران.

ئەم حکومەتە نوێیەش رووبەڕووی چەندین کێشەی گەورە بووەوە، کە گرنگترینیان بێکاری و کەمبوونەوەی بەرهەمهێنان و بڵاوبوونەوەی تەوژمێکی توندی توندتیژیی بوون، شان بەشانی ئەو کێشانە لەو کاتەشدا ململانێیەکی قۆرس لەنێوان کۆمونیستەکان و نازییەکاندا دەرکەوت، لە تەمموزی ساڵی ١٩٣٢شدا جارێکی تر هەڵبژاردن کرایەوە، ئەوە بوو لەو هەڵبژاردنەدا هێزی نازییەکان دەرکەوت و لە کۆی ٦٠٨ کورسیدا، ٢٣٠ کورسیان بەدەست هێنا، بۆیە پابن بە مەبەستی راگرتنی دڵی هیتلەر، پێشنیاری کرد کە پلەی جێگری سەرۆکی وەزیرانی پێبدات، بەڵام هیتلەر بەمە رازینەبوو، نازییەکان بەردەوام بوون لە رەخنەگرتن لە حکومەت و ئەو

حکومەتەیان بە حکومەتێکی کۆنەپارێز و دواکەوتوو لەقەڵەم دەدا. لە تشرینی دووەمی ساڵی **١٩٣٢**دا بەهۆی قورسی و ئاڵۆزی کێشەکانەوە، (فۆن بابن) ناچار بوو دەست لەکاربکێشێتەوە و لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا (فۆن شلەیشەر) کابینەیەکی نوێی حکومەتی دامەزراند، کە بەرنامەیەکی پڕ لە بەڵێن و چاکسازیی کۆمەڵایەتی راگەیاند.

لە راستیدا هەریەك لە (فۆن بابن) و (هیتلەر) بەم حکومەتە نوێیە رازینەبوون، ئەوەبوو لە کانوونی دووەمی **١٩٣٣**دا هەوڵەکانیان لە دژی ئەم حکومەتە یەکخست و دوای ماوەیەك لەوەی کە بارودۆخەکە زیاتر ئاڵۆز بوو (شلەیشەر) داوای لە (هیندنبێرگ)ی سەرۆك کۆمار کرد کە پەرلەمان هەڵوەشێنێتەوە و دەسەڵاتی فراوان بدات بە هیتلەر، بەڵام (هیندنبێرگ) لەترسی کەوتنەوەی جەنگی ناوخۆیی بەمە رازینەبوو، هەموو ئەمانە رۆژ بە رۆژ زیاتر رێخۆشکەریان بۆ هاتنە سەرحوکمی هیتلەر دەکرد، لە **٢٨**ی کانوونی دووەمی **١٩٣٣** (شلەیشەر) بەهۆی قورسی بارودۆخەکەوە دەستی لەکار کێشایەوە و دوای دوو رۆژیش لە **٣٠**ی هەمان مانگدا (هێندنبێرگ) هیتلەری بە دامەزراندنی کابینەیەکی حکومەتی نوێ راسپارد، بەمەش کۆتایی بە حکومەتی کۆماری ڤایمار هات و لێرەوە نازییەکان دەستیان بەسەر حوکمی وڵاتدا گرت، کە ئەمە دەستپێکی قۆناغێکی نوێ بوو لە مێژووی ئەڵمانیا.

### – ئەدۆلف هیتلەر و حوکمی نازی لە ئەڵمانیا

ئەدۆلف هیتلەر لە **٢٠**ی نیسانی ساڵی **١٨٨٩**دا لە شاری برنۆ، لە هەرێمی باڤاریا لەدایکبووە، باوکی هیتلەر فەرمانبەر بووە لە بەڕێوەبەرایەتی گومرگ، دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی، لە ساڵی **١٩٠٣**دا چۆتە ڤییەنا و لەوێ بۆیاخچێتی کردووە، لە سەرەتادا هیتلەر حەزی زۆری لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان بوو، بەڵام بۆی نەلوا بچێتە ئەم بوارەوە. لە دەستپێکی جەنگی یەکەمی جیهاندا لە ساڵی **١٩١٤** هیتلەر خۆبەخشانە بوو بە سەرباز لە سوپای باڤاریا، لە ماوەی سەربازیشدا یەکێك بوو لە سەربازە ئازاکان، لە ساڵی **١٩١٧**دا هیتلەر بریندار بوو، لە ساڵی **١٩١٨**شدا بەر غازی ژەهراوی کەوتووە، لەدوای جەنگ لە ساڵی **١٩١٩**دا هیتلەر بوو بە ئەندام لە پارتی کرێکاری سۆسیالیستی نیشتمانی ئەڵمانی، کە بە پارتی نازی ناسرابوو، ئەم پارتە یەکێك بوو لەو پارتانەی ئەڵمانیا کە بەدۆخی دوای جەنگ رازینەبوو، داواکارییە سەرەکییەکانی بریتی بوون لە پووچەڵکردنەوەی کۆنگرەی ڤێرسای و

یەکگرتنی ئەڵمانیا لە دەوڵەتێکی ناوەندی بەهێزدا و دامەزراندنی سوپای نیشتمانی و گێڕانەوەی داگیرگە ئەڵمانییەکان و بەربەرەکانێکردنی جولەکەکان لە بەدەستهێنانی پلە و پایەی گەورە لە ئەڵمانیا.

هەر لە ساڵی ١٩٢١ەوە هیتلەر یەکێك بوو لەو کەسانەی کە لە چەندین بۆنە و شوێنی جیاوازدا رەخنەی لە حکومەتی ڤایمار و سیاسەتی فەرەنسا و پەیماننامەی ڤێرسای دەگرت، ئەم دروشمانەی پارتی نازی و نەکارایی حکومەتی ڤایمار لە چارەسەرکردنی کێشەکان و خراپی بارودۆخی ئابووری و سیاسیی لە ئەڵمانیا، وایکردبوو کە رێژەی ئەندام و لایەنگرانی پارتی نازی رۆژ بە رۆژ لە زیادبووندا بێت، هەربۆیە هیتلەر لە ساڵی ١٩٢٣دا هەوڵی دا کودەتایەك بکا، بەڵام لەم هەنگاوەیدا سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە حوکمی پێنج ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێنرا، کە تەنها نۆ مانگی لە زینداندا بوو و لەو ماوەیەشدا کتێبە بەناوبانگەکەی "خەباتی من"ی نووسی، کە لە دووتوێی ئەم کتێبەدا رایەڵە سەرەکییەکانی بیروڕا سیاسییە رەگەزپەرستانەکەی بە شێوەیەکی زۆر ناڕوون خستۆتەڕوو، کە تیایدا ئاماژە بە باڵایی رەگەزی ئاری بەسەر رەگەزەکانی ترەوە دەکات و قسە لەسەر ئەو جۆرە دەوڵەتە دەکات کە دەیەوێت بۆ ئەڵمانیا دایمەزرێنێت و کارە سەرەکییەکانیشی بە گێڕانەوەی پێگەی ئەڵمانیا و هەڵوەشانەوەی کۆنگرەی ڤێرسای و مەرجی چەکداماڵین و گەڕانەوەی ناوچە لەدەستدراوەکانی ئەڵمانیا دەزانێت.

دوای دەرچوونی هیتلەر لە بەندیخانە ماوەی نێوان ساڵی ١٩٢٤ تا ساڵی ١٩٢٩ ماوەیەکی دژوار بوو بۆ نازییەکان، چونکە لەو ماوەیەدا رووبەڕووی ململانێی نێوخۆیی و پیلانگێڕییەکی زۆر بوونەوە، هەروەها ئەم ماوەیە ماوەی بووژانەوەی ئابووری بوو لە ئەڵمانیا، کە ئەمەش وایکردبوو ئەڵمانەکان کەمتر گوێ بۆ نازییەکان بگرن، بۆیە لەو ماوەیەدا ژمارەی کورسییەکانی نازییەکان لە کەمبوونی بەردەوامدا بوو، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٢٤دا تەنها ٣٢ کورسیان بەدەستهێنا، کەچی لە ساڵی ١٩٢٦دا ژمارەکە بۆ ١٤ کورسی کەمبووەوە، لە ساڵی ١٩٢٨یشدا گەیشتە ١٢ کورسی، بەڵام بە هاتنی قەیرانی ئابووری و شکستە یەك لەدوای یەکەکانی حکومەتی ڤایمار لە چارەسەرکردنی دۆخی ئەڵمانیا، وردە وردە بارودۆخی نازییەکان روو لەباشتربوون چوو، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٣٠دا ژمارەی کورسییەکانیان گەیشتە ١٠٧ کورسی، دواتریش لە ساڵی ١٩٣٢دا بۆ ٢٣٠ کورسی بەرز بووەوە.

نازییەکان بەو بەرنامەیەی کە هەیانبوو، توانیان خەڵکێکی زۆر لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە، لەوانەش داواکردنی هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی ڤێرسای و گەیاندنەوەی ئەڵمانیا بە ریزی زلهێزەکان و یەکگرتنەوەی ئەڵمانییەکان لە نەمسا و چیکۆسلۆڤاکیا و پۆلەندا و دوورخستنەوەی توخم و رەگەزە گومانلێکراوەکانی ئەڵمانیا وەك جولەکە و کۆمونیست و جۆزینییەکان، چونکە ئەوان جولەکەکانیان بە بەرپرسی یەکەمی خراپی دۆخی ئابووری وڵات دەزانی، بەم بەرنامانەش چین و توێژێکی زۆریان لەخۆیان کۆکردبۆوە وەك کرێکاران و فەرمانبەران و وردە بازرگانان و جوتیاران و لاوەکانی ناو سوپا، کە وردە وردە نەکاریی سیستەمی کۆماری و کێشە یەك لەدوای یەکەکانی ئەڵمانیا، زەمینەسازییان بۆ نازییەکان کرد تا دەسەڵات لە ئەڵمانیا بگرنە دەست.

## – هیتلەر و دەسەڵاتی ئەڵمانیا

دوای دەست لەکارکێشانەوەی (شلەیشەر) لە ٣٠ی کانوونی دووەمدا کابینەیەکی نوێ بە سەرۆکایەتی هیتلەر دامەزرا، کە ئەم کابینەیە تەنها دوو وەزیری نازی لەخۆ دەگرت، (فۆن بابن)یش جێگری سەرۆك وەزیران بوو، ئەم بارودۆخە بە هیچ جۆرێك ئەوە نەبوو کە هیتلەر دەیەویست، چونکە هیتلەر ویستی وابوو پارتی نازی بکات بە تاکە پارتی وڵات و خۆیشی ببێت بە سەرۆکی بێ رکابەر، هەر بۆیە زۆر خێرا هەنگاوەکانی بۆ ئەم مەبەستە دەست پێکرد، کە سەرەتاکەی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و ئەنجامدانی هەڵبژاردنی نوێ بوو، لە هەڵبژاردنەکەدا هیتلەر چەند هەنگاوێکی بۆ زامنکردنی بەدەستهێنانی زۆرینە نا، لەوانە پێداگری لەسەر بەڵێنی گەڕاندنەوەی سەروەرییەکانی ئەڵمانیا و بەکارهێنانی توندوتیژی بەتایبەت لەبەرانبەر کۆمونیستەکان و سۆسیال-دیموکراتەکان و بەکارهێنانی دامودەزگا حکومییەکان لە خزمەت پارتی نازی و گۆڕینی ئەفسەرە کۆنەکان بە ئەفسەری نازی و بەکارهێنانی تیپی گەردەلوول (S.S) و هەروەها هەڵکوتانە سەر بارەگای پارتەکانی تر و تۆمەتبارکردنی کۆمونیستەکان بە سوتاندنی رایشتاگ و دەستگیرکردنی بەشی زۆری ئەندامەکانی و نانەوەی ترس لە دڵی پارتەکانی تردا، کە ئەمانە هەمووی بوونە هۆکاری ئەوەی نازییەکان لە هەڵبژاردنی ٥ی ئازاری ساڵی ١٩٣٣دا لە کۆی ٦٤٧ کورسیدا، ٢٨٨

کورسی بەدەستبهێنن و هاوپەیمانێتی لەگەڵ پارتی نیشتمانیدا ببەستن و ئەندامە کۆمونیستەکانیش دووربخەنەوە.

لە ٢٣ی مارتی ١٩٣٣دا هیتلەر یەکێکی تر لە هەنگاوەکانی بۆ زاڵبوون بەسەر دەسەڵاتدا نا ئەویش پێشکەشکردنی پرۆژەیاسایەك بوو بۆ پەرلەمان، کە تیایدا داواکرابوو بێ گەڕانەوە بۆ پەرلەمان حکومەت بۆ ماوەی چوار ساڵ بڕیارەکانی خۆی دەربکات، لەم پێناوەشدا تەواوی ڕێگاکانی بۆ ناچارکردنی ئەندام پەرلەمانەکان بەڕازیبوون لەسەر ئەم پرۆژە یاسایە گرتە بەر، ئەوە بوو پەرلەمان ڕەزامەندی لەسەر ئەم پرۆژە یاسایە دا و بەمەش ڕێگە بۆ هیتلەر خۆش ،بوو حکومەت بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆی و سەرکەوتنی بەسەر نەیار و بەرهەڵستکارەکاندا بەکاربهێنێت، لەم ڕێگەیەشەوە فەزای تیرۆر و کوشتن و بڕین و تۆقاندن بلاوبکاتەوە، ئەمانەش هەمووی وایانکرد کە بەشێکی زۆری پارتەکان خۆیان هەڵبوەشێننەوە، ئەو پارتانەش کە مابوون، بە پارتی نیشتمانی هاوپەیمانی نازییەکانیشەوە، لە تەمموزی ١٩٣٣دا حکومەت بۆ خۆی هەڵیان بوەشێنێتەوە. بەم جۆرەش لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هیتلەر توانی پارتی نازی بکات بە تاکە پارتی وڵات، هەر لە میانەی هەوڵەکانی هیتلەردا بۆ کۆکردنەوەی دەسەڵات لەژێر دەستی خۆی و کەمکردنەوەی نەیارەکانی، هیتلەر بڕیاری دا تەواوی سەندیکا و کۆمەڵە و یەکێتییە کرێکارییەکان هەڵبوەشێنێتەوە و لەبری ئەوانیش بەرەی کرێکارە نازییەکان دابمەزرێنێت، کە ئەم بەرەیە لەژێر باڵی نازییەکاندا کاری دەکرد و سەرجەم کرێکارانی ئەڵمانیای ناچارکرد ببن بە ئەندامی ئەم بەرەیە.

هەر بەپێی یاساش نازییەکان گۆڕانکارییەکی زۆریان لە حکومەتی ئەڵمانیادا کرد، لەوانە لە ساڵی ١٩٣٤دا یاسایەك دەرکرا، کە بەپێی ئەو یاسایە سەرجەم ئەنجومەنە میللییەکان هەڵوەشێنرانەوە و دەسەڵاتەکەیان درا بە حکومەتی رایشتاگ و تەواوی دەسەڵاتەکانی ویلایەتەکان خرایە ژێر چاودێری حکومەتی ناوەندییەوە و حاکمی ویلایەتەکانیش ڕاستەوخۆ لەژێر دەستی وەزیری ناوخۆدا بوون، لەلایەکی تریشەوە هیتلەر کاروباری ئایینی وڵاتیشی خستە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتەوە، بەپێی ڕێککەوتنێك کە لە ساڵی ١٩٣٣دا کرا، نە دەوڵەت دەست لە کاروباری کڵێسا وەردەدا و نە کڵێساش دەست لە کاروباری سیاسیی وەردەدا، پارتی ناوەندی کاتۆلیکیش بەپێی یاسایەك هەڵوەشایەوە، بەڵام پەیوەندیی نێوان کڵێسا و نازیزم تا دەهات بەرەو خراپی دەچوو و تایبەت دوای ساڵی ١٩٣٧ کاتێك (پاپا پیۆسی یانزەیەم) نازییەکانی بە دوژمنی مەسیح و کڵێسا تاوانبار کرد، لێرەشەوە هەزاران پیاوی ئایینی

کاتۆلیکی لە ئەڵمانیا خرانە زیندانەوە، سەبارەت بە پرۆتێستانتییەکانیش، هیتلەر هەوڵیدا هەموویان لەژێر ناوی کڵێسای دەوڵەتدا یەکبخات و یەك سەرۆك ئوسقوف لە ئەڵمانیا هەبێت ئەویش نازی بێت، بۆیە بەشێکی زۆری پیاوانی ئایینی بەرهەڵستکاری ئەم بڕیارە بوون، بەڵام نازییەکان زۆربەیانیان لەزیندانەکاندا قایم کرد. لەبارەی جولەکەکانیش ئەوا بە تەواوەتی لە کۆمەڵگە دابڕێنرابوون، لە سەرەتاوە کارەکانی وەك پزیشکی و پارێزەری و مامۆستایی و رۆژنامەوانیان لێ قەدەغە کرا، لە ساڵی ١٩٣٥یشدا بەپێی یاساکانی نۆرمبێرگ لە رەگەزنامەی ئەڵمانی بێبەش کران و ژن و ژنخوازیشیان لەگەڵ ناجولەکەدا لێ قەدەغە کرا، دواتریش بە هەموو رێگەیەك هەوڵی پاکتاوکردنیان درا.

جگە لەم لایەنانە، تەواوی لایەنەکانی تری کۆمەڵگە لە راگەیاندن و بڵاوکراوە و فیلم و شانۆ و هونەر و مۆسیقا لەلایەن نازییەکانەوە کۆنترۆڵ کرا بوو و وەزارەتی رۆشنبیریش لەدەستی کەسایەتییەکی نازی توندڕەودا بوو، هەروەها لە بواری فێرکاری و رێکخراوە خوێندکارییەکانیشدا سەرجەم ئەو کەسانە دوورخرانەوە، کە ئاری نەبوون و دڵسۆزی نازییەکان نەبوون، لەلایەکی تریشەوە بابەتەکانی جوگرافیای سیاسی و جیۆپۆلەتیك و زانستی بەرگری لە پرۆگرامەکانی خوێندندا زیادکران و مێژوو و بایۆلۆژیش لە خزمەت زەقکردنەوەی رەگەزپەرستیدا خرانەگەڕ. بۆ جێبەجێکردنی تەواوی ئەو هەنگاوانەی باس کران، نازییەکان دەزگایەکی پۆلیسی نهێنی گەورەیان بەناوی "گستاپۆ"وە دامەزراندبوو بۆ راوەدوونان و تۆقاندنی نەیارەکانیان بە دەیان بەندیخانە و سەربازگەی دەستگیرکردنی گەورە گەورەیان دامەزراندبوو، لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی تەواوی کۆمەڵگەی ئەڵمانی بخەنە ژێر رکێفی خۆیان و بە ویستی خۆیان ئاراستەی بکەن، رێکخراوەیەکی تایبەتیان بە منداڵانی نێوان تەمەنی ١٠-١٥ ساڵان و لاوانیش لە نێوان ١٥-١٨ ساڵان دامەزراندبوو کە تیایدا پرەنسیپەکانی نازیان پێدەگوتنەوە.

دوای هەموو ئەمانە هیتلەر هەنگاوەکانی بەرەو لە ناوبردنی بەرهەڵستکارەکانی لەناو پارتی نازیدا دەست پێکرد و کەوتە لەناوبردنیان، لەوانە لەناوبردنی "ئێرنست رۆهەر" سەرۆکی "S.S" کە نزیکترین هاوڕێی خودی هیتلەر بوو، هەروەها لەناوبردنی ٤٠٠ کەسی تر هەر لەو رووداوەدا، کە بەپیلانگێڕی دژی دەوڵەت تۆمەتبار کرابوون. بەم جۆرەش هیتلەر وردە وردە بەرەو لوتکەی دەسەڵات دەڕۆیشت، بەتایبەت لەدوای مردنی هێندنبێرگی سەرۆك کۆمار لە ئابی ١٩٣٤دا، ئیدی هیتلەر لە یەك کاتدا سەرۆکی کۆمار و سەرۆك وەزیرانی وڵات بوو،

که دواتریش رایگەیاند که به "Fuhrer" ناسرابوو واتا "ڕێبەر" بناسرێت. له ١٩ی ئابی ١٩٣٤یشدا به له ٩٠٪ی دەنگەکان به ڕێبەری وڵات هەڵبژێردرا. بەمەش بەر له کەوتنەوەی جەنگی دووەمی جیهان، هیتلەر بوو به یەکێك له سەرکردە دیارەکانی ئەوروپا، که وردە وردە هەنگاوەکانی بەرەو لێك هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیوەندییە نێودەوڵەتییەی که هەبوو، دەستی پێکرد و له پێناو گێڕانەوەی مەزنێتی ئەڵمانیا و هەڵوەشاندنەوەی کۆنگرەی ڤێرسای و دروستکردنی ئەڵمانیایەکی گەورەدا جیهانی بەرەو جەنگی دووەمی جیهان ئاراستە کرد.

## هەشتەم: قەیرانی دارایی ١٩٢٩-١٩٣٣

یەکێك لە ڕووداوە گرنگەکانی نێوان هەردوو جەنگ ئەو قەیرانە گەورەیە بوو، کە بەسەر ئابووریی جیهاندا هات و کاریگەریی گەورەی بەسەر لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی زلهێزەکانەوە هەبوو، سەرەتای قەیرانەکە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە دەرکەوت، کە زۆر بە کتوپڕی لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٩دا بازاڕی دراو و بۆرسەی نیویۆرك ڕووبەڕووی قەیرانێکی گەورە بووەوە، لەو ڕۆژەدا دابەزینێکی بێ وێنەی نرخی پشکە ئابوورییەکان لەو بازاڕەدا ڕووی دا و زیانێکی ملیۆنەها دۆلاری لێکەوتەوە، لەوێشەوە ڕۆژ دوای ڕۆژ بازاڕی پشك و دراوی جیهانی شڵەژان و داتەپینی بەخۆیەوە دەبینی، لە ئاکامی ئەم ڕووداوەدا نرخی کاڵاکان تا دەهات لە دابەزیندا بوون و ژمارەی مایەپووچبوونی بانکەکانیش ڕۆژ بە ڕۆژ لە بەرزبووندا بوو و بێکارانیش بە بەردەوامی زیادیان دەکرد، ئەگەرچی بەشێك لە سیاسەتمەدار و ئابووریناسان لەو کاتەدا پێیانوابوو ئەم قەیرانە، قەیرانێکی کاتییە و وەکو سەرجەم قەیرانەکانی پێشووتر بە خێرایی تێدەپەڕێت، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەم قەیرانە لە ساڵی ١٩٢٩ەوە تا ساڵی ١٩٣٣ بەردەوام بوو و شوێنەوارەکانیشی تا ساڵی ١٩٣٥ هەر مابوو، ئەم قەیرانە بە پێچەوانەی قەیرانەکانی ترەوە لە ئەنجامی زۆری بەرهەمەوە بوو نەك کەمی بەرهەم. سەبارەت بە هۆکارەکانی ئەم قەیرانەش، بەپێی بۆچوونە جیاوازەکان چەند خاڵێك هۆکاری ئەم قەیرانە بوون، کە بریتین لە:

١. هەندێك لە ئابووریناسان پێیانوایە کەمی زێڕ لە جیهان کە بنەمای ئاڵوگۆڕی نێودەوڵەتیی جیهانی بوو، وایکردووە نرخ دابەزێت، بەڵام هەندێکی تریان زیادبوونی زیو و کەمبوونی بەهاکەی بەهۆکاری ئەم قەیرانە دەزانن، لەبەر ئەوەی زۆربوونی زیو بووەتە هۆی کەمبوونەوەی توانای کڕینی ئەو وڵاتانەی کە بە دراوی زیو مامەڵە دەکەن، ئەم کەمبوونەوەیەی توانای کڕینەش لە ئنجامدا بووەتە هۆکاری تێکچوونی بازرگانیکردن.

٢. هۆکارێکی تری ئەم قەیرانە زۆربوونی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان بوو لە دوای جەنگەوە، چونکە جوتیارانی ئەمەریکا لە دوای جەنگیش هەر بە هەمان شێوەی سەردەمی جەنگ بەرهەمیان دەهێنا و ڕۆژ بە ڕۆژ بەروبوومەکانیان زیاتردەکرد، بەو نیازەی کە بازاڕی بەردەوامی هەیە، بەڵام وەستانی جەنگ وایکردبوو ئەو بازاڕەی پێشووتر بەروبوومە

کشتوکاڵییە ئەمەریکییەکان هەیانبوو، وردە وردە روو لەنەمان دەچوو، چونکە ئەو وڵاتانە لەدوای جەنگەوە بۆ خۆیان بەروبوومی کشتوکاڵییان روو لەزیادبوون چوو، بۆیە بەروبوومە ئەمەریکییەکان بەرەبەرە بازاڕیان نەدەما، ئەمەش دەبووە هۆکاری ئەوەی رۆژ بە رۆژ نرخی ئەو بەروبومە کشتوکاڵییانە بێتە خوارەوە و لە دواییشدا کەرتی کشتوکاڵی تووشی گرفتی ئابووریی دەکرد و جوتیارەکان لە بری قازانج تووشی زیان دەبوون و ئەمەش توانای کڕینییانی کەم دەکردەوە. کەمبوونەوەی توانای کڕین لای جوتیاران و گرفتی کەرتی کشتوکاڵ راستەوخۆ کاریگەر دەبوو بەسەر کەرتی پیشەسازیشەوە، چونکە کەمبوونەوەی توانای کڕینی ئەوان، بازاڕی بەرهەمە پیشەسازییەکانیشی کەم دەکردەوە، لێرەشەوە تا دەهات کاڵا پیشەسازییەکان کەڵەکە دەبوون و نرخیان دادەبەزی، ئەوکات کارگەکان ناچار دەبوون کە بڕی بەرهەم و تێچوون کەم بکەنەوە، کە یەکێك لەو رێگایانە کەمکردنەوەی سەعاتی کار و دەرکردنی کرێکاران بوون لە کارگەکان، کە ئەمانەش دەبوونە هۆی زیادبوونی بێکاری، واتا بە زیادبوونی بێکاریش بەشێکی تر لە کۆمەڵ توانای کڕینی نەدەما، لە ئەنجامدا ئەمەش کاریگەر دەبوو بەسەر هەردوو کەرتی کشتوکاڵی و پیشەسازیدا، ئیدی لە بازاڕدا بەرهەم زۆر دەبوو، بەڵام کڕین کەم دەبوو، کە دواجار ئەمە قەیرانێکی ئابووری گەورەی دەخستەوە و رۆژ بە رۆژ بێکاری لە بازاڕدا زیاتر دەکرد.

٣. هۆکارێکی تری قەیرانەکە زیادبوونی داهێنانەکان بوو، چونکە لەکاتی جەنگدا داهێنانێکی زۆر هاتبووە ئاراوە، ئەم داهێنانەش دواتر کاریگەریی لەسەر زۆربوونی بێکاری دەبوو، هەروەها ئەو ئامێرە نوێیانە دەبوونە هۆکاری زیاتربوونی بەرهەم و کەڵەکەبوونیان لە بازاڕدا، بۆیە کارگەکان زۆریان بە ناچاری دەرگای کاریان دادەخست و بەمەش ئەوەندەی تر بێکاری زیادی دەکرد، هەروەها لەو ماوەیەدا گرنگییەکی زۆر بە چەند بەرهەمێکی نوێی گرانبەها دەدرا و تا دەهات لە بازاڕدا زیادی دەکرد، بۆ نموونە ئۆتۆمبێل، لە بەرانبەریشدا ئەو سەردەمە سەردەمی دوای جەنگ و کەمبوونەوەی دراو و زێڕ و کێشە ئابوورییەکان بوو، بۆیە توانای کڕینی ئەمجۆرە بەرهەمە رۆژ بە رۆژ لە کەمبووندا بوو، لە بەرانبەریشدا بەرهەمەکە تا دەهات زیادی دەکرد، کە ئەمەش خواستی لەسەر ئەو بەرهەمانە کەمتر دەکرد، لێرەشەوە جارێکی تر قەیرانەکەی فراوانتر دەکرد.

٤. دوای سەربەخۆبوونی چەند وڵاتێك لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە، ئەو وڵاتانە دەستیان بە بەرهەمهێنانی ناوخۆیی کرد و سیاسەتی هاندانی بەرهەمهێنانی نێوخۆییان

پیادەکرد و باجی زۆریان خستە سەر بەرهەمە هاوردەکان، واتا فرۆشی بەرهەمەکانی وڵاتە پیشەسازییە گەورەکان، کە جاران لەو ناوچانەدا بازاڕێکی گەرمی هەبوو، لێرە بەدواوە ئەو بازاڕی وردە وردە لە کورتی دەدا و ئەمەش لە دواجاردا کاریگەریی نەرێنی بەسەر بازرگانی نێودەوڵەتییەوە دەبوو.

٥. هۆکارێکی تر لە هۆکارەکانی ئەم قەیرانە، کێشەی قەرەبوو و قەرزەکانی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهان بوو، چونکە لەلایەکەوە بەشێکی زۆر لە وڵاتان بەدەست قەرزێکی زۆرەوە دەیانناڵاند، لەلایەکی تریشەوە دۆڕاوەکانی جەنگ هەم بەدەست قەرزەوە دەیانناڵاند هەم قەرەبوویەکی زۆریشیان لەسەر بوو، کە کاریگەریی گەورەی لەسەر توانای ئابوورییان دانابوو، کە ئەمانە هەمووی کاریگەر بوون لەسەر کەمکردنەوەی بازاڕی وڵاتە پیشەسازییەکان لەم وڵاتانەدا و کەڵەکەبوونی بەرهەمەکانیان بەهۆی بێ بازاڕییەوە و دواجار دابەزینی نرخ.

کاریگەری ئەم قەیرانە زۆر بەخێرایی لە ئەمەریکاوە پەڕییەوە بۆ وڵاتانی تر، بەتایبەتیش وڵاتانی ئەوروپا، بەر لە هەمووانیش نەمسا و ئەڵمانیا، چونکە ئەم دوو وڵاتە هەر لە سەردەمی جەنگەوە لە دۆخێکی ئابووریی شێواودا بوون، هەرچەندە لە نێوان ساڵانی ١٩٢٤-١٩٢٩دا تا رادەیەك بەهۆی قەرزەکانی ئەمەریکاوە بووژانەوەیان بەخۆیانەوە دیبوو، بەڵام ئەم قەیرانە زۆر بە خێرایی پەڕییەوە بۆ ئەو دوو وڵاتە و کاریگەرییەکانی بە قورسی لەسەر ئەم دوو وڵاتە کەوتنەوە، چونکە ئەو دوو وڵاتە راستەوخۆ پشتیان بە قەرز و سەرمایەکانی ئەمەریکا دەبەست، بەڵام دوای ئەوەی کە ئەمەریکا قەیران گرتییەوە، قەرز و سەرمایەکانی لەو وڵاتانەدا کێشایەوە، کە ئەمە وایکرد زۆر بە خێرایی بانکی ناوەندی نەمسا دووچاری کێشەیەکی دارایی قورس ببێتەوە و نەتوانێت رووبەڕووی کێشە داراییەکانی ببێتەوە، ئەمەش راستەوخۆ کاریگەریی بەسەر بازاڕی ئەوروپیدا دەبوو، چونکە لەو کاتەدا وڵاتانی ئەوروپای ناوەڕاست وابەستەی بانکی نەمسایی بوون، بۆیە ئەمە زیانێکی گەورەی بەر ناوچەکە خست، بۆیە حکومەتی نەمسایی زۆر بە خێرایی بەهانای بانکی ناوەندییەوە چوو و هەروەها بریتانیاش قەرزێکی زۆری پێبەخشی بۆ ئەوەی بە تەواوی مایەپووچ نەبێت، هەرچەندە بانکی نەمسایی مایەپووچبوونی خۆی رانەگەیاند، بەڵام زیانێکی دارایی گەورەی لێکەوت. ئەڵمانیاش دوای کشانەوەی سەرمایەکانی ئەمەریکا، رووبەڕووی دۆخێکی دارایی زۆر خراپ بووەوە، بەشی هەرە زۆری کارگەکان رووبەڕووی قەیرانی دارایی بوونەوە، تەنانەت نەیان دەتوانی قەرزەکانیشیان بدەنەوە، بۆیە بەشێکی زۆر لەو کارگانە دایانخست، هەرچەندە

حکومەتی ئەڵمانی لەوکاتەدا هەوڵی دا لەڕێی قەرزی بێگانەوە چارەسەری هەندێك لە کێشە ئابوورییەکانی بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی تووشی بێ متمانەیی بووبوو، بۆیە ئەم هەنگاوە زۆر قورس بوو.

ئەم قەیرانەی ئەڵمانیا و نەمسا راستەوخۆ کاریگەریی لەسەر وڵاتانی تری ئەورووپا و ئەمەریکاش هەبوو، چونکە سەرمایەی بریتانی رۆڵێکی گەورەی لە بیناکردنەوەی ئەڵمانیا و نەمسادا دەگێڕا، بۆیە ئاسایی بوو ئەگەر ئابووریی بریتانیاش بە قەیرانی دارایی ئەڵمانیا و نەمسا کاریگەر بێت، جگە لەوەی ئەمەریکاش بەم دۆخە کاریگەر دەبوو لەبەر ئەوەی بەشی هەرە زۆری سەرمایەکانی لە ئەڵمانیا و نەمسا وەگەڕ خرابوون و ئەو وڵاتانە بازاڕێکی گەرمی بەرهەمەکانی ئەو بوون، لەلایەکی تریشەوە ئەم قەیرانەی ئەڵمانیا و نەمسا کاریگەریی لەسەر فەرەنساش هەبوو، چونکە فەرەنسا بەشێك لە داراییەکەی پشتی بەو قەرەبووانە دەبەست کە لەو وڵاتانەوە بۆی دەهات و دوای ئەم قەیرانە ئیدی دانی ئەم قەرەبووانە تا رادەیەك قورس بوو، هەر بۆیە هۆڤەری سەرۆکی ئەمەریکا لەو کاتەدا بڕیاری دا بۆ ماوەی ساڵێك وەرگرتنەوەی قەرەبووەکانی لە ئەڵمانیا رابگرێت، کە دواتر وڵاتەکانی تریش هەمان هەنگاویان گرتەبەر.

لەلایەکی ترەوە بریتانیا لەبەر ئەوەی بەرژەوەندییەکانی زۆر بەربڵاوبوون و داراییەکەی زۆر پشتی بە بازرگانی نێودەوڵەتی دەبەست، زۆر بەخێرایی دووچاری ئەو قەیرانە بووەوە و بەشێکی زۆر لە وڵاتان متمانەی خۆیان لە لەندەن کێشایەوە و بریتانیا بە رادەیەك بەم قەیرانە کاریگەر بوو کە حکومەت بە هەموو جۆرێك هەوڵی دا رووبەڕووی ببێتەوە و چارەسەری بکات، ئەوە بوو لە ئەیلوولی ١٩٣١دا بریتانیا لە بنەمای زێڕ هاتە دەرە و ناچاربوو نرخی کاڵاکانی لە بازاڕە دەرەکییەکاندا دابەزێنێت و بەهای دراوی خۆی بێنێتە خوارەوە. لەلایەکی تریشەوە کاریگەرییەکانی ئەم قەیرانە ئەگەرچی تا رادەیەك بە درەنگەوە بوو، بەڵام فەرەنسایشی گرتەوە و وردە وردە رێژەی بێکاریش لە فەرەنسا زیادیکرد و فەرەنساش ناچار بوو لە بنەمای زێر بکشێتەوە و کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر ژیانی ئابوورییەوە هەبوو. بەڵام تاکە وڵات کە بەم قەیرانە کاریگەر نەبوو، یەکێتی سۆڤێت بوو، چونکە لەو کاتەدا سۆڤێت لەسەر بنەمای سۆسیالیستی دەڕۆیشت و پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە بازاڕ و بازرگانی جیهانییەوە نەبوو.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم قەیرانە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی وڵاتە زلهێزەکانەوە هەبوو، ئەوە بوو لە ماوەی چوار ساڵدا بە ملیۆنەها دۆلار زیان لەو وڵاتانە کەوت و داهاتی ساڵانەی هەر یەکێك لەو وڵاتانە بە ملیۆنەها دۆلار هاتە خوارەوە و ژمارەیەکی زۆر لە بانکەکان مایەپووچ بوون بۆ نموونە تەنها لە ناو ئەمەریکادا شەش هەزار لقی بانك لە کار وەستان، جگە لەوەی چەندین کارگە و کۆمپانیای گەورە لە کارەکانیان وەستان و داخران، هاوکات ڕێژەی بێکاری بە ڕادەیەکی ترسناك زیادیدەکرد، بە جۆرێك لە ساڵی ١٩٣٢دا تەنها لە ئەمەریکا دوازدە ملیۆن بێکار هەبوو، لە ئەڵمانیاش ڕێژەی بێکاریش گەیشتبووە شەش ملیۆن، لە بریتانیاش سێ ملیۆن کەس بێکار بوون، لە فەرەنساش ملیۆن و نیوێك بێکار هەبوو، سەرەڕای ئەم زیانە ئابووری و کۆمەڵایەتییانە، هاوکات ئەم قەیرانە کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی وڵاتاندا هەبوو.

لە ڕووی سیاسەتی ناوەوە کاریگەریی ڕاستەوخۆ و سەرەکی ئەم قەیرانە دەستێوەردانی حکومەت بوو لە ئابووری وڵات، چونکە بەهۆی ئەم قەیرانەوە حکومەت ڕێگەی بەخۆیدا کۆنترۆڵی نرخ بکات و بەشێکی زۆر لە دامەزراوەکان میللی بکات و سیاسەتی خۆسەپاندن بەسەر ئابووری وڵاتدا بسەپێنێت، کە ئەمەش ڕاستەوخۆ پێچەوانەی بنەماکانی لیبرالیزم و سیستەمی دیموکراسییە، بۆیە لەوکاتەدا سیستەمی دیموکراسی لە بەشی هەرە زۆری وڵاتاندا ڕووبەڕووی قەیرانێکی گەورە بووەوە و نەکارایی حکومەتەکان لە چارەسەرکردنی قەیرانەکەدا، ناجێگیری بەردەوامی لە سیستەمی حوکم نایەوە، ئەمە جگە لەوەی لەم وڵاتانەدا کە سیستەمی دیموکراسییان لە چاو وڵاتەکانی تردا نوێ بوو، وەك ئەڵمانیا و ئیتالیا و ژاپۆن، سیستەمی دیموکراسی بە تەواوەتی لەبەریەك هەڵوەشا و سیستەمە دیکتاتۆرییەکانی وەك فاشیزم و نازیزم و حوکمی سەربازییەکان شوێنیان گرتنەوە.

لەڕووی دەرەکیشەوە، بە پلەی یەکەم کاریگەرییەکانی ئەم قەیرانە ئەوە بوو کە ئابووری خۆبژێوی لە ناو وڵاتاندا زاڵ بوو و لە هەر وڵاتێکدا بانگەشە بۆ بەرهەمە خۆماڵییەکان و دوورکەوتنەوە لە بەرهەمە بیانییەکان دەکرا، ئەمەش دەبووە هۆکاری دابەزینی پەیوەندییە نێودەوڵەتی و هاریکارییە ئابوورییەکان بە ڕادەیەکی زۆر، بەجۆرێك بەپێی لێکدانەوەی شتومەکی هاتووی ٧٥ وڵات لە نێوان ١٩٢٩-١٩٣٣ بازرگانی جیهانی بە ڕادەی ٦٩٪ کەمی کردبوو، کە وردە وردە ئەم سیاسەتە حکومەتەکانی بە ئاقاری خۆبەزلزانین دەبرد، لێرەشەوە وڵاتەکان بەرەو خۆگرژکردنەوە و بەناوخۆداچوون ڕۆیشتن، بە ڕادەیەك لەو کۆنگرە

نێودەوڵەتییەدا کە لە ساڵی ١٩٣٣ بە مەبەستی چارەسەرکردنی قەیرانی دارایی بەسترا، ئەم سیاسەتی خۆبەلزانین و بەناوخۆداچوونەی وڵاتان هەر لە سەرەتاوە کۆنگرەکەی بەرەو شکست برد، ئەمە جگە لەوەی هەر ئەم سیاسەتە سەرەنجامەکەی دەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی ئابووری بوو، کە هەر وڵاتێك سەرقاڵی کاروباری نێوخۆی بوو، بەهەموو جۆرێك کێشە نێودەوڵەتییەکانی وەلا دەنا، کە ئەمە لە دوا ئەنجامدا وایکرد کاریگەریی لەسەر خودی چالاکییەکانی کۆمەڵەی گەلانیش هەبێت و ئەم رێکخراوە نێودەوڵەتییە بەهۆی ئەم سیاسەتەوە رۆژ بە رۆژ لاوازتر بێت و متمانەی خۆی لەدەست بدات، چونکە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و هاوکارییەکانی نێوان وڵاتان لەدەست چووبوو، کە ئەم دۆخەش لەناوەوە و لە دەرەوە وردە وردە رێخۆشکەری بۆ دەرکەوتن و بەهێزبوونی سیستەمە دیکتاتۆرییەکان دەکرد، کە بێ ئاگایی ئەم وڵاتانە بواری پێدان چیان دەوێت ئەنجامی بدەن.

لەولاشەوە قەیرانی دارایی رۆڵێکی زۆری گێڕا لە دابەشکردنەوەی جیهان بەسەر دوو جەمسەردا، چونکە ئەم قەیرانە بووە هۆکاری کەوتنەوەی دوو جۆر وڵات، یەکێکیان ئەوانە بوون کە خاوەن ئابووری و داگیرگە و سەرچاوە سروشتییە گەورەکانی جیهان بوون و توانیان بەسەر قەیرانەکەدا زاڵ بن بەبێ ئەوەی کاریگەریی لەسەر سیستەمی سیاسیی وڵاتیان هەبێت، کە ئەوانیش بریتانیا و فەرەنسا و ئەمەریکا بوون، بەرەکەی تریشیان ئەو بەرەیە بوون کە بە تەواوی قەیرانی دارایی بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئەوانی شڵەژاند، چونکە ئەو وڵاتانە هەر بۆخۆیان لە دۆخێکی ئابووری خراپدا بوون، کە ئەمانیش ئەڵمانیا و ژاپۆن و ئیتالیا بوون، کە هەرسێکیان ئەو سێ وڵاتە بوون کە لە رووی ئابوورییەوە بەهۆی سیاسەتی فەرەنسا و بریتانیا و ئەمەریکاوە لەدۆخێکی خراپدا بوون، هەروەها ئەو سێ وڵاتە بوون، کە لە بنەماکانی ڤێرسای ناڕازیبوون، کەواتە قەیرانی دارایی بە تەواوی کاریگەر بوو لەسەر جارێکی تر دوولەتکردنەوەی جیهان بەپێی بەرژەوەندییەکان و دروستکردنی ئەو دوو جەمسەرەی کە لە دوا ئەنجامدا جەنگی جیهانی دووەمیان هەڵگیرساند.

# بەشی چوارەم

## قەیرانەکانی نێوان هەردوو جەنگ

لە سییەکانی سەدەی رابوردوودا کۆمەڵێك رووداو روویان دا، کە کاریگەرییەکی ترسناکیان بەسەر رەوشی ئاشتییانەی جیهانەوە هەبوو، لەوانەش دەرکەوتنی چەند دەسەڵاتێکی تاکڕەوانە لە ئەوروپا، وەك باس کرا لە بیستەکانەوە مۆسۆلینی لە ئیتالیا و لە سییەکانیشەوە هیتلەر لە ئەڵمانیا، هاوکات بەهێزبوونی رەوتە سەربازییەکانیش لە ژاپۆن، کە ئەمانە بە سیاسەتەکانیان وردە وردە بوون بە ترس لەسەر دۆخی جێگیری جیهان و دونیایان بەرەو جەنگ برد، لەلایەکی تریشەوە ئەو بارودۆخەی کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە بەسەر جیهاندا هاتبوو، هۆکارێکی تری بەرەو نائارامیچوونی جیهان بوو، چونکە وەکو گوترا لەدوای کۆنگرەی ڤێرسایەوە، جیهان بەپێی بەرژەوەندی وڵاتە براوەکان دەچووە رێوە، کە سەرەنجام ئەو بارودۆخە نارەزایی بەشێکی وڵاتانی جیهانی لێکەوتەوە، چونکە لە لایەکەوە بەپێی رێککەوتننامەکانی کۆنگرەی ئاشتی مەرجێکی زۆر خرابووە سەر وڵاتە دۆڕاوەکان بەتایبەتیش ئەڵمانیا و لەلایەکی تریشەوە هەندێك لە وڵاتە براوەکان لەو دابەشکارییەی کۆنگرەی ڤێرسای رازینەبوون، تایبەت ئیتالیا و ژاپۆن، کە ئەم سێ وڵاتەش لە ناوەڕاستی سییەکانەوە وەك سێ زلهێزی سەرەکی لەسەر شانۆی سیاسیی و نێودەوڵەتی دەرکەوتن، یەکێکی تر لەو دیاردانەی کە لە سییەکاندا ئاشتی جیهانی خستە مەترسییەوە، ناکارایی و لاوازی کۆمەڵەی گەلان بوو لە پاراستنی ئاشتی نێودەوڵەتی و چارەسەرکردنی کێشەکانی نێو وڵاتان، کە نەیدەتوانی وڵاتان لە هێرشە دەرەکییەکان بپارێزێت، کە زۆر جار ئەو وڵاتانە ئەندامی خودی کۆمەڵەکەش بوون، سەرەنجام ئەم لاوازییەش فەزایەکی لە بێسەرو بەرەیی و ئاڵۆزی نایەوە و وردە وردە وای لە وڵاتان کرد کە لە پەیمانە نێودەوڵەتییەکان پاشگەز ببنەوە، سەرەنجام ئاوێتەبوونی ئەو هۆکارانەی باس کران لە نێوان سالانی **١٩٣١-١٩٣٩**دا چەندین

قەیرانی گەورەیان خستەوە لەوانە هێرشی ژاپۆن بۆسەر مەنشووریا و هێرشی ئیتالیا بۆسەر حەبەشە، دواتریش سەرپێچییەکانی ئەڵمانیا و هێرشەکانی بۆسەر ناوچەکانی نەمسا و چیکۆسلۆڤاکیا و پۆڵەندا، کە دواجار ئەمانە جیهانیان بەرەو جەنگی دووەمی جیهانی برد.

## یەکەم: قەیرانی مەنشووریا

گەشەکردنەکانی ژاپۆن لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە بەدواوە و دەرکەوتنی شۆڕشی پیشەسازی لەوێدا وایکردبوو کە ژاپۆنییەکان ویستی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێکی مەزنیان لادروست بێت، لەو کاتەشدا ناوچەی مەنشووریا کە یەکێك بوو لە ناوچە دەوڵەمەند و پڕ بەروبوومە سروشتییەکان و بازاڕێکی باشیش بوو، زۆر خێرا بوو بە شوێنی چاوتێبڕینی ژاپۆنییەکان. هەر بۆیە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە ژاپۆنییەکان دەستیان بەسەر چەند ناوچەیەکی مەنشووریادا گرت، دواتریش لە جەنگی ١٩٠٤-١٩٠٥دا لەگەڵ رووسیا، ژاپۆن توانی چەند ئیمتیازێك لە مەنشووریا بەدەست بهێنێت، لەوانە راکێشانی هێڵی ئاسنین، کە بەهێزی ژاپۆنی بپارێزرێت، لە جەنگی یەکەمی جیهانیشدا، ژاپۆن توانی پێگەیەکی ئابووری زیاتر لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی دوور دابمەزرێنێت و نفوزێکی گەورەش لە چین، تایبەت لە ناوچەی مەنشووریا و مەنگۆلیا دابمەزرێنێت، بەم جۆرە زۆر لە زووەوە ناوچەی مەنشووریا یەکێك بوو لەو ناوچانەی کە بایەخێکی زۆری بۆ ئابووری ژاپۆن هەبوو و بە بەردەوامی ژاپۆنییەکان بە ناوچەی نفوز و دەسەڵاتی خۆیان دەزانی، لە سییەکانی سەدەی بیستەمیشدا قەیرانی دارایی کێشەیەکی ئابووری گەورەی بۆ ژاپۆنییەکان نایەوە، بۆیە یەکێك لە هەنگاوەکانیان بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، فراوانکردنی نفوزیان بوو لە ناوچەی مەنشووریا وەك بازاڕێکی دەرەکی و هاوکات شوێنی بەدەستهێنانی کەرەستەی خاو، کە ئەمیش لەکاتێکدا بوو لە مەنشووریا هەستی نەتەوایەتی بە رادەیەکی زۆر بووژابۆوە و تا دەهات زیاتر دژایەتی ژاپۆنیان دەکرد، یەکێك لەو کردارانەی بەرانبەر ژاپۆنییەکان ئەنجامیان دا تەقاندنەوەی بۆمبێك بوو لەسەر هێڵی ئاسنی مەنشووریا لە نزیك شاری مۆگدن، ئەم بۆمبە ئەگەرچی زیانێکی زۆری نەبوو، بەڵام ژاپۆنییەکان وەك بیانوویەك بەکاریان هێنا بۆچوونە ناوەوەی مەنشووریا، ئەوە بوو لە ١٨ی ئەیلوولی ١٩٣١دا بەبێ

بەرگرییەکی ئەوتۆ، دەستیان بەسەر ناوچەی مەنشووریادا گرت و حکومەتێکی سەربە ژاپۆنیان بەناوی حکومەنی مۆنشکۆوە لەوێ دامەزراند، کە ئەمەش کێشەیەکی گەورە بوو رووبەڕووی چینییەکان بووەوە.

چین لەو کاتەدا دەسەڵاتی وەڵامدانەوەی سەربازی نەبوو، بۆیە ناچار بوو کێشەکە بداتە کۆمەڵەی گەلان و گفتوگۆکانی لەگەڵ ژاپۆندا رابگرێت، تا ئەو کاتەی لە مەنشووریا دەکشێتەوە، بەڵام لەو کاتەدا ژاپۆن بەهۆی باڵادەستی رەوتی سەربازییەکانەوە نەك ئامادە نەبوو بکشێتەوە، بەڵکو تا دەهات زیاتر لەناو خاکی چیندا پێشڕەوی دەکرد و دەسەڵاتی زیاتر دەکرد، ئەوە بوو لە مارتی **١٩٣٣**دا سوپای ژاپۆنی تا نزیك دیواری چین رۆیشت و لە ساڵی **١٩٣٥**یشدا چوونە ناو پەکینەوە، دواتریش لە ساڵی **١٩٣٧**دا زۆربەی ناوچە گرنگەکانی چینیان داگیرکرد و جەنگێکی گەورە کەوتەوە کە تا جەنگی دووەمی جیهان هەر بەردەوام بوو و بوو بە بەشێك لە رووداوەکانی جەنگی دووەمی جیهانی .

سەبارەت بە هەڵوێستی کۆمەڵەی گەلانیش لەبارەی ئەم کێشەیەوە سەرەتا زۆر بەدڵگرمییەوە کێشەکەی وەرگرتبوو و دەیەویست خۆی لەم کێشەیەدا بسەلمێنێت، بەڵام دواجار وردە وردە دەرکەوت کە ناتوانێت کێشەکە چارەسەر بکات، ئەوە بوو لە سەرەتادا لیژنەیەکی بۆ ئەم مەسەلەیە بە سەرۆکایەتی (لۆرد لاپتۆن)ی بریتانی دامەزراند، لیژنەکەش کارەکەی ژاپۆنی ئیدانەکرد و راپۆرتێکی لە ٢٤ی شوباتی **١٩٣٣**دا بۆ کۆمەڵەی گەلان نووسی و تیایدا پێشنیاری دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی بۆ مەنشووریا لەژێر سایەی چین کردبوو، بەڵام ژاپۆن بەم پێشنیارە رازینەبوو و ئامادە نەبوو سوپای خۆی لە ناوچەی مەنشووریا بکشێنێتەوە نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو لە دوا ئەنجامیشدا کشانەوەی خۆی لە کۆمەڵەی گەلاندا راگەیاند. هۆکاری ئەم لاوازییەی کۆمەڵەی گەلانیش لەم کێشەیەدا دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە کۆمەڵەی گەلان نە یەکێتی سۆڤێت و نە ئەمەریکای تێدا نەبوو، کە دوو زلهێزی سەرەکی ئەوکات بوون. سەبارەت بە بریتانیاش ئەوا بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی هەڵسوکەوتی دەکرد، بۆیە بەرژەوەندییەکانی خۆی لە ناوەڕاستی چیندا بوون نەك مەنشووریا، ئەمەش وایکردبوو بێباکانە مامەڵە لەگەڵ کێشەکەدا بکات، بۆیە کۆمەڵەی گەلان لە چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەدا شکستێکی گەورەی هێنا، کە ئەمە کاریگەرییەکی زۆر خراپی بەسەر هەیبەتی کۆمەڵەی گەلانەوە بوو و هاندەرێك بوو بۆ وڵاتە زلهێزەکانی تر کە هەمان هەنگاوەکانی ژاپۆن بگرنە بەر، ئەوە بوو هەر لەو ماوەیەدا ئیتالیا ئەم لاوازییەی کۆمەڵەی گەلانی قۆستەوە و هێرشی کردە ناوچەی حەبەشە و داگیری کرد.

## دووەم: هێرشی ئیتالیا بۆسەر حەبەشە ١٩٣٥-١٩٣٦

شکستی کۆمەڵەی گەلان لە کێشەی مەنشووریا و هەڵوێستە لاوازەکەی هاندەرێکی گەورە بوون بۆ مۆسۆلینی کە دەست بە فراوانخوازییەکانی بکات، لەم بوارەشدا سەرەتا هێرش بکاتە سەر حەبەشە.

فراوانخوازی لە ئەفریقا یەکێك بوو لەو ویستانەی کە تەواوی سەرکردە ئیتالییەکان لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەوە دەیانویست بەدیبهێنن، تایبەت فراوانخوازی لە ناوچەی حەبەشە، بەڵام ئەم ویستە لە جەنگی عەدوای ساڵی ١٨٩٦دا شکست یهێنا، دوای ئەوەی ئیتالییەکان نەیانتوانی لەو جەنگەدا سەرکەوتوو بن، دوای ئەوەی فاشیستەکان هاتنە سەرحوکم، جارێکی تر هەوڵەکانی بەدیهێنانی ئەم ویستە دەرکەوتەوە، چونکە یەکێك لە دروشمەکانی فاشیستەکان گێڕانەوەی سەروەریی ئیتالیا بوو، کە تۆڵەسەندنەوەی جەنگی عەدواشیان بە یەکێك لە ئەرکەکانی خۆیان دەزانی.

لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٤ رووداوی وال وال رووی دا، کە ئەم رووداوە بووە بیانوویەك بۆ ئیتالییەکان بۆ هێرشکردنە سەر ناوچەی حەبەشە، رووداوەکە لە بنەڕەتدا لە سەر سنووری نێوان سۆماڵی ئینگلیزی و سۆماڵی ئیتالی و ناوچەی حەبەشە روویدا، ئەوە بوو لەو ناوچەیەدا پێکدادانێك لە نێوان هێزی ئیتالی و هێزی حەبەشەدا کەوتەوە، هۆکارەکەیشی ئەوە بوو ئایا ئەم ناوچەیە سەر بە حەبەشەیە یان سەر بە ئیتالیایە، ئەگەرچی لەم پێکدادانەدا ئیتالیا توانی دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرێت، بەڵام سی کوژراوی لە رووداوەکەدا هەبوو، بۆیە ئەم کوژراوانەی کردە بیانوویەك بۆ ئەوەی کێشە لەگەڵ حەبەشەدا بنێتەوە و داگیری بکات، بۆیە ئەگەرچی دەستی بەسەر ئەو ناوچەیەشدا گرتبوو، کە جێی ناکۆکی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیتالیا داوای لە حەبەشە کرد کە بە فەرمی داوای لێبوردن بکات و قەرەبووی زیانەکانی ئیتالیا بکاتەوە، بەڵام حەبەشە بەمە رازینەبوو، بۆیە کێشەکەی خستە بەردەست کۆمەڵەی گەلان.

کۆمەڵەی گەلانیش هەنگاوی یەکەمی ئەوە بوو کە هەردوولا پابەند بن بەو پەیمانە دۆستانەیەی کە لە ساڵی ١٩٢٨دا بەستوویانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە کێشەکە لە کۆمەڵەی گەلان بوو و ئیتالیا نیازخراپی خۆی نەدەشاردەوە و سوپایەکی نزیکەی ٢٠٠ هەزار کەسی لە

ناوچەکە کۆکردبۆوە، دوای ئەوەی کە حەبەشە داواکارییەکانی ئیتالیای جێبەجێ نەکرد و ئیتالیاش لە چارەسەرەکانی کۆمەڵەی گەلان رازینەبوو، ئەوە بوو مۆسۆلینی لە ٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٥دا بڕیاری دا جەنگ لە دژی حەبەشە رابگەیەنێت، بۆ رۆژی دواتریش دەستی بە هێرشەکانی کرد و لە ٥ی مایسی ساڵی ١٩٣٦دا پایتەختی حەبەشە، (ئەدیسەبابا)ی، داگیرکرد و (هیلا سیلاسی) ئیمپراتۆری حەبەشە بۆ بریتانیا هەڵهات و لەجێی ئەو (ڤیکتۆر ئەمانوئێلی سێیەم) بوو بە ئیمپراتۆری حەبەشە.

سەبارەت بە هەڵوێستی کۆمەڵەی گەلانیش دوای ئەوەی ئیتالیا پێشنیارەکەی رەتکردەوە، ئەوە بوو حەبەشە جارێکی تر کە زانی ئیتالیا نیازی هێرشکردنی هەیە، لە کانوونی یەکەمی ١٩٣٤دا داوای تری پێشکەش بە کۆمەڵەی گەلان کردەوە، بەڵام هیچ دەستکەوتێکی وەهای نەبوو، بۆیە جارێکی تریش لە مارتی ١٩٣٥ و لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٥یش داوای تری پێشکەش بە کۆمەڵەی گەلان کرد، ئەوە بوو کۆمەڵەی گەلان بڕیاری دا لیژنەیەك بۆ ئەم مەبەستە پێکەوە بنێت و لە ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٥دا لیژنەکە لە کارەکانی بووەوە و رایگەیاند کە ئیتالیا دەستدرێژیکەرە و بڕیاریی سزای ئابووریی بەسەریدا سەپاند و داوای لە وڵاتانی ئەندامی کۆمەڵەی گەلان کرد چەك و زەخیرە و یارمەتی دارایی پێنەدەن، بەڵام ئەم بڕیارەی کۆمەڵەی گەلان هەر لە لایەن خودی ئەندامەکانەوە پێشێل کرا، چونکە هەریەك لە فەرەنسا و بریتانیا ئامادە نەبوون، ناردنی ئاسن و خەڵوز و پەترۆل کە لە مادە یاساغەکان بوون، بۆ ئیتالیا رابگرن، ئەمەش بووە هۆکاری پووچەڵبوونەوەی سزا ئابوورییەکە و دواتریش لاوازکردنی پێگە و دەسەڵاتی کۆمەڵەی گەلان، هەر بۆیە لەو کاتەدا هەریەك لە فەرەنسا و بریتانیا چارەسەرێکی مامناوەندیان دانا، کە بەپێی ئەم چارەسەرە بەشێکی یەکجار زۆری حەبەشە دەدرا بە ئیتالیا، بەڵام ئەم چارەسەرەی کە لەلایەن هەردوو وەزیری دەرەوەی فەرەنسا و بریتانیا دانرابوو، کاتێك کە لەنێو نێوەندی سیاسیی هەر یەك لەو دەوڵەتانەدا ئاشکرا بوو، بەرهەڵستکاری و ناڕازییەکی زۆری بۆ پەیدا بوو و رەخنەی زۆری لێگیرا، بۆیە هەریەك لەو دوو وەزیرە ناچار بوون دەست لەکار بکێشنەوە، کەواتە نە چارەسەرەکەی کۆمەڵەی گەلان و نە چارەسەری زلهێزەکان نەیانتوانی کێشەی حەبەشە و ئیتالیا چارەسەر بکەن، بە پێچەوانەوە، ئیتالیا دوای ئەوەی کە کۆمەڵەی گەلان سزاکانی دەرکرد، بڕیاری دا لە کۆمەڵەی گەلان بکشێتەوە، لێرەشەوە دەستی بە فراوانخوازییەکانی کرد لە حەبەشە، تایبەت دوای ئەوەی کە ئەڵمانیا چووە ناو ناوچەی راینەوە و فەرەنسا و ئینگلیز سەرقاڵی ئەو ناوچانە بوون و ئیتر

ئیتالیا بۆ خۆی لە فراوانخوازییەکانی ئەو ناوچەیە دەستوالاّ بوو، ئەم هەنگاوەی ئیتالیاش هاندەرێکی باش بوو بۆ ئەڵمانیا کە دەست بە فراوانخوازییەکانی بکات و لێرەشەوە ئەڵمانیا و ئیتالیا وردە وردە لێك نزیك ببنەوە و باڵی نازی و فاشی یان رۆما-بەرلین دامەزرێنن.

## سێیەم: هەنگاوەکانی ئەڵمانیا بەرەو جەنگ

ئەڵمانیا دەمێك بوو دەستی بە دژایەتیکردنی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان و هەنگاونان بەرەو پووچەڵکردنەوەی بەندەکانی ڤێرسای کردبوو، بەتایبەتی لە سییەکانەوە دوای ئەوەی کە کۆمەڵەی گەلان لە تەواوی کێشەکانی وەك کێشەی چەکداماڵین و ئاشتیپاراستن و چارەسەرکردنی کێشەکان بە ئاشتی شکستی هێنابوو و وەك رێکخراوەیەکی نێودەوڵەتی متمانەی خۆی لەدەست دابوو، تەنانەت خودی ئەندامەکانیشی باوەڕێکی ئەوتۆیان پێنەمابوو، ولاّتە زلهێزەکانیش کێشەکانی خۆیان بە بەردەوامی لە دەرەوەی ئەم کۆمەڵەیەدا چارەسەر دەکرد و تەنها لەپێناو بەرژەوەندییەکانیان پەنایان بۆ کۆمەڵەی گەلان دەبرد و وەکو بینرا هەندێکیشیان لەپێناو ئامانجەکانیاندا لە کۆمەڵەکە پاشەکشەیان کرد.

هەروەکو پێشتر باس کرا، کە چۆن قەیرانی ئابووریی وەها دۆخێکی خستەوە کە نازییەکان وردە وردە لە دەسەلاّت نزیك ببنەوە و دوا ئەنجامیش لە ساڵی **١٩٣٣**دا بە تەواوی هیتلەر دەست بەسەر دەسەلاّتی ئەڵمانیادا بگرێت، کە باسکرا یەکێك لە ئامانجەکانی هیتلەر و پارتەکەی پووچەڵکردنەوەی ڤێرسای و کشانەوە لە پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان بوو، بۆیە هەر لە تشرینی یەکەمی **١٩٣٣**ەوە لە بەندەکانی چەکداماڵین کشایەوە و دواتریش کۆمەڵەی گەلانی لەوە ئاگادار کردەوە کە نیازی کشانەوەی هەیە لە کۆمەڵە و لەو کاتەشەوە بەشداریی کۆبوونەکانی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەدەکرد، هیتلەر هەر بە هاتنی یەکێك لە سیاسەتەکانی، گۆڕینی ئەو سیاسەت دۆستانەیە بوو، کە (شتریسمان) لەبەرانبەر رۆژئاوادا پەیڕەوی دەکرد بۆ سیاسەتێکی دژکارانە، کە دواتر وردە وردە ئەم سیاسەتەی لەگەڵ رەوتی رووداوەکاندا روون بۆوە، بۆیە هەر خێرا بەشێك لە ولاّتە ئەوروپییەکان خۆیان بۆ رووبەڕووبوونەوەی ترسی هیتلەر و نازییەکان ئامادە کرد بەر لە هەموویانیش یەکێتی سۆڤێت، ئەوە بوو هەر لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٤ەوە گفتوگۆکانی لەگەڵ رۆمانیا و پۆلەندا بۆ کەمکردنەوەی کێشە سنوورییەکانی

دەست پێکرد و هاوکات لە مایسی هەمان ساڵیشدا پەیماننامەی دەستدرێژینەکردنی لەگەڵ پۆلەندا نوێکردەوە، هەر لەو ساڵەشدا بوو کە سۆڤێت بوو بە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان.

لەلایەکی تریشەوە هەر لە چوارچێوەی رووبەڕووبوونەوەی مەترسییەکانی نازیزمی ئەڵمانیا، فەرەنسا هەوڵی دا لە ساڵی **١٩٣٤**دا گەلاڵەنامەی هاوکاریی وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات مۆربکات، بەڵام پۆلەندا ئەم جۆرە گەلاڵەنامەیەی رەتکردەوە و ئەوە بوو فەرەنسا لەم رووداوەدا شکستی هێنا، بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم شکستەش پەنای بردە بەر ئیتالیا، بەڵام ئیتالیاش یەکێك بوو لەو وڵاتانەی کە لە کۆنگرەی ئاشتی و فەرەنساش نیگەران بوو، چونکە ئەوانی بە بەرپرسی یەکەمی بێبەشبوونی لە کۆنگرەی ئاشتی دەزانی، بۆیە هێندەی لە ئەڵمانیا نزیك بوو بۆ دەستکاریکردنی ڤێرسای، هێندە گوێی بۆ فەرەنسا نەگرت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فەرەنسا بۆ ئەوەی کێشەکانی لەگەڵ ئیتالیا کۆتایی پێبهێنێت، لە **١٩٣٣**دا لە ئیتالیا نزیك بووەوە و لە **١٩٣٥**یش بەپێی رێککەوتنێك لە نێوانیاندا، ئیتالیا توانی دەست بەسەر ناوچەکانی تەرابلوسی رۆژئاوا (لیبیا) و ئەریتریا و سۆماڵی ئیتالیدا بگرێت و چەند دەستکەوتێکی تریش لە ئەفریقا بەدەست بهێنێت.

ئەمانە هەمووی لەکاتێکدا بوون، کە ئەڵمانیا لەو کاتەدا تا دەهات بە نهێنی خۆی پڕچەك دەکرد و وڵاتانی رۆژئاواش درکیان بەم هەنگاوانەی ئەڵمانیا کردبوو، ئەگەرچی ئەڵمانیا ئەم کارانەی خۆی زۆر بە نهێنی ئەنجام دەدا، لەبەر ئەوەی دەترسا بەر لەوەی تەواو خۆی پڕچەك بکات، هاوپەیمانان لێی بێنە دەست، لەلایەکی تریشەوە لەوە دەترسا کە ناوچەی سار لەو کاتەدا بەپێی راپرسییەکە نەگەڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هیتلەر لە هەنگاوەکانی خۆی هەر بەردەوام بوو، یەکێك لە هەنگاوە گرنگەکانی ئەوە بوو کە هیتلەر لە مارتی **١٩٣٥**دا چەند بڕیارێکی دەرکرد لەوانە دووبارە چەکدارکردنەوەی ئەڵمانیا و گەڕاندنەوەی بە سەربازیکردنی زۆرەملێ و زیادکردنی سوپا بۆ ٥٠٠ هەزار سەرباز لە کاتی ئاشتیدا، بیانووشی بۆ ئەم هەنگاوانەی ئەوە بوو کە ڤێرسای لە بەندەکانی چەکداماڵیندا پووچەڵ بۆتەوە، چونکە هاوپەیمانان هیچ لایەکیان نەیانتوانیوە چەکدابماڵن و سۆڤێتیش بۆتە هێزێکی گەورە و فەرەنساش یاسای بەسەربازیکردنی زۆرەملێ بۆ دوو ساڵ داناوە، بۆیە ئەویش ناچارە خۆی بۆ هەر رووبەڕووبوونەوەیەکی مەترسیدار ئامادە بکات، ئەم هەنگاوانەی ئەڵمانیا ئەگەرچی هەر یەك لە بریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و کۆمەڵەی گەلانیش پێی رازینەبوون، بەڵام سزایەکی ئەوتۆیان بۆ دانەنا، نەك هەر

ئەوەندەش، بەڵکو خودی بریتانیا لە ساڵی ١٩٣٥دا ڕێککەوتنی دەریایی لەگەڵ ئەڵمانیادا بەست و ڕازیبوو بەوەی کە هێزی دەریایی ئەڵمانیا بەقەد ٣٥٪ی هێزی بریتانیایی بێت و مافی دروستکردنی ژێردەرياييشی پێدرا.

هەر لەو سەروبەندەشدا بوو کە فەرەنسا تاکە ڕێگەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی نازییەکان، بەستنی گەڵاڵەنامەی هاوکاری بوو بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەگەڵ سۆڤێتدا کە لە مایسی ١٩٣٥دا مۆرکرا، دوای ئەویش گەڵاڵەنامەیەکی هاوشێوە لەنێوان چیکۆسلۆڤاکیا و سۆڤێتدا مۆرکرا، ئەم هەنگاوەی فەرەنسا لەگەڵ سۆڤێتدا بە تەواوەتی ئەڵمانیای نیگەران کرد، هەر بۆیە ئەڵمانیا زلهێزەکانی ئاگادار کردەوە کە ئەم ڕێککەوتننامەیە لەدژی ئەوە، بەڵام فەرەنسا ڕایگەیاند ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نییە و بە پێچەوانەوە دەتوانێت بێتە ناو گەڵاڵەنامەکەوە، بەم جۆرەش پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەو کاتەدا تا دەهات ئاڵۆزتر و دژوارتر دەبوون، دوای ئەم هەنگاوانەی هیتلەر دەستی بە گێڕانەوەی ناوچە ئەڵمانییە دابڕاوەکان بۆ چوارچێوەی ئەڵمانیا کرد و لە ساڵی ١٩٣٥دا هیتلەر پێداگری لەسەر ڕاپرسییەکەی ناوچەی سار کرد و کە ڕاپرسییەکەش لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە کرا ئەنجامەکەی گەڕانەوەی ئەو ناوچەیە بوو بۆ ئەڵمانیا، دواتریش لە ساڵی ١٩٣٦دا هیتلەر سوپای نارده سەر ناوچەکانی ڕاین و گەڕاندییەوە بۆ ئەڵمانیا و دوای ئەوەش ڕوویکردە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ڕووباری ڕاین کە بەپێی ڤێرسای کرابوون بە ناوچەیەکی لەچەکداماڵڕاو و کێشەیەکی نێودەوڵەتی گەورەی لەو کاتەدا نایەوە و تەنانەت وایلێهات زلهێزەکان زۆر بە ترسەوە بڕواننە ئەم هەنگاوەی هیتلەر، بەتایبەتیش فەرەنسا، کە ئەم کێشەیە وایلێکردبوو لە ناوخۆدا بوو بوو بە دوو ئاراستەوە، ئاراستەیەکیان لەگەڵ جەنگدا بوو و ئاراستەیەکی تریشیان دژی جەنگ بوو، کە ئەمەش هەڵوێستی فەرەنسای لاواز کرد و نەیانتوانی ڕووبەڕووی هیتلەر ببێتەوە و بۆیە (هیتلەر) ئەو ناوچانەشی گەڕاندەوە بۆ ئەڵمانیا، لە ساڵی ١٩٣٧یشدا نازییەکان کێشەی ناوچەی (دانتزیك)یان زیندوو کردەوە کە بەپێی ڤێرسای ئەو ناوچەیە کرابوو بە ناوچەیەکی ئازاد، بەڵام هەر لە ساڵی ١٩٣٧دا ناوچەی دانتزیك لکێنرایەوە بە ئەڵمانیا، دوای ئەمەش وردە وردە کێشەی نەمسا لەلایەن هیتلەرەوە وروژێنرا.

## چوارەم: کێشەی نەمسا و لکاندنی بە ئەڵمانیاوە

لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانیەوە لە نەمسا کۆمارێکی سەربەخۆ دامەزرێنرا بێ ئەوەی بۆی هەبێت جارێکی تر لەگەڵ ئەڵمانیادا یەکبگرێتەوە، بەڵام ئەم کۆمارە لە سییەکانی سەدەی بیستەمەوە رووبەڕووی چەندین کێشەی ئابووری و سیاسیی گەورە بووەوە، بەتایبەت بەهۆی قەیرانی دارایی جیهانی و ئەو قەرزە زۆرەی بریتانیا و فەرەنساش کە لە ژێریدا دەینالآند، لەڕووی سیاسییشەوە لە ناوەوەی نەمسادا سۆسیالیست و پارێزگارەکان لە ململانێیەکی توندا بوون، ئەمەش وایکردبوو، کە رێگە بۆ دەستێوەردانە دەرەکییەکان خۆش ببێت، بەتایبەت دوای ئەوەی لە ئەڵمانیا نازییەکان هاتنە سەر حوکم و یەکێك لە ئامانجەکانیان گێڕانەوەی نەمسا بوو، هەر لەم پێناوەشدا پارتی نازیان لە نەمسا دامەزراندبوو، کە ئەم پارتە دروشمی سەرەکیی گەڕانەوەی نەمسا بۆ سەر ئەڵمانیا بوو، بۆ ئەمەش لە ساڵی ١٩٣٤دا (دلفۆز)ی سەرۆك وەزیرانی نەمسایان کوشت، کە پێداگر بوو لەسەر سەربەخۆیی نەمسا، بەمەش ویستیان کودەتایەك لە نەمسا ئەنجام بدەن، ئەمە هەنگاوی یەکەمی چوونە ناوەوەی نازییەکان بوو بۆ نەمسا و هەنگاوی یەکەمی زەقبوونەوەی کێشە نێودەوڵەتییەکانیش بوو، چونکە جگە لە ناڕازاییبوونی فەرەنسا و بریتانیا و سۆڤێت بەم هەنگاوە هاوکات لەو ماوەیەدا ئیتالیاش بەوە رازینەبوو نەمسا جارێکی تر بچێتەوە سەر ئەڵمانیا، بەڵام دوای ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٣٦دا لێکنزیبوونەوە لە نێوان ئەڵمانیا و ئیتالیا دروست بوو، ئیتالیا لەم هەڵوێستەی پاشەکشەی کرد، دوای کشانەوەی ئیتالیا لەم هەڵوێستەی لە ساڵی ١٩٣٦دا بارودۆخەکە بۆ ئەڵمانیا لەباربوو بۆ گێڕانەوەی نەمسا، چونکە لەوکاتەدا فەرەنسا سەرقاڵی کێشەی نێوخۆیی و قەیرانی وەزاری بوو، لەلایەکی تریشەوە بریتانیا بەشی زۆری وەزیرەکانی (چەمبەرلن) لەو کاتەدا هاوسۆز بوون لەگەڵ ئەو سیاسەتەی هیتلەردا، ئەمانەش وایانکردبوو کە هیتلەر رۆژ بە رۆژ زیاتر دەست بخاتە ناو نەمساوە و پارتی نازیش زۆرتر بچێتە ناو کێشەکانەوە، بۆیە (دکتۆر شۆشەنگ) کە لەدوای کوشتنی (دلفۆز)ەوە بوو بە سەرۆکی وەزیران و یەکێك بوو لەو کەسانەی کە سووربوو لەسەر مانەوەی سەربەخۆیی نەمسا، لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ١٩٣٨دا بڕیاری دەستگیرکردنی بەشێکی زۆری

نازییەکانی دا بەو بیانووەی کە هەوڵی کودەتایان داوە، ئەمەش بوو بە بیانوویەکی باش بۆ هیتلەر بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی لە پێناو گێڕانەوەی نەمسا، ئەوە بوو لە ١٠ی شوباتی ١٩٣٨دا داوای کرد لەگەڵ (شۆشەنگ)دا دابنیشێت و لە دانیشتنەکەشدا (هیتلەر) داوای لە شۆشەنگ کرد کە گۆڕانکاری لە کابینەکەیدا بکات و چەند وەزیرێکی وەزارەتەکەی لە پارتی نازی نەمسایی دابنێت، ئەگەر نا ناچار دەبێت پەنابباتە بەر چارەسەری سەربازییانە دژ بە نەمسا، بەڵام سەرۆك وەزیر بەمە رازینەبوو، کە ئەمە هەنگاوێکی تر بوو لە هەنگاوەکانی دەستێوەردانەکانی هیتلەر، کەچی هیتلەر بەمەشەوە نەوەستایەوە، بەڵکو رۆژ دوای رۆژ دەستێوەردانەکانی زیاتر دەبوون بەڕادەیەك ئەمەش وای لە شۆشەنگ کرد داوای ئەوە بکات ، کە لە ناو نەمسادا راپرسییەك ئەنجام بدرێت بۆ ئەوەی ئایا نەمسا دەیەوێت بچێتە پاڵ ئەڵمانیا یان نا، ئەم داواکارییەی شۆشەنگیش بە تەواوی هیتلەری پەست و نیگەران کرد، بۆیە داوای لە (سایس ئەنگوارێت)ی سەرۆکی پارتی نازی کرد کە هەڕەشە لە شۆشەنگ بکات بۆ ئەوەی دەستبەرداری بیرۆکەی راپرسی ببێت، ئەگەرنا ئەوان نەمسا داگیردەکەن، نەمساش لەو کاتەدا پشتوپەنایەکی ئەوتۆی نەبوو، کۆمەڵەی گەلانیش هیچ رۆڵێکی ئەوتۆی نەمابوو، بۆیە بەناچاری لە بیرۆکەی راپرسی پاشگەز بوونەوە، ئەمەش بەشێکی مەرامەکانی هیتلەری هێنایەدی و لێرەش بەدواوە ئەوەندەی تر فشارەکانی زیاترکرد و هەوڵەکانی بۆ دەست لەکارکێشانەوەی (شۆشەنگ) چڕکردەوە تا دوا ئەنجام لە ١٢ی مارتی ١٩٣٨ەوە سوپای ئەڵمانی بەبێ بەرگرییەکی ئەوتۆ چوونە ناو نەمساوە و دوای ماوەیەکی کورتیش هیتلەر بە فەرمی رایگەیاند کە نەمسا بەشێکە لە ئەڵمانیا، بەمەش توانی ٧ ملیۆن ئەڵمانی تر سەرباری گەلانی ئەڵمانیای بخاتە ژێردەستی و لێرەشەوە یەکێك لە وڵاتە سەربەخۆکانی ناو کۆمەڵەی گەلان بهێنێتە چوارچێوەی دەوڵەتی ئەڵمانیاوە و سنووری ئەڵمانیا بگەیەنێتە ئیتالیا و بالکان و لەلایەکی تریشەوە زەمینەسازی بۆ داگیرکردنی چیکۆسلۆڤاکیا بکات.

## پێنجەم: کێشەی چیکۆسلۆڤاکیا

دوای ئەوەی ئەڵمانیا زۆر بە ئاسانی نەمسای داگیرکرد، بڕیاری دا هەمان هەنگاویش بەرەو چیکۆسلۆڤاکیا بنێت. چیکۆسلۆڤاکیا لەو کاتەدا نزیکەی سێ ملیۆن ئەڵمانی تێدا بوو کە لە ناوچەی (سۆدیت)دا دەژیان و بەپێی کۆنگرەی ئاشتی پاریس خرابوونە سەر چیکۆسلۆڤاکیا و پێشتر بەشێك بوون لە ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر، ئەم ناوچەیە لە سەرەتادا تا ساڵی ١٩٣٦ هیچ ویستێکی چوونەوە پاڵ ئەڵمانیایان نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٥ەوە نازییەکان ناوچەی سار و دۆڵی راینیان خستەوە پاڵ ئەڵمانیا، ئیدی وردە وردە ئەمانیش هەڵوێستیان گۆڕا، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە نازییەکان بە هەمان شێوەی نەمسا لە ساڵی ١٩٣٥دا پارتێکی نازیان لە چیکۆسلۆڤاکیاش بە سەرۆکایەتی (کۆنرات هێنلین) دامەزراند، کە ئەم پارتە پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ ئەڵمانیادا هەبوو و کارێکی زۆری بۆ زیادکردنی داواکاریی سەربەخۆیی و چوونەوە پاڵ ئەڵمانیا لە ناوچەی سۆدیت دەکرد، کە کاریگەری لەسەر توندبوونی هەڵوێستی چوونەوەپاڵ ئەڵمانیا هەبوو و ئەمەش رێخۆشکەر بوو بۆ هیتلەر زیاتر داوای مافی چارەنووس لەو ناوچەیەدا لە وڵاتە ئەورووپییەکان بکات.

سەبارەت بە هەڵوێستی حکومەتی چیکۆسلۆڤاکیاش لەبارەی گەڕانەوەی سۆدیت بۆ ئەڵمانیا، (دکتۆر دنیش) کە ئەوکات سەرۆکی وەزیران بوو، زۆر بە توندی دژایەتی ئەم بیرۆکەیە و پارتی نازی سۆدیت و ئەڵمانیاشی دەکرد، لەو کاتەشدا چیکۆسلۆڤاکیا پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ فەرەنسای دوژمنی ئەڵمانیادا هەبوو، کەواتە مەحاڵ بوو بەوجۆرە داواکارییە رازی بێت، بۆیە (دکتۆر دنیش) لە ترسی هێرشی ئەڵمانیا، نیوەئامادەباشی راگەیاند، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە حکومەتی چیکۆسلۆڤاکیا بە توندی ئەو جوڵانەوەیەی ناوچەی سۆدیتی سەرکوت کردبۆوە، کە هەوڵی جیابوونەوەیاندا بوو، لەوکاتەشدا فەرەنسا و بریتانیا ترسی زۆریان لەوە هەبوو کە ئەم رووداوە ببێتە بیانوویەك بۆ هیتلەر بۆ داگیرکردنی چیکۆسلۆڤاکیا، بۆیە بریتانیا نوێنەری خۆی نارد بۆ ناوبژیکردنی نێوان چیکۆسلۆڤاکیا و ناوچەی سۆدیت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

ئەم قەیرانە لە هاوینی ١٩٣٨دا بە لوتکە گەیشت، تایبەت دوای ئەوەی کە هیتلەر لە گوتارێکیدا کە لە ١٢ی ئەیلوولی ١٩٣٨دا لە کۆنگرەی پارتی نازی ئەڵمانیا دا، داوای

کردبوو کە ئەڵمانییەکانی سۆدیت مافی خۆیانە چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن، هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی کردبوو، ئەگەر پێویست بکات بۆ گێڕانەوەی ئەو ناوچەیە. بەم جۆرەش قەیرانەکە تادەهات گرژ و ئاڵۆز دەبوو، لەگەڵ ئاڵۆزبوونی قەیرانەکەشدا ئەوە روون دەبۆوە فەرەنسا و سۆڤێت کە پێشتر بەڵێنی بەرگریان بە چیکۆسلۆڤاکیا دابوو، لە کاتی هێرشی ئەڵمانیادا، لەو بەڵێنەیان پاشگەز بوونەتەوە، چونکە سوپای رووسیا لە دۆخێکی خراپدا بوو و توانای هیچ کێشەیەکی سەربازیی نەبوو، فەرەنساش لەو کاتەدا هیچ ئامادەییەکی دەرنەبڕی بۆ هاوکاریکردنی رووسیا بۆ رزگارکردنی چیکۆسلۆڤاکیا، ئەمە وێڕای ئەوەی بریتانیا لەو کاتەدا زیاتر سیاسەتی ئاشتی و هێورکردنەوەی لەگەڵ ئەڵمانیا پیادە دەکرد و خودی (چەمبەرلین) سەردانی ئەڵمانیای کردبوو، چاوی بە (هیتلەر) کەوتبوو و لەوێشدا رەزامەندی چیکۆسلۆڤاکیا لەسەر دەستبەرداربوون لە نزیکەی ٥٠٪ی ناوچەی سۆدیت بۆ ئەڵمانیا پێشنیارکردبوو، بەڵام هیتلەر لە وەڵامدا پێی گوتبوو ئەوان هیچ متمانەیەکیان بە چیکۆسلۆڤاکیا نییە، بۆیە (چەمبەرلین) پێشنیاری کردبوو کە کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی بۆ ئەم کێشەیە لە میونخ لە نێوان زلهێزەکاندا ببەسترێت، هیتلەریش بەم پێشنیارە رازیبوو، چیکۆسلۆڤاکیاش ناچار بوو رەزامەندی نیشان بدات.

لە ٢٩ی ئەیلوولی ١٩٣٨دا کۆنگرە لە میونخ بەسترا و هەریەکە لە هیتلەر و مۆسۆلینی و چەمبەرلین و دیلادیای سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا تیایدا بەشدار بوون، لەم کۆنگرەیەدا ئەڵمانیا توانی بە تەواوی خۆی بەسەر زلهێزەکاندا بسەپێنێت و تەواوی ئەو ناوچانە بەدەست بهێنێت لە سۆدیت کە ئەڵمانیەکان تیایدا زۆرینە بوون، هۆکاری ئەم سەرکەوتنەی ئەڵمانیاش زیاتر ئەوە بوو کە بریتانی و فەرەنسییەکان لەو کاتەدا دەیانویست خۆیان لە جەنگ بەدوور بگرن، ئەمە جگە لەوەی ئەوان نازییەکانیان بە قەڵغانێك دەزانی بەرانبەر بە کۆمونیستەکانی سۆڤێت، چونکە پێیانوابوو نازیزم و کۆمونیزم دوو ئاراستەی دژیەکن و بەمەش بەهێزبوونی نازیزم دەبێتە قەڵغانێك لەبەردەم تەشەنەکردنی کۆمونیستەکاندا، بەم جۆرەش لە ئەنجامی کۆنگرەی ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٨دا بەشی هەرە زۆری سۆدیت چووەوە سەر ئەڵمانیا.

## شەشەم: جەنگی نێوخۆیی ئیسپانیا ١٩٣٦-١٩٣٩ و کاریگەریی لەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی بەر لەجەنگی دووەمی جیهان

ئیسپانیا تا کۆتایی سەدەی نۆزدەش وڵاتێکی پاشایەتی بوو، کە لەسەر بنەمای پاشایەتیی دەستووری بەڕێوە دەچوو و لە ساڵی ١٨٨٥شەوە پاشا (ئەلڤۆنسۆی سێزدەهەم) حوکمی دەکرد، بەڵام لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا، دەسەڵاتی ئیسپانی رووبەڕووی کۆمەڵێك کێشەی ناوخۆیی و دەرەکی بووەوە، لەڕووی دەرەکییەوە ئیسپانییەکان لە ساڵی ١٨٩٨دا دووچاری جەنگێکی قورس بوونەوە لەگەڵ ئەمەریکادا لەسەر ناوچەی کوبا، بە دۆڕان لەم جەنگەشدا ناوچەیەکی زۆری لەدەستدا، ئەمە جگە لەوەی لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا جوڵانەوەیەکی رزگاریخوازانە لە مەغریب لە دژی دەسەڵاتی ئیسپانی دەرکەوت و کێشەیەکی زۆری بۆ ئیسپانییەکان نایەوە.

لەڕووی ناوخۆییشەوە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا سیستەمی حوکمی ئیسپانی رووبەڕووی بەرهەڵەستکارییەکی زۆر بووبۆوە و لەم رووەشەوە زنجیرەیەك جوڵانەوە و شۆڕشی یەك لەدوای یەك روویان دا، بەڵام بێ ئەوەی هیچ یەکێك لەم جوڵانەوانە ئاکامییان ببێت، تا سەرەنجام لە ساڵی ١٩٢٣دا ژەنەراڵێکی سەربازی بە ناوی (پریمیۆ دی ریڤێرا) کودەتایەکی سەرکەوتووانەی لە دژی حکومەتی پاشایەتی ئەنجام دا، لێرەشەوە ئیسپانیا کەوتە ژێر دەسەڵاتی حوکمێکی دیکتاتۆرییانەی سەربازی کە ماوەی حەوت ساڵی خایاند، لە ماوەی ئەم حکومەتەدا، حوکمی عورفی و هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و سنووردارکردنی ئازادییەکان و چاودێریکردنی توندی رۆژنامەگەری پیادەکرا، بۆیە ئەم حکومەتەش لە ساڵی ١٩٢٨دا رووبەڕووی بەرهەڵستکارییەکی توند بووەوە، ئەم نارەزاییانەش بەهۆی قەیرانی ئابوورییەوە لە ساڵی ١٩٣٠ بەدواوە ئەوەندەی تر برەوی سەند تا لە ئەنجامدا کۆتایی بە حوکمی (ریڤێرا)ش هات، دوای حوکمی (ریڤێرا)، لەو هەڵبژاردنەی لە ساڵی ١٩٣١دا ئەنجامدرا کۆمارییەکان سەرکەوتن و حکومەتێکیان بە سەرۆکایەتی (زامۆرا) دامەزراند، بەمەش کۆتایی بە حوکمی پاشایەتی هات لە ئیسپانیا و پاشاش رەوانەی دەرەوەی وڵات کرا و لێرەشەوە سیستەمی کۆماری لە ئیسپانیا دەستی بە حوکم کرد.

سیستەمی کۆماری لە ماوەی چوار ساڵ و نیوی حوکمیدا لە دۆخێکی زۆر خراپدا بوو، لەلایەکەوە کابینە وەزارییەکان جێگیر نەبوون و لە ئاڵوگۆڕی بەردەوامدا بوون، لە لایەکی

ترەوە ململانێی بەردەوام لەنێو توێژە جیاجیاکانی وڵاتدا هەبوو، بەتایبەت چەپڕەوەکان و پارێزگارەکان، ململانێکانیشیان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر برەوی دەسەند، تایبەت دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٦دا چەپڕەوەکان بە زۆرینەییەکی کەم هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانیان بردەوە و پارتە چەپڕەوەکان بەرەیەکیان بە ناوی (بەرەی گەل)ـەوە پێك هێنا و دوای ئەوەش حکومەتێکیان هەر بە هەمان ناوەوە دامەزراند، ئەم حکومەتە سیاسەتێکی سۆسیالیستیانەی میانەڕەویان ڕاگەیاند و کۆمەڵێك هەنگاوی چاکسازییانەیان نا، لەوانە چەند چاکسازییەك لە ڕووی کشتوکاڵی و دەستێوەردانی دەوڵەت لە پیشەسازی و توندوتیژی نواندن بەرانبەر بە موڵکدار و پارێزگارەکان، بەشێوەیەکی گشتی ئەم حکومەتە سیاسەتێکی دژەپارێزگارەکانی، وەك خاوەن سامان و خاوەن کارگە و پیاوانی ئایینی بەکاردەهێنا، ئەمەش وایکردبوو ڕۆژ بە ڕۆژ گرژی و ئاڵۆزی و توندوتیژی برەوبسەنێت، تا ئەو کاتەی لە ١٨ی تەمموزی ١٩٣٦دا ئەم بارودۆخە جەنگێکی نێوخۆیی سێ ساڵەیی لێکەوتەوە.

جەنگی نێوخۆیی لە نێوان حکومەتی ئیسپانی و بزووتنەوەیەکی یاخیبوودا بوو کە لەلایەن ژەنەراڵێکی سەربازی ئیسپانییەوە بەناوی ژەنەراڵ (فرانسیسکۆ فرانکۆ)وە سەرکردایەتی دەکرا، بزووتنەوەکە لە داگیرگەکانی ناوچەکانی ئیسپانیاوە دەستی پێکرد، تایبەت لە ناوچەی مەراکیشەوە بڵاودەبووەوە و هاوکات زۆربەی ئەفسەرە دوورخراوەکان دەچوونە پاڵی، لە کۆتایی ١٩٣٦دا فرانکۆ توانی بەشێکی زۆری وڵات تایبەت لە باشوور و ڕۆژئاوا و باکووری ڕۆژئاوای ئیسپانیا، کە نزیکەی نیوەی وڵات بوو، بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، کە ئەمەش وایکرد کۆمارییەکان بە ناچاری دەسەڵات لە مەدریدەوە بگوازێتەوە بۆ ڤالانسیا و یاخیبووەکانیش وردە وردە پێشڕەوی بکەن بۆ نزیك شاری مەدرید، لێرەشەوە کۆمارییەکان توانیان شەڕێکی دوور و درێژخایەن لە دژی یاخیبووەکان بکەن کە سێ ساڵی خایاند و بەمەش کێشەی ئیسپانیا بە تەواوی پەرەیسەند و لەڕووی ناوخۆییەوە ئیسپانیای کرد بە دووبەرەی جیاوازەوە، بەرەیەکیان یاخیبووەکان بوون کە لایەنگرانی پاشایەتی و دەوڵەمەند و سەرمایەدار و پیاوانی ئایینی و هەندێك لە ئەفسەرانی سوپا بوون بە سەرۆکایەتی فرانکۆ، بەرەکەی تریش کۆمارییەکان بوون کە لە کۆمونیست و نیشتمانییەکان و خەڵکی هەرێمی باسك پێکدەهاتن، چونکە حکومەت بەڵێنی ئۆتۆنۆمی بەم هەرێمە دابوو.

کێشەی ئیسپانیا لەکاتێکدا سەری هەڵدا، کە ڕۆژ دوای ڕۆژ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بەرەو ئاڵۆزی دەچوون و جیهان جارێکی تر بەرەو دووجەمسەربوون دەچوو، بۆیە ئەم کێشەیە

زۆر بە خێرایی لە کێشەیەکی نێوخۆییەوە بوو بە کێشەیەکی ئەوروپایی و زلهێزەکانی بەرەو لێکترازان و دووبەرەیی برد، ئەوەبوو لەو کاتەدا کێشەی نێوان سەرمایەداری و کۆمونیزم لە لایەك و لەلایەکی تریشەوە هاوسۆزی ئایدیۆلۆژی و بەرژەوەندی لە هەموو جیهاندا بە روونی بەلای لایەنە شەڕکەرەکانی ئیسپانیادا دەرکەوتن، کە سۆسیالیست و کۆمونیستەکان لایەنگرانی کۆمارییەکان بوون و سەرمایەدار و فاشیستەکانیش لایەنگری فرانکۆ بوون، بەم جۆرەش کۆمارییەکان لەلایەن سۆڤێتەوە پشتیوانی دەکران و یارمەتیان وەردەگرت، ئەوانیتریش لەلایەن ئەڵمانیا و ئیتالیا و پرتوگالەوە، کە هەریەك لەم لایەنانە مەبەست و بەرژەوەندیی خۆیان هەبوو لە یارمەتیدانی بەرە شەڕکەرەکانی ناو ئیسپانیا.

سەبارەت بە ئیتالیا مەبەستی پەیداکردنی نفوز بوو لە ئیسپانیا بەتایبەتی لەو کاتەدا پارتی فاشیستی لە ئیسپانیا دامەزرابوو، هەروەها مەبەستیشی بەدەستهێنانی چەند بنکەیەکی دەریایی و ئاسمانی بوو لە دوورگەکانی ئیسپانیا، کە لەوێوە بتوانێت هەڕەشە بخاتەسەر بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا لە دەریای ناوەڕاست، هەربۆیە لە تشرینی دووەمی **١٩٣٦**دا ئیتالیا دانی بە حکومەتی فرانکۆ دانا و یارمەتییەکی زۆری پێبەخشی. لەبارەی ئەڵمانیاشەوە، دەیویست بەرێی ئەم جەنگەوە پەیوەندیی نێوان ئیتالیا و فەرەنسا بەرەو ئاڵۆزی بەرێت، لەلایەکی تریشەوە بە هاوپەیمانیکردن لەگەڵ ئیسپانیا ترسێك بۆ فەرەنسا دروست بکات، کاتێك کە جەنگی بوو لەگەڵ فەرەنسا هەندێك لە سوپاکەی لەسەر سنووری ئیسپانیا بهێڵێتەوە، هەروەها دەیەویست ئیسپانیا بکات بە مەیدانێك بۆ تاقیکردنەوەی ئەو چەکانەی تازە بەرهەمی هێنابوون، لەلایەکی تریشەوە ئیسپانیا بکات بە ناوچەیەك بۆ بەدەستهێنانی کەرەستەی خاوی وەك خەڵوز و ئاسن و مەنگەنیز، هەر بۆیە ئەویش لە تشرینی دووەمی **١٩٣٦**دا دانی بە حکومەتی فرانکۆ نا و یارمەتیی سەربازی و چەکی پێدا. پرتوگالیش لەبەر ئەوەی هەر خۆی خاوەن سیستەمێکی دیکتاتۆری دژە کۆمونیستی بوو، بۆیە رێگەی بەو وڵاتانەدا کە پاڵپشتی فرانکۆ دەکەن خاکی ئەو بۆ گواستنەوەی یارمەتییەکانیان بۆ فرانکۆ بەکاربهێنن.

سۆڤێتیش یارمەتیی کۆمارییەکانی دەدا، کە بیانووی ئەو زیاتر بیانووی فیکری بوو، چونکە کۆمارییەکانیش لەسەر رێبازی سۆسیالیستی بوون، ئەمە جگە لەوەی کە دەیەویست شوێن پێی خۆی لەرێی ئیسپانیاوە لە ئەوروپای رۆژئاوا بەهێز بکات، هەروەها مەبەستیشی نانەوەی ئاژاوەی زیاتر بوو لە نێوان فەرەنسا و بریتانیا لەلایەك و ئەڵمانیا ئیتالیا لەلایەکی ترەوە، کە سەرجەمیانی بە دوژمنی خۆی دەزانی.

سەبارەت بە فەرەنسا و بریتانیاش زیاتر ئەو سیاسەتەیان بەکاردەهێنا کە ڕێگربن لە بەردەم هەردەستکەوتێکی ئیتالی-ئەڵمانی لە ڕۆژئاوای دەریای ناوەڕاست، چونکە پێیانوابوو ئەگەر ئەوان بنکەی سەربازییان لە ئیسپانیا هەبێت، ئەوکات ترسێکی گەورە بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەوان لە دەریای ناوەڕاست دروست دەبێت، ئەمەش بەرەو جەنگی جیهانیان دەبات، هەر بۆیە لە ئەیلوولی ١٩٣٦دا فەرەنسا پێشنیاری بۆ وڵاتانی ئەورووپا کرد کە سیاسەتی دەستێوەرنەدان پیادە بکەن، هەرچەندە ئیتالیا و ئەڵمانیا و سۆڤێت بەڕواڵەت بەمە ڕازیبوون، بەڵام ئەمە تەنها لە ڕواڵەتدا مایەوە. سەبارەت بە کۆمەڵەی گەلانیش ڕۆڵێکی ئەوتۆی لەم کێشەیەدا نەگێڕا، هەرچەند حکومەتی ئیسپانیا سکاڵای پێشکەش بە کۆمەڵە کرد، بەڵام کۆمەڵەی گەلان نەیتوانی هیچ هەنگاوێك لەبارەی ئەم کێشەیەوە بنێت.

ئەم جەنگە نزیکەی سێ ساڵی خایاند و لە ١ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٦دا فرانکۆ خۆی بە سەرۆکی وڵاتی ئیسپانیا ڕاگەیاند کە بارەگاکەی لە (بۆرگۆس) بوو، بەشێکی زۆری وڵاتە زلهێزەکانیش دانیان پێ دانا و جەنگیش لە نێوان سوپای فرانکۆ و کۆمارییەکان تا مارتی ١٩٣٩ درێژەی خایاند، تا ئەو کاتەی فرانکۆ توانی کۆتایی بە حوکمی کۆمارییەکان بهێنێت، بەمەش کۆتایی بە جەنگی نێوخۆیی ئیسپانیا هات کە نزیکەی ٢٥٠ هەزار کەس بوون بە قوربانی و ماڵوێرانییەکی زۆری بۆ ئیسپانیا خستەوە، دوای سەرکەوتنیشی، فرانکۆ کۆتایی بە سیستەمی کۆماری هێنا و حکومەتێکی دیکتاتۆری لە ئیسپانیا دامەزراند، کە تا مردنی خۆی لە ساڵی ١٩٧٥ بەردەوام بوو، بەڵام ئەوەی جێی ئاماژەیە ئەوەیە کە دوای سەرکەوتنی، (فرانکۆ)، بێلایەنی خۆی ڕاگەیاند و پاڵی نەدایە پاڵ هیچ لایەنێك لە شەڕکەرەکان. هاوکات ئەو جەنگەش ڕۆڵێکی زۆری هەبوو لە زیاتر قوڵکردنەوەی کێشەی نێو زلهێزەکانی ئەو کاتەدا و قوڵبوونەوەی دووبەرەییان.

# بەشی پێنجەم

## جەنگی دووەمی جیهانی

### یەکەم: کێشەی پۆڵەندا و کەوتنەوەی جەنگی دووەمی جیهانی

دوای ئەوەی ئەڵمانیا دەست بەسەراگرتنی نەمسا و بەشێکی زۆری چیکۆسلۆڤاکیای بۆ چووەسەر، ئەو بێ هەڵوێستییەی زلهێزەکانیش ئەوەندەی تر هیتلەری هاندا فشارەکانی بۆ سەر پۆڵەندا دەست پێبکات، کێشەی نێوان پۆڵەندا و ئەڵمانیا بە هەمان شێوە دەگەڕایەوە بۆ کێشەکانی کۆنگرەی ئاشتیی پاریس، چونکە هاوپەیمانان لەوێدا بڕیاریان دابوو کە ڕێڕەوێکی پۆڵەندی دابمەزرێنن و لەڕێگایەوە پۆڵەندا بە دەریای بەلتیکەوە ببەستێتەوە لەسەر بەندەری دانتزیك، دانتزیکیش ببێتە شارێکی سەربەخۆ و لەژێر چاودێری کۆمەڵەی گەلاندا بێت، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی پرووسیا لە ئەڵمانیا دابڕێت، تاکە ڕێگەی پەیوەندیی نێوان ئەو ناوچەیە و ئەڵمانیا هێڵێکی ئاسنی بێت، کە بە تەواوی لەژێر دەسەڵاتی پۆڵەندا بێت.

ئەگەر چی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٣٤دا پەیماننامەی دەستدرێژینەکردنی لەگەڵ پۆڵەندا بۆ ماوەی ١٠ ساڵ مۆرکرد بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نازییەکان دوای سەرکەوتنەکانیان لە ناوچەکانی پێشووتر و لاوازی هەڵوێستی بریتانیا و فەرەنسا، پابەند نەبوون بەو پەیماننامەیە و وردە وردە هێرشەکانیان لەڕووی ڕاگەیاندن و پڕۆپاگەندەوە بۆ سەر پۆڵەندا دەستپێکرد، بەتایبەتی لە هاوینی ساڵی ١٩٣٩دا هێرشێکی توندیان دەربارەی ئەو مامەڵە خراپەی لەبەرانبەر کەمینە ئەڵمانیەکاندا ئەنجامی دەدات کردە سەر پۆڵەندا و داوایان لە پۆڵەندا دەکرد کە شاری دانتزیك بگێڕێتەوە و دەستبەرداری ئەو ڕێڕەوە بێت کە دەیگەیەنێتە سەر دەریای بەلتیك بۆ ئەڵمانیا، ئەم هەڵوێستە توندەی هیتلەریش لەوێوە سەرچاوەی گرتبوو، کە زۆر دڵنیا بوو لەوەی هەڵوێستی هەریەکە لە بریتانیا و فەرەنسا بەرانبەر کێشەی پۆڵەنداش هەمان هەڵوێستی پێشووتریان دەبێت کە بەرانبەر بە کێشەی چیکۆسلۆڤاکیا هەیانبوو، ئەوان لەو کاتەدا ئەو جۆرە سەرکێشییە ناکەن کە بچنە

جەنگەوە، بۆیە رۆژ بە رۆژ هیتلەر فشارەکانی زیاتر دەکرد. لە ئەنجامی ئەم فشارانەی هیتلەردا ئینگلیز و فەرەنسا هەوڵیان دا بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە لەگەڵ رووسیادا رێبکەون بە مەبەستی کاری هاوبەش لەپێناو بەرگرتن لە هەر جۆرە دەستدرێژییەکی ئەڵمانیا بۆ سەر پۆلەندا، بەڵام یەکێتی سۆڤێت وەڵامدانەوەیەکی بۆ داواکارییەکەیان نەبوو، چونکە پێیوابوو وڵاتە ئەوروپییەکان لە کۆنگرەی میونخدا کە لەبارەی چیکۆسلۆڤاکیاوە بەسترا، ئەویان پشتگوێ خستبوو و هیچ پرسێکیان پێنەکردبوو، بەڵام دەیانەوێت لە کێشەی پۆلەنداوەی بگلێنن، لەلایەکی ترەوە کێشەی وڵاتانی بەلتیکیش یەکێکی تر بوو لە هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی ئەو گفتوگۆیانە، چونکە سۆڤێت داوای ئەوەی دەکرد ئەگەر هەر هاوپەیمانێتییەك لەگەڵ ئەواندا ببەستێت، پێویستە لیتوانیا و ئیستیوانیا لەژێر چاودێری ئەودا بن، ئەوانیش بەمە رازینەبوون، بۆیە ئەم گفتوگۆیە سەری نەگرت، هەر لەو کاتەشدا بوو ئەڵمانیا وردە وردە لە ڕووسیا نزیك دەبووەوە و گفتوگۆکانیان بەرەو رێککەوتن دەڕۆیشت، بەتایبەتی دوای شکستخواردنی ئەو هەوڵەی بریتانیا و فەرەنسا، بۆیە لە **٢٣**ی ئابی **١٩٣٩**دا ئەڵمانیا و رووسیا رێککەوتنی دەستدرێژینەکردنیان مۆرکرد، کە لەم رێککەوتنەدا رووسیا بەڵێنی دابوو ،ئەگەر ئەڵمانیا کەوتە جەنگەوە بێلایەنی بپارێزێت، هەروەها رێککەوتبوون لەسەر دابەشکردنی رۆژهەڵاتی ئەوروپا بۆ ناوچەی نفوزی رووسی و ئەڵمانی. بەم جۆرەش هیتلەر توانی لە لایەنی سۆڤێتەوە پشتی سوپاکەی قایم بکات، کاتێك کە ئەمەشی کرد ئیدی لە هەر یەکە لە فەرەنسا و بریتانیا سڵی نەکردەوە و هێرشی راگەیاندنی بۆسەر پۆلەندا جارێکی تر دەستپێکردەوە، ئەمجارەیان زۆر توندتر لە جاران، ئەڵمانیا هەڕەشەی لە پۆلەندا کرد کە هێرشی سەربازی دەکاتە سەری، ئەگەر داواکارییەکانی ئەڵمانیا لەبارەی دانتزیکەوە پەسەند نەکات. بەڵام پۆلەندا ئەم داواکارییانەی رەتکردەوە، بۆیە لە سەرەتای ئەیلوولی ساڵی **١٩٣٩**دا سوپای ئەڵمانیا هێرشی کردە سەر پۆلەندا و فرۆکە سەربازییەکانی ئەڵمانیا بە چڕی دەستیان بە بۆردومانکردنی وارشۆی پایتەخت کرد.

ئەم بارودۆخە فەرەنسا و بریتانیای هێنایە دەنگ، چونکە تا ئەو کاتەش ئەوان پێیانوابوو کە نازییەکان تەنها مەبەستیان گێڕانەوەی ناوچە ئەڵمانییەکانە بۆ ژێر دەستی ئەڵمانیا، کە ئەمە جۆرێك لە هاوسۆزی ناوەندە سیاسییەکانی ئەوروپای لەگەڵدا بوو، بەڵام دوای ئەوەی کە ئەڵمانیا هێرشی کردە سەر پۆلەندا، بە تەواوی نیازەکانی ئەڵمانیا دەرکەوت، کە مەبەستی فراوانخوازییەکی بەربڵاوە، بۆیە لێرەوە ترسیان لێنیشت و دەستیان بە هەڕەشەکانیان لە ئەڵمانیا کرد و داوایان کرد بە زووترین کات لە خاکی پۆلەندا بکشێتەوە، بەڵام ئەڵمانیا ئەم

داواکارییەی فەرەنسا و بریتانیای رەتکردەوە، بۆیە ئەوانیش لە **٣**ی ئەیلوولی ساڵی **١٩٣٩**دا شەڕیان لە دژی ئەڵمانیا راگەیاند و لێرەشەوە جەنگی دووەمی جیهانی دەستی پێکرد.

## دووەم: هۆکارەکانی جەنگی دووەمی جیهان

سەرەنجامی ئەو رووداوانەی باس کران، دەتوانین چەند هۆکارێکی سەرەکی کە کاریگەریی گەورەیان هەبوو لە کەوتنەوەی جەنگی دووەمی جیهان دەستنیشان بکەین، لەوانە: وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا کێشەکانی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهان و بەندەکانی کۆنگرەی ئاشتیی پاریس. چونکە هەندێك وڵات لەم رەوشەی کە لە دوای جەنگەوە هاتبووە ئاراوە، رازینەبوون، بەتایبەتیش ئەڵمانیا و ئیتالیا و ژاپۆن، ئەڵمانیا لەبەر ئەوەی هەر لە سەرەتاوە بە بەند و مەرجەکانی کۆنگرەی ڤێرسای رازینەبوو، لە بەرئەوەی ناوچەیەکی زۆری بڕێنرابوو، هەروەها قەرەبوویەکی زۆری خرابووە سەر، ئابلۆقەی سەربازی و چەك و جبەخانەی بەسەرەوە بوو، بۆیە هەر لە دوای ساڵی **١٩١٩**ەوە ئاراستەیەکی بەهێز لە ناوەوەی ئەڵمانیا بۆ گۆڕینی ئەو رێککەوتننامەیە کاریان دەکرد، کە دواجار ئەم ئاراستەیە لە بەهاتنە سەر حوکمی پارتی نازیزم، بەسەرۆکایەتی هیتلەر دەستیان بە پیادەکردنی ئەم نیازەیان کرد و هەوڵەکانیان لەم پێناوەدا بەڕادەیەك چڕکردەوە، کە هەنگاو بە هەنگاو بەندەکانی ئەو رێککەوتننامەیەیان هەڵوەشاندەوە و بارودۆخەکەیان لەگەڵ وڵاتە براوەکاندا بەرەو ئاقارێکی ترسناك برد، لەلایەکی ترەوە ئیتالیا ئەو وڵاتە براوەیە بوو، کە هەر لە سەرەتاوە بە بەندەکانی کۆنگرەی ئاشتی پاریس رازینەبوو، خۆی بەبێبەشکراو دەزانی و هەر لە دوای کۆنگرەی ئاشتیی پاریسەوە، گەلی ئیتالیا گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کە دەستکەوتەکانیان هێندەی زیانەکانیان نەبووە لە جەنگدا، بۆیە ئەمانیش هەر لەو کاتەوە پێداگر بوون لەسەر گۆڕینی رێککەوتننامەی ئاشتیی پاریس. هەروەها، ژاپۆنیش کە براوەی جەنگ بوو، هەمان هەڵوێستی ئیتالیای هەبوو.

جگە لەمانە یەکێکی تر لە هۆکارەکانی کەوتنەوەی جەنگی دووەمی جیهان ، لاوازی و بێدەسەڵاتی کۆمەڵەی گەلان بوو لە پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی و چارەسەرکردنی کێشە نێودەوڵەتییەکان بە شێوازێکی ئاشتییانە، چونکە ئەو شکستانەی کە ئەم کۆمەڵە نێودەوڵەتییە لە کێشەکانی مەنشووریا و حەبەشە و چەندین کێشەی تر خواردی، وایانکرد کە بەشێکی زۆر لە وڵاتان جارێکی تر پەنا بۆ شێوازە کلاسیکییەکە بەرنەوە لە چارەسەرکردنی

کێشەکانیان، وەك پەنابردن بۆ چەك و هاوپەیمانێتی دوو قۆڵی و سێ قۆڵی لە دەرەوەی کۆمەڵەی گەلان و پەنابردن بۆ خۆپڕچەککردن و هتد، کە ئەمانە هەمووی رۆڵی گەورەیان هەبوو لە بەرەو جەنگبردنی جیهان لەو کاتەدا.

دەرکەوتنی سیستەمە فاشی و تۆتالیرییەکانی ئەوروپا لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا، هۆکارێکی تری زۆر بەهێزی کەوتنەوەی جەنگی دووەمی جیهان بوو، چونکە دەرکەوتنی هەر یەکە لە فاشییەکانی ئیتالیا و نازییەکان لە ئەڵمانیا، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر گۆڕینی ئاراستەی رووداوەکان لە ئەوروپا، لەبەر ئەوەی هەر یەکێك لەمانە بۆ گێڕانەوەی هێز و پێگە نێودەوڵەتییەکەی خۆی کاری دەکرد، لەم پێناوەشدا بە هەموو رێگاکاندا دەڕۆیشت، تەنانەت داگیرکاریش، لەوانە ئیتالیا حەبەشەی داگیرکرد و لە کۆمەڵەی گەلان کشایەوە، هەروەها هەنگاوەکانی ئەڵمانیا بەرەو لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی بەندەکانی ڤێرسای لەڕێگەی هێرش و چەکەوە، ئەمانە هەمووی رۆڵی گەورەیان هەبوو لەوەی کە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان تەواو ئاڵۆز و پڕ کێشە بکەن و بە ئاقاری شەڕدا ببەن، جگە لەوانەش، زیادبوونی رۆڵی سەربازییەکان لە ژاپۆن و پشتیوانییەکان لە فراوانخوازیەکانی ژاپۆن لە چین و مەنشووریا، سەرەنجام ئەم سێ دەسەڵاتە بەرژەوەندییەکانیان لەیەکتر نزیك بووەوە و بوون بە جەمسەرێکی نوێ لە جیهاندا.

سەرەڕای ئەمانە، هەڵوێست و سیاسەتی هەریەکە لە بریتانیا و فەرەنسا لەو کاتەدا، یەکێکی تر بوو لە هۆکارەکانی کەوتنەوەی جەنگی دووەمی جیهانی یەکەم، چونکە ئەو سیاسەتی هێورکردنەوە و خۆ لە شەڕپاراستنی کە ئەوان پیادەیان دەکرد، هاندەرێکی گرنگ بوو بۆ هیتلەر و مۆسۆلینی و تەنانەت سەربازییەکانی ژاپۆنیش، کە لە هەنگاوە فراوانخوازییەکانیان بەردەوام بن، لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا هەر یەکە لە بریتانیا و فەرەنسا ئەو سیاسەتەیان بەکاردەهێنا کە بریتی بوو لە دوورکەوتنەوە لە شەڕ دژی ئیتالیا و ئەڵمانیا و ژاپۆن و ئەم ئاراستەیەش، ئاراستەیەکی گشتی بوو لە ئەوروپا، هەر لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە تا کۆنگرەی میونخی ١٩٣٨ کە لەوێدا گەیشتە لوتکە، چونکە هەر یەکە لە بریتانیا و فەرەنسا لەو کاتەدا گیرۆدەی کۆمەڵێك کێشە و گرفتی نێوخۆیی بووبوون، لەلایەکەوە ئەمان نەیاندەویست جارێکی تر رووبەرووی کارەساتێکی مرۆیی لە چەشنی کارەساتەکەی جەنگی یەکەمی جیهان ببنەوە، هەروەها لەڕووی ئابوورییەوە لە دۆخێکی ئابووری دژواردا بوون، بەتایبەتی بەهۆی قەیرانی داراییەوە و دوای قەیرانیش، هەروەها لە ناوخۆوە لە کێشەیەکی

سیاسییدا بوون، کە بەچەندین قەیرانی وەزاریدا تێپەڕدەبوون، ئەمانە و هاوکات، ئەوان بەو بارودۆخەی کە هەبوو و خۆیان لە کۆنگرەی ئاشتیی پاریسدا دایان ڕشتبوو، رازیبوون، لەلایەکی تریشەوە لە ناو فەرەنسا لە پاڵ هەموو ئەو هۆکارانەدا، هۆکاری دوولەتبوونیش هەبوو، چونکە لەو کاتەدا ناوەندی سیاسیی فەرەنسی بووبوون بە دوو ئاراستەوە، ئاراستەیەکیان لەگەڵ پاراستنی هێمنی و سیاسەتی هێورکردنەوە و خۆدوورخستنەوە لە جەنگ بوو، ئاراستەیەکی تریشیان لەگەڵ جەنگدا بوو، ئەمە لەکاتێکدا کە لەو کاتەدا فەرەنسا بەسەر راستڕەو و چەپڕەویشدا دابەش بووبوو و بەشێك لە راستڕەوەکان سەرسامی خودی کەسایەتی هیتلەر بوون، هەروەها لەڕووی سەربازیشەوە فەرەنسا لەو کاتەدا زۆر لاواز بوو، کە ئەمانە هەمووی خاڵی بێهێزی بوون بۆ فەرەنسا، ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئەو گۆشەگیری و بێ هەڵوێستییەی ئەمەریکا لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە لە بەرانبەر رووداوەکانی ئەوروپا گرتبوویەبەر، هاندەرێکی تر بوو بۆ سەرکێشییەکانی هیتلەر. هەموو ئەمانەی باس کران وایانکرد کە هیتلەر هێندەی تر لەسەر هەنگاوەکانی سووربێت و جیهان بەرەو جەنگ بەرێت.

لەسەر هەموو ئەمانەشەوە، هۆکارە ئابووری و کۆلۆنییەکان، هۆکارێکی تری جەنگەکە بوون، لەبەر ئەوەی ئەڵمانیا لە نێوان هەردوو جەنگدا لەڕووی ئابوورییەوە بە شێوەیەکی زۆر خێرا و چاوەڕواننەکراو لە پێشکەوتندا بوو، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە تەواوی بازاڕ و سەرچاوەی ماددە خاوەکان و بواری وەگەڕخستنی سەرمایە لەدەست بریتانیا و فەرەنسا و ئەمەریکادا بوو، بۆیە جارێکی تریش لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا، ئەڵمانیا داوای دووبارە دابەشکردنەوەی جیهان و داگیرگەکان دەکات و هەر یەکە لە ئیتالیا و ژاپۆنیش بەهۆی نزیکیان لە بەرژەوەندییەکانیانەوە، هەمان داواکاریان دەبێت، کە ئەمەش راستەوخۆ دەبێتە ترس بۆ بەرژەوەندییەکانی هەر یەکە لە ئینگلیز و فەرەنسا و ئەمەریکا و لێکنزیکبوونەوەیان، کە دواجار ئەمانیش بەهۆی بەرژەوەندییەکانیانەوە لەیەك نزیکدەبنەوە و هاوپەیمانێتییەك دروست دەکەن. لە پاڵ هەموو ئەو هۆکارانەش ئەو رۆڵەی کە قەیرانی دارایی گێڕای لە زەقکردنەوەی سەرجەم ئەو هۆکارانەی باس کران، یەکێکی تر بوو لە هۆکارەکانی بەرەو جەنگ رۆیشت. کەواتە رەوتی رووداوەکان هەروەك پێش جەنگی یەکەمی جیهان، بەر لە جەنگی دووەمی جیهانیش وردە وردە زلهێزەکانی جیهانی بەسەر دوو جەمسەری دژیەکدا دابەش کرد، کە ئەم دوو جەمسەرە رۆژ بە رۆژ بەرەو ئاقاری جەنگ دەڕۆیشتن و خۆیان بۆ شەڕێکی تر سازدەدا و سەرەنجامیش بە داگیرکردنی پۆلەندا لەلایەن ئەڵمانیاوە، ئەم شەڕە دەستی پێکرد.

## سێیەم: ڕووداوەکانی جەنگەکە

### هێرشی ئەڵمانیا بۆ سەر پۆڵەندا

لە بەرەبەیانی ١ی ئەیلوولی ١٩٣٩دا، هیتلەر سوپاکانی خزاندە نێو خاکی پۆڵەنداوە، هەرچەندە لەو پەیمانەش ئاگادار بوو کە فەرەنسا و ئینگلیز بۆ یارمەتیدانی پۆڵەندا لە کاتی هێرشی ئەڵمانیادا، بە پۆڵەندایان دابوو، لەگەڵ چوونە ناوەوەی سوپای ئەڵمانیا بۆ پۆڵەندا، هەریەکە لە بریتانیا و فەرەنسا ئەڵمانیایان ئاگادارکردەوە کە لە پۆڵەندا بکشێتەوە، بەڵام ئەڵمانیا گوێی بۆ داواکانیان نەگرت، بۆیە لە شەوی ٣ی ئەیلوولدا ئەوانیش جەنگیان لە دژی ئەڵمانیا ڕاگەیاند، بریتانیا و فەرەنسا لە سەرەتاوە تەنها شەڕیان ڕاگەیاند و هیچ کردارێکی سەربازییان ئەنجام نەدا، چونکە تا ئەو کاتەش پێیان وابوو تەنها ڕاگەیاندنی شەڕ بەسە بۆ ئەوەی هیتلەر هێرشەکانی لە دژی پۆڵەندا رابگرێت، سەبارەت بە ئەمەریکاش بە هەمان شێوەی جەنگی یەکەمی جیهانی ، بێلایەنی خۆی ڕاگەیاند.

ئەڵمانیا لە چەند قۆڵێکەوە هێرشەکانی بۆ سەر پۆڵەندا بەرێخست و لە بەرئەوەی سوپای ئەڵمانی زۆر لە سوپای پۆڵەندی پێشکەوتوتر و پڕچەکتر و بەژمارە زیاتر بوو، بۆیە زۆر بە خێرایی توانیان هێڵەکانی بەرگری پۆڵەندا تێك بشکێنن و بەرەو وارشۆی پایتەخت هەنگاو بنێن، کە سەرەڕای ئەو بەرگرییە بێ وێنەیەی پۆڵەندییەکان کردیان، بەڵام لە ٢٨ی ئەیلوولدا سوپای ئەڵمانی توانی بە تەواوەتی بچێتە ناو وارشۆوە و کۆتایی بە بەرگریی پۆڵەندی بهێنێت، لەلایەکی تریشەوە، لە ١٧ی ئەیلوولدا، لە ڕۆژهەڵاتەوە هێرشی هێزەکانی ڕووسیا بۆ سەر پۆڵەندا دەستی پێکردەوە و بەپێی ئەو ڕێککەوتنەی کە پێشتر لەگەڵ ئەڵمانیادا بەستبووی، دەستی بەسەر ئەو ناوچانەدا گرت، کە لە ڕێککەوتنەکەدا هاتبوو، بەم جۆرەش پۆڵەندا کەوتە نێوان دوو بەرداشی گەورەوە و ناچار بوو خۆی بدات بەدەستەوە و کۆتایی بە شەڕی پۆڵەندا بێت. هەر لە هەمان ڕۆژی خۆبەدەستەوەدانی پۆڵەندادا لە ٢٨ی ئەیلوولی ١٩٣٩، پەیماننامەیەکی نوێ لە نێوان ئەڵمانیا و سۆڤێت لە مۆسکۆ مۆرکرا، کە تیایدا سنووری ناوچە داگیرکراوەکانی پۆڵەندایان لە نێوان هەردوولا دیاری کرد، بەپێی ئەو ڕێککەوتنەش لیتوانیا بەر ڕووسیا کەوت و لە بەرانبەریشدا ناوچەی نفوزی ئەڵمانیا لە پۆڵەندا فراوانتر بوو، بەشێوەیەکی گشتی پۆڵەندا کرا بەدوو بەشەوە، بەشەکەی بەر ئەڵمانیا کەوتبوو ٢٢ ملیۆن دانیشتوانی تێدا بوو، بەشەکەی ڕووسیاش ١٣ ملیۆن.

## داگیرکردنی فینلاند لەلایەن رووسیاوە

دوای ئەوەی رووسیا دەستی بەسەر بەشی رۆژهەڵاتی پۆڵەندادا گرت، هەوڵی دەدا هێڵێکی بەرگری لەبەرانبەر رۆژئاواییەکان دابمەزرێنێت، بۆیە لە ٢٩ی ئەیلوولی ١٩٣٩دا هاوپەیمانێتی ئاڵوگۆڕی هاریکاری لەگەڵ ئیستیوانیا بەست و بەپێی ئەو هاوپەیمانێتییە چەند بنکەیەکی وشکانی و دەریایی لە ئیستیوانیا دامەزراند، دوای ئەوەش هەریەکە لە لاتیڤیا و لیتوانیا، رێگەیان بە رووسیا دا کە بنکەی سەربازی لە خاکی ئەواندا دابمەزرێنێت، لە پاش ئەم هەنگاوانە سۆڤێت داواکارییەکی هاوشێوەی خستە بەردەست فینلاند، کە تیایدا داوای لێکردبوو لە هەندێك دوورگە و کەنداو و بەندەری فینلاندی دەست هەڵگرێت و لەم ناوچانەدا بنکەی دەریایی و ئاسمانی سۆڤێتی دابمەزرێت، تا سۆڤێت بتوانێت هێڵی بەرگریکردن لە لینینگراد بەهێزتر بکات، بەڵام فینلاند ئەمەی رەتکردەوە، هەر بۆیە لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٩دا سۆڤێت هێرشی کردە سەر فینلاند و (هیلسنکی) پایتەخت و چەند شارێکی تری بە فرۆکە بۆمباران کرد، لێرەشەوە شەڕ لە نێوان فینلاند و رووسیا دەست پێیکرد، ئەگەر چی لەم شەڕەشدا هاوپەیمانان پشتگیرییەکی زۆریان لە فینلاند کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ٣٠ی مارتی ١٩٤٠دا سۆڤێت توانی پەیماننامەیەك بەسەر فینلاندا بسەپێنێت، کە تیایدا فینلاند دەستبەرداری چەند ناوچەیەك بوو بەو جۆرەی کە رووسیا دەیویست.

## هێرشی ئەڵمانیا بۆ سەر دانیمارك و نەرویژ

بەشێکی زۆر لە ئاسنی خاوی ئەڵمانیا لە سویدەوە دەهات، بەڵام لەو مانگانەدا، کە بەلتیك بەهۆی بەستەڵەکەوە دەیبەست، ئەڵمانیا ناچار دەبوو لە رێگەی میناى نارڤکی نەرویژییەوە ئەو کەرەستانە بەدەست بهێنێت، بۆیە بریتانیا پلانێکی دانا بۆ ئەوەی ئەو بەندەرە دەستبەسەر بکات، یان خودی ئەو کانە ئاسنانە تێك بدات کە لە سوید هەبوون، کە بەمەش مەبەستی کردنەوەی بەرەیەکی تری جەنگ بوو بەرانبەر هیتلەر لە ناوچەکانی ئەسکەندەناڤیا، بەڵام هیتلەر زۆر بە توندی وەڵامی ئەمەی دایەوە و تەنها بەوەشەوە نەوەستا رێگاکانی لەو ناوچەیەدا بپارێزێت، بەڵکو بڕیاری دا هەر ناوچەکە داگیر بکات، بۆیە لە بەرەبەیانی ٩ی نیسانی ١٩٤٠دا هێزەکانی ئەڵمانیا بێ بەرگریکردنێکی ئەوتۆ، دانیمارکیان

داگیرکرد، هەروەها لە چەند شوێنێکەوە بە درێژایی کەناری نەرویژی سوپای ئەڵمانیا دابەزی داگیری کرد، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە هێزێکی دەریایی فەرەنسی بریتانی لە کەنار ئاوەکانی نەرویژدا، کە کەشتییەکانی ئەڵمانیای پێدا تێدەپەڕی، ناوچەکەیان مینرێژ دەکرد.

هاوپەیمانان هەوڵێکی زۆریان دا بۆ ئەوەی نەرویژ لە دەستی ئەڵمانیا رزگار بکەن، لە ١٥ و ١٦ی نیساندا شەڕێکی قورسیان ئەنجام دا، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، دوای ئەوەش سوپایەکیان لە هەریەك لە سوپای فەرەنسی و ئینگلیزی و پۆلەندی و نەرویژی دامەزراند، بەنیازی داگیرکردنی بەندەری نارڤك، هەرچەندە لە سەرەتادا تا رادەیەك سەرکەوتن، بەڵام بەهۆی خراپی دۆخی بەرەی رۆژئاواوە، ناچار بوون پاشەکشە بکەن و ناوچەکە بدەن بە دەستەوە، پاشای دانیمارك و وەزیرەکانیشی بەرەو بریتانیا هەڵاتن، تا لەوێوە لە دژی ئەڵمانیا بجەنگن. بەهۆی ئەم سەرکەوتنانەوە تەواوی سەرچاوەکانی کەرەستە خاوەکان و بەشێکی زۆر لە ناوچەی بەڵتیك و ئەسکەندەناڤیا کەوتنە ژێر دەستی ئەڵمانیا، کە هەر ئەم سەرکەوتنانەش بوونە هۆکاری رووخانی حکومەتەکەی (چەمبەرلین) لە ناوەوەی بریتانیا، دوای ئەوە حکومەتێکی ئیئتیلافی بە سەرۆکایەتی (وینستۆن چەرچل) لە ١٠ی ئایاری ١٩٤٠ دامەزرا و چەرچڵ بوو بە پیاوی جەنگ لە بریتانیا.

### هێرشی ئەڵمانیا بۆ سەر ناوچەی زەوییە نزمەکان (هۆڵەندا)وفەرەنسا

دوای نزیکەی مانگێك لە داگیرکردنی نەرویژ، ئەڵمانیا جارێکی تر دەستی بە هێرشەکانی کردەوە بۆ سەر بەرەی رۆژئاوا، ئەم هێرشەی ئەڵمانیا جگە لە سنوورەکانی فەرەنسا، هەر یەك لە هۆڵەندا و بەلجیکاشی گرتەوە، لە ١ی ئایاری ١٩٤٠دا ئەڵمانییەکان لەیەك کاتدا هێرشیان کردە سەر هەریەك لە هۆڵەندا و بەلجیکا و لۆکزمبۆرگ بێ راگەیاندنی پێشوەختی شەڕ، سوپای ئەڵمانی لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا دەستی بەسەر لۆکزمبۆرگدا گرت، هۆڵەنداش توانی بۆ ماوەی پێنج رۆژ بەرگری بکات، بەڵام دواتر خۆی دا بەدەستەوە و پاشا و حکومەتەی بەرەو بریتانیا هەڵاتن بۆ ئەوەی لەوێوە بەردەوامی بە جەنگ بدەن، دوای ئەمە ئەڵمانیا لەیەك کاتدا هێرشێکی تری بۆ سەر بەلجیکا و فەرەنسا دەست پێکرد، لەم هێرشەدا بەلجیکا داوای هاریکاریی لە فەرەنسا و بریتانیا کرد، سوپای فەرەنسی بریتانی چوونە ناو خاکی بەلجیکاوە بۆ بەرگریکردن، بەڵام سوپای ئەڵمانی زۆر بەخێرایی توانی هێڵەکانی بەرگری سوپای هاوپەیمانان ببەزێنێت و لە رووبای (میس) بپەڕێتەوە و بگاتە دارستانەکانی ئەردن و بەشێکی تریشیان

بەرەو رۆژئاوا و شاری ئەمیان بچن، هەندێکی تریشیان بەرەو باشووری شاری (ریمس) بکەونە ڕێ، بەم جۆرەش ڕێ لەبەردەم سوپای ئەڵمانی والاّ بوو بۆ هێرشکردنە سەر کەنارەکانی باشووری رۆژهەلاّتی فەرەنسا و پاشای بەلجیکاش (لیۆبۆلدی دووەم)، ناچار بوو داوای ئاگربەست بکات، هەروەها سوپای هاوپەیمانانیش بەناچاری خاکی بەلجیکای بەجێهێشت.

## هێرش بۆسەر فەرەنسا

بە سەرکەوتنەکانی ئەڵمانیا لە ناوچەکانی زەوییە نزمەکان، بارودۆخی نێوخۆیی فەرەنسا تا دەهات ئاڵۆز دەبوو و بەرەو شڵەژانێکی سیاسیی دەچوو، فەرەنسا لە ناوخۆدا بەسەر چەند رەوتێکی سیاسییدا دابەش بوو و یەکڕیزی ناوەوەی فەرەنسا پەرتەوازە بوو، لەلایەکی تریشەوە سوپای فەرەنسا هەرچەندە لەڕووی ژمارەوە لە سوپای ئەڵمانی کەمتر نەبوو، بەلاّم لەڕووی چەك و پلان و سەرکردایەتییەوە دواکەوتووتر بوو، چونکە لەو کاتەدا سوپا لە ژێر دەستی چەند ژەنەراڵێکی دواکەوتووی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهاندا بوو، کە کەمتر لە شێوازی نوێی جەنگ شارەزابوون، بۆیە زۆرینەی ئەو سەرکردە سەربازییانە لایەنگری ئاگربەست بوون، بەلاّم لەو کاتەدا یەکێك لە سەرکردە سەربازییە بەناوبانگەکانی فەرەنسا کە (ژەنەرال شارل دیگۆل) بوو، دژ بە بیرۆکەی خۆبەدەستەوەدان و ئاگربەست بوو، ئەو هەوڵی دا چاکسازی لە سوپادا بکات و لە بەرگری بەردەوام بێت ،بۆیە سوپای فەرەنسی هەوڵیان دا هێڵەکانی بەرگری خۆیان لەسەر سنورەکانی باکوور و باکووری رۆژهەلاّت توند و بەهێز بکەن، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی بەر بە هێرشی بەفراوانی ئەڵمانەکان بگرن، ئەوە بوو سوپای هاوپەیمانان لە ئەنجامی هێرشەکانی ئەڵمانیاوە بوون بە دوو لەتەوە و سوپای فەرەنسیش دەستی بە پاشەکشە کرد، لەم کاتە ناسکەی فەرەنساشدا بوو، کە ئیتالیا دوای ئەوەی زانی ئەڵمانیا روو لە سەرکەوتنە، بۆ ئەوەی لە دەستکەوتەکان بێبەش نەبێت شەڕی لە دژی هاوپەیمانان راگەیاند، ئەمەش ئەوەندەی تر کێشەی فەرەنسای قوڵ کردەوە، چونکە بەشێك لە سوپاکەی بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئیتالیەکان تەرخان کرا و ئەمەش ئەرکی فەرەنسییەکانی ئەوەندەی تر قورس کرد، هەر بۆیە هێرشە بەردەوامەکانی ئەڵمانیا بەرەو پاریسی پایتەخت کەوتەڕێ و فەرەنسییەکانیش ناچار بوون پایتەختی وڵات بۆ شاری (تۆر) بگوازنەوە و دوای ئەوەش بیبەنە شاری (بۆرد) و داوای یارمەتیش لە بریتانیا و ئەمەریکا بکەن، لە هەمان کاتیشدا بیریان لە ئاگربەستیش دەکردەوە، بەلاّم بارودۆخەکە رۆژ بە رۆژ دژوارتر دەبوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەڵمانەکان

چوونه ناو شاری پاریسەوە، ئەوە بوو (پۆل رینۆ) کە لەو کاتەدا سەرۆك وەزیران بوو، دەستی لەکارکێشایەوە و لە شوێنی ئەودا (ژەنەرال پیتان) حکومەتێکی نوێی لە شاری (فیشی) دامەزراند و (ژەنەرال دیگۆل)یش بەرەو بریتانیا وڵاتی جێهێشت و لەوێ حکومەتێکی بەرهەڵستکاری بەناوی حکومەتی فەرەنسای ئازادەوە دامەزراند.

هاتنەسەرکاری حکومەتی فیشی لە فەرەنسا مانای خۆبەدەستەوەدانی فەرەنسییەکان بوو، چونکە هەر لەدوای دەستبەکاربوونییەوە، ئەم حکومەتە داوای راگرتنی جەنگ و ئاگربەستی لە ئەڵمانیا کرد و لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤٠یشدا گفتوگۆیان لە هەمان فارگۆنی ئەو شەمەنەفەرەی کە لە ساڵی ١٩١٨دا ئەڵمانیا تیایدا بە ئاگربەست و مەرجەکانی هاوپەیمانان رازیبوو دەست پێکرد و فەرەنسا مەرجەکانی ئەڵمانیای قەبوڵ کرد، بەپێی ئەو ئاگربەستەش ئەڵمانیا نزیکەی نیوەی خاکی فەرەنسای داگیرکرد، تەنها چەند ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی (فیشی) نەبێت، کە حکومەتێکی بەناو سەربەخۆی لێدامەزرابوو بەناوی حکومەتی فیشییەوە، هەروەها دەبوو فەرەنسا تەواوی خەرجییەکانی هێزی داگیرکەر لەئەستۆ بگرێت و سەرجەم سوپای دەریایی و وشکانیشی تەنها لە ١٠٠ هەزار سەربازدا بهێنێتەوە، هاوکات دەبوو فەرەنسا سەرجەم دیلە ئەڵمانییەکان ئازاد بکات، بەڵام ئەڵمانیا دیلە فەرەنسییەکان بهێڵێتەوە کە ژمارەیان یەك ملیۆن و هەشت هەزار کەس دەبوو، ناوچەی ئەلزاس و لۆرینیش بگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیا، داگیرگەکانی فەرەنساش لە نێوان هەردوو حکومەتی (فیشی) و حکومەتەکەی (دیگۆل)دا دابەش کرا، کە باکووری ئەفریقا و سوریا و لوبنان بەر حکومەتی فیشی کەوت و کامیرۆن و ئەفریقای ئیستوایی بەر حکومەتی دیگۆل کەوتن، مەرجەکانی ئیتالیاش ئەوە بوو کە فەرەنسا ناوچەیەکی دیاریکراو لە باشووری فەرەنسا و داگیرگەکانی لە چەك و سەرباز داماڵێت و سەرجەم کەرەستە جەنگییەکانی بەرەکانی ئیتالیا بدات بە دەستی ئیتالیاوە.

## شەڕ لە ئەفریقا و دەریای ناوەڕاست

دوای ئەوەی مۆسۆلینی لە پاڵ هیتلەردا چووە جەنگەوە، هەر زوو چاوی بڕییە ناوچەکانی ئەفریقا، کە ناوچەیەکی گرنگ بوون بۆ ئیتالیا و بەشێکی ئەو ناوچەیە لەژێر دەسەڵاتی بریتانیادا بوو، لەو کاتەشدا بریتانیا سەرقاڵی جەنگ بوو لەگەڵ ئەڵمانیا، جەنگەکەش گەیشتبووە لوتکە و ئینگلیزەکانیش لەدۆخێکی خراپدا بوون، هەر بۆیە مۆسۆلینی ئەم بارودۆخەی قۆستەوە و لە تەمموزی ١٩٤٠دا چووە ناو کینیا و سوودان و دواتریش سۆماڵی بریتانییەوە، بەمەش هەڕەشەیان کەوتە سەر مەڵبەندی بریتانییەکان لە عەدەن و دەریای ناوەڕاست، دوای شەش مانگ لەو هێرشانە سوپای بریتانیا، دژە هێرشێکیان کردە سەر ئیتالیا و لە رۆژهەڵاتی ئەفریقا تێکیان شکاند و لە ئەریتریا و ئەدیسەبابا دەریان کرد و لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤١دا پاشماوەی هێزەکانی ئیتالیا ناچاربوون بەبێ مەرج خۆیان بدەن بەدەستی بریتانیاوە.

لەلایەکی تریشەوە لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٠دا هێزە ئیتالییەکان لە لیبیاوە سنووری میسریان بەزاند و بە جۆرێك پێشڕەویان کرد کە ترسێکی گەورەیان بۆ بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لە کەنالی سوێس دروست کرد، بۆیە بریتانییەکان سوپایەکی گەورەیان بە سەرکردایەتی ژەنەراڵ (ویڤل) بە هاوبەشی لەگەڵ هێزی (کۆمەنلت)* نارده سەر سوپای ئیتالیا و لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤١دا دەستیان بەسەر یەکێك لە بنکە دەریاییە گرنگەکانی ئیتالیادا گرت لە بەرقە، دواتریش بە تەواوی ئیتالییەکانیان لە بەرقە وەدەرنا و نزیکەی ١٠٠ هەزار سەربازی ئیتالی بەدیل کەوتنە دەستی بریتانییەکان، بەڵام ئەڵمانیا کاتێك ئەم بارودۆخەی ئیتالیای بیست لە ناوچەی ئەفریقا، زۆر خێرا هەوڵی دا بەهانای ئیتالییەکانەوە بچێت، تایبەت دوای ئەوەی بریتانییەکان لیبیایان داگیرکرد، کە ئەمە ترسێکی گەورە بوو بۆ ئەڵمانەکان، چونکە هەڕەشە بوو بۆ سەر باشووری ئەوروپا و لەوێشەوە کێڵگە نەوتییەکانی رۆمانیا، لەوکاتەشدا بریتانییەکان هێزێکی گەورەی خۆیان لە باکووری ئەفریقاوە رەوانەی یۆنان کردبوو، بۆیە لە بەهاری ١٩٤١دا هەڵوێستی بریتانییەکان لە باکووری ئەفریقا تاڕادەیەکی زۆر لاواز بوو، هەر بۆیە ئەڵمانەکان هێزێکی وشکانی و ئاسمانی پڕچەکی خۆیان بە

---

* هێزی یەکگرتووی گەلانی بریتانیا، کە لە گەلانی هیند و باشووری ئەفریقا و نیوزیلاند و ئوستراليا پێکهاتبوو.

سەرکردایەتی ژەنەرال (ئرین رۆمل) ناردە ناوچەکە و بەهاریکاری لەگەڵ ئیتالییەکاندا توانیان سەرکەوتنێکی خێرا بەدەست بهێنن و بریتانییەکان ناچار بکەن بکشێنەوە بۆ ناو میسر و شکستەکەشیان بەجۆرێك بوو کە هێندەی نەمابوو سەرلەبەری میسریش لەدەست بدەن.

## شەڕ لە بالکان و دەریای ناوەڕاست

بەرەیەکی تری جەنگی دووەمی جیهان، شەڕی باڵکان و دەریای ناوەڕاست بوو، کە ئیتالیا دەستپێشخەری ئەم شەڕە بوو و مۆسۆلینی ئەم جەنگەی هەڵگیرساند، کە بە لای هەندێك سەرچاوەوە ئەمە لاساییکردنەوەی هیتلەر بوو، ئەوە بوو لە ٢٨ی کانوونی دووەمی ١٩٤٠دا هێزەکانی ئیتالیا هێرشیان کردە سەر بنکە یۆنانییەکان لە ئەلبانیا، بەڵام بە پێچەوانەی پێشبینییەکانی خۆیانەوە، کە پێیانوابوو زۆر بەخێرایی داگیری دەکەن، لەو هێرشەدا شکستیان هێنا و یۆنانییەکان بەرگرییەکی زۆریان لە خاکی خۆیان کرد، بەڕادەیەك نەك هەر شکستیان نەهێنا، بەڵکو هێندەی نەمابوو چەند کیلۆمەترێکیش بچنە ناو خاکی ئەلبانیاوە.

لەلایەکی ترەوە ئەڵمانییەکان لەو کاتەدا لە خۆسازدانێکی گەورەدا بوون بۆ ئەوەی دەست بەسەر ناوچەی بالکاندا بگرن، چ لەڕووی سیاسییەوە و چ لەڕووی ئابوورییەوە، بەتایبەت کە ئەڵمانیا لەو کاتەدا توانیبووی پێگەیەکی بەهێز لەو وڵاتانەدا لەڕێی دیپلۆماسیی و فشاری ئابوورییەوە دروست بکات، بەڵام ئەو شکستەی ئیتالیا لە یۆنان سەری لە هیتلەر شێواند و دۆخەکەی لێ ئاڵۆز کرد، هەر بۆیە ئەڵمانەکان دەستیان بە پێشڕەوی کرد بۆ ناوچەی بالکان، ئەوەبوو لە نیسانی ١٩٤١دا ئەڵمانیا داوای لە رۆمانیا کرد رێ بەسوپاکانی بدات بە خاکی ئەودا تێبپەڕن، لە ژێر فشاری زۆری هیتلەردا رۆمانییەکان بەمە رازیبوون، دوای رۆمانیاش، هەر یەکە لە هەنگاریا و بولگاریا بە هەمان چارەنووسی رۆمانیادا تێپەڕین، دواتریش گەیشتە سەر یوگسلاڤیا، بەڵام یوگسلاڤیا بەمە رازینەبوو و لە ناوەوەی یوگسلاڤیا شۆڕشێك لە دژی جێنیشینی یۆگسلاڤی (پۆل) دروست بوو ،کە رەزامەندی لەسەر هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەڵمانیا و ئیتالیا دەربڕیبوو، ئەم جێنشینە لابرا و لە شوێنی ئەودا حکومەتێکی دژە ئەڵمانی دامەزرا، هەر بۆیە لە ٦ی نیسانی ١٩٤١دا ئەڵمانیا شەڕی لەدژی یوگسلاڤیا راگەیاند و لە ماوەی ١١ رۆژدا داگیری کرد.

هەر لە ٦ی نیسانیشدا بوو هێزەکانی ئەڵمانیا هێرشیان کردە سەر یۆنان و ناچاریان کرد لە تراقیای رۆژئاوایی پاشەکشە بکەن، ئەگەرچی بریتانیا هاریکاری زۆری یۆنانییەکانی کرد

بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەیەی لە نێوانیاندا بوو، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، چونکە هێزی بریتانی و یۆنانی و کۆمەنلت نەیانتوانی بەر بە هێرشەکانی ئەڵمانیا بگرن و لە دواجاردا لە ٢١ی نیساندا سوپای یۆنانی خۆی بەدەستەوەدا. سەبارەت بە سوپاکەی بریتانیا و هێزی کۆمەنلتیش، نزیکەی ٤٠ هەزاریان چوونە دوورگەی کریتەوە، بەڵام نزیکەی ١٥ هەزار سەرباز و بەشی هەرە زۆری زەخیرە سەربازییەکانیان لەدەستدابوو، قۆناغی کۆتایی شەڕی بالکانیش ئەو هێرشە بوو، کە ئەڵمانیا لەڕووی ئاسمانییەوە کردییە سەر ئەو سوپایەی بریتانیا و هێزی کۆمەنلت کە چووبوونە دوورگەی کریتەوە و زیانێکی گیانی و ماڵی زۆری لێدان و ناچار بوون بەرەو میسر پاشەکشە بکەن، بەمەش دوورگەکە کەوتە ژێر دەستی ئەڵمانەکانەوە.

بەم جۆرەش بەر لە هاوینی ١٩٤١دا تەواوی وڵاتانی ڕۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەوروپا و ناوچەکانی بالکان، یان لەژێر کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی ئەڵمانیا بوون یان پاشکۆی ئەو بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بزووتنەوەیەکی فراوانی بەرەنگاربوونەوە و بەرهەڵستکاری لە دژی ئەڵمانیا لەو وڵاتانە دەرکەوتبوو.

## هێرشی ئەڵمانیا بۆ سەر بریتانیا

دوای هەرەسهێنانی فەرەنسا و کشانەوەی لە جەنگ، بریتانیا بەتەواوی کەوتەبەر ترس و هەڕەشەی ئەڵمانیا، تایبەت دوای ئەوەی بەتەنیا لە گۆڕەپانەکەدا مایەوە، هەر بۆیە بەشی زۆری شارەزایانی سیاسیی و سەربازی لەوکاتەدا پێیان وابوو بریتانیاش هەرەس دەهێنێت، چونکە بارودۆخی بریتانیا لەو کاتەدا زۆر خراپ بوو، لەبەرئەوەی لەلایەکەوە زەرەر و زیانێکی زۆری لە جەنگەکانی پێشووتردا لێکەوتبوو، لەلایەکی تریشەوە کشانەوەی فەرەنسا تەرازووی هێزی بەلای ئەڵمانیەکاندا خستبوو، بەڵام ئەوەی بریتانیای هێشتەوە، ئەو بەرگرییە کەم وێنەیە و خۆڕاگرییە بوو کە بریتانییەکان نواندیان، بەتایبەتی دوای هاتنەسەرکاری حکومەتی چەرچڵ لە ئایاری ١٩٤٠دا، کە توانی بریتانیا لە هەرەسی یەکجارەکی ڕزگار بکات.

ئەڵمانییەکان دوای ئەوەی لە فەرەنسا سەرکەوتن، پرۆژەی ئاگربەستێکیان خستە بەردەم بریتانیا بەرانبەر بەوەی بریتانیا دان بەدەسەڵاتی ئەڵمانیادا بنێت لە کیشوەری ئەوروپا، بەڵام بریتانییەکان بەمە ڕازینەبوون و چەرچڵ لە گوتارێکیدا لە ١٨ی حوزەیرانی ١٩٤٠دا ئەوەی ڕاگەیاند کە بریتانیا بە پشتیوانی خۆی درێژە بەم جەنگە دەدات، هەر بۆیە هیتلەر پلانێکی جەنگی بەناوی (پرۆسەی شێری دەریا)وە بۆ جەنگ لە دژی بریتانیا داڕشت، کە ناوەرۆکی

پلانەکە بریتی بوو لە پرۆسەی دابەزین لە بەرەیەکی بەرفراوانی کەنارەکانی بریتانیا و دواتریش هێرشکردن بۆ داگیرکردنی لەندەن، پلانەکەیان بە هێرشێکی زۆر چڕ و توند دەست پێکرد کە بریتانییەکان بە (شەڕی بریتانیا)ی ناودەبەن، ئەوەبوو لە ١٢ی ئابەوە تا ٣٠ی ئەیلوولی ١٩٤٠ هێرشە ئاسمانییەکانی ئەڵمانیا بۆ سەر بریتانیا بەردەوام بوو، کە گەورەترین جەنگی ئاسمانی بوو لە مێژوودا و ئەڵمانیەکان نزیکەی سێ هەزار فرۆکەیان بۆ ئەو جەنگە تەرخان کردبوو، کە سەرەتای هێرشکە، بە هێرش بۆ سەر کاروانی کەشتییە بازرگانییەکانی بریتانیا دەستیان پێکرد، دوای ئەوەش بۆسەر شارە کەنارییەکانی باشووری رۆژهەڵاتی بریتانیا، ئینجا بۆسەر رادار و ئامێرە چاودێریکەرەکان، دواجاریش هێرشیان کردە سەر کارگەکانی فرۆکە و زەخیرە و چەك، کە لە ٧ی ئەیلوولدا ئەم هێرشانە گەیشتە لوتکە، کاتێك کە ئەڵمانیا بڕیاریدا هێرشەکە بەچڕی بخاتە سەر لەندەنی پایتەخت، ئەوەبوو لە ١٧ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٠ بەدواوە بە شەو و رۆژ بۆردومانە ئاسمانییەکان لەسەر لەندەن بەردەوام بوون، دواتریش هێرشەکان بەرەو شارە پیشەسازییە گەورەکانی وەك بێرمینگهام و مانچستەر و شەفێڵد دەستیان پێکرد، کە لەم هێرشانەدا بە هەزاران کەس کوژران و زیانێکی زۆر گەورەشی خستەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بریتانیا بەهۆی ئەو تۆڕە رادارە بەهێزەی کە هەیانبوو، هاوکات ئەو خۆڕاگرییە بێ وێنەیەیانەوە، توانیان خۆیان لەبەردەم هێرشەکانی هیتلەر رابگرن و درێژە بە جەنگ بدەن، هەر بۆیە هیتلەر بڕیاری دا بەشێوەیەکی کاتی پرۆسەی داگیرکردنی بریتانیا رابگرێت و لە بری ئەوە سوپاکەی رووبکاتە سۆڤیێت بۆ ئەوەی دەست بەسەر ئەو دەرامەتە سروشتی و کانزا زۆرەی رووسیا کە هەیەتی، بگرێت، تا بتوانێت لەرێی سوودوەرگرتن لەو دەوڵەمەندییەی سۆڤیێتەوە بریتانیاش داگیربکات، ئەمەش یەکەم وەرچەرخانی گەورە بوو لە رەوتی رووداوەکانی جەنگی دووەمی جیهاندا، کە بریتانیای والێکرد زیاتر سوور بێت لەسەر بەرگریکردن و لە دوا ئەنجامیشدا ئەڵمانیای ناچارکرد تاك تاکە لە بەرەکاندا شەڕ بکات.

### هێرشی ئەڵمانیا بۆسەر رووسیا

هەرچەندە لە ئابی ١٩٣٩دا ئەڵمانیا و رووسیا پەیماننامەی دەستدرێژینەکردنیان بۆ ماوەی ١٠ ساڵ بەستبوو، بەڵام پەیوەندیی نێوان ئەم دوو لایەنە زۆر بە زوویی درزی تێکەوت، ئەویش لەسەر دابەشکردنی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئەوروپا، چونکە هەر لە ساڵی ١٩٤١ەوە دەرکەوت کە ئەڵمانیا کۆنترۆڵی تەواوی بەسەر ناوچەکانی بالکان و باشووری رۆژهەڵاتی دەریای

ناوەڕاستدا سەپاند، لەولاشەوە رووسیا فراوانخوازییەکانی خۆی لە ناوچەکانی رۆمانیا و ولآتانی بەلتیك ئەنجام دا، کە ئەمە متمانەی رووسیای لای ئەلمانیا نەهێشت، لەلایەکی تریشەوە فراوانخوازییەکانی ئەلمانیا، ئەلمانیای لای رووسیا بێ متمانە کردبوو، بۆیە دوای دەستوالآبوونی ئەلمانیا لە بەرەی رۆژئاوا، ئەلمانییەکان بیریان لە هێرشکردن بۆ سەر رووسیا کردەوە، چونکە هیتلەر پێیوابوو دەتوانێت لەڕێی سەرکەوتنی بەسەر رووسیاوە، کەرەستەیەکی خاوی زۆر بەدەست بهێنێت، هاوکات ئابلۆقەیەکی ئابووری بخاتەسەر ولآتانی هاوپەیمان و دواتریش باداتەوە سەر بریتانیا و ئەویش داگیربکات، ئەوەی هیتلەری هان دا بۆ ئەو شەڕە زیاتر ئەو شکستانە بوون کە سوپای رووسیا لەبەرانبەر فینلاندا دەیان خوارد، کە وایلێکردبوو بەچاوی سووکەوە لە سوپای رووسیا بڕوانێت.

هەر چۆنێك بێت لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٠دا گفتوگۆ لە نێوان رووسیا و ئەلمانیا رووی دا، بەلآم لەم گفتوگۆیەدا بەهیچ ئاکامێك نەگەیشتن و بەپێچەوانەوە مەرجەکانی رووسیا هێندەی تر مەرامە فراوانخوازییەکانی رووسیای دەرخست و هیتلەری لە بەرانبەر رووسەکان رق ئەستوورتر کرد و سوورتری کرد لەسەر یەکلاکردنەوەی کێشەکانی لەگەڵ سۆڤێتدا، ئەوەبوو هەر دوای راگرتنی هێرشەکان بۆ سەر بریتانیا، ئەلمانەکان خۆیان بۆ هێرشکردنە سەر رووسیا ئامادە دەکرد، کە هیتلەر ئەمەی بە خۆپارێزی و بەرگری لەخۆکردن لەقەڵەم دەدا، لەبەر ئەوەی بە گوتەی ئەو، رووسیا پەیماننامەی ساڵی ١٩٣٩ی بەهێرشکردن بۆسەر رۆمانیا و ناوچەکانی بەلتیك، پێشێل کردووە. لێرەشەوە لە ناوەوەی سۆڤێتیش پرۆپاگەندە و راگەیاندنەکان دژ بە نازییەکان و ئەلمانیا دەستی پێکرد و ئەوانیش دەستیان بە کۆکردنەوەی سەرباز کرد لە ناوچەکانی پۆلەندا، ئەگەرچی ستالین هەوڵی دا ئەم جەنگە روونەدات، بەلآم هیتلەر لەسەر جەنگەکە سوور بوو.

ئەوەبوو ئەلمانیا هێزێکی گەورەی کۆکردەوە کە نزیکەی ١٥٠ یەکەی سەربازی و ٥ هەزار فرۆکە و ٣٥٥٠ تانك دەبوو، هەروەها پشتیوانی هەر یەك لە ئیتالیا و هەنگاریا و رۆمانیا و فینلاندیشی بەدەست هێنا، لەولاشەوە بریتانیا بەڵێنی بە رووسیا دابوو کە پشتگیری بکات.

لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤١دا بەبێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەکی پێشوەخت، هیتلەر هێرشی کردە سەر خاکی رووسیا و بەپێی پیلانی (باربارۆسا)، هێرشەکەی دەست پێکرد، کە بەدرێژایی بەرەیەکی ١٨٠٠ میلی لەدەریای بەلتیکی باکورەوە تا دەریای رەش لە باشووری رۆژهەلآتەوە هێرشەکە بەربلآوبوو. ئەلمانەکان لەسەرەتادا سەرکەوتنێکی زۆر خێرایان بەدەست هێنا و

توانیان تەواوی هێڵە بەرگرییەکانی سۆڤیێت ببەزێنن و هێزە چوار ملیۆنییەکەیان زۆر بەخێرایی بگەیەننە دەوروبەری لینینگراد، بەڵام لێرەوە بەرگریی بێ وێنەی رووسییەکان دەستی پێکرد و لەدوای شەش مانگ ئابلۆقەدان، سوپای ئەڵمانی ناچاربوو لە ئابلۆقەدانی ئەم شارە بکشێتەوە و رووبکاتە مۆسکۆ، کە لە تشرینی دووەمدا گەیشتە دەوروبەری مۆسکۆی پایتەخت و ئابلۆقەی دا.

بەڵام لێرە بەدواوە وردە وردە سەرەتاکانی وەستانی هێزی ئەڵمانی لەسەرکەوتن بەدەرکەوتن، چونکە هیتلەر وای دانابوو لە بەهاردا هێرشەکە بکات و سوود لە وەرزی هاوین وەربگرێت، بەڵام بەهۆی شەڕەکانی بالکان و باکووری ئەفریقاوە، جەنگەکە ماوەیەك دواکەوت، بۆیە وردە وردە کەوتە ناو وەرزی زستانەوە و سەرەتای باران بارینەوە، کە بەهۆی ئەو بارانە زۆرەوە تەواوی رێگاکان گیران و جوڵەی سوپاکەی هیتلەر تووشی ئیفلیجی بوو و لەلایەکی تریشەوە دابەزینی پلەی گەرمی بۆ ٤٠ پلەی خوار سفری سەدییەوە هێندەی دی ئەو سوپایەی پەکخست، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە ئەڵمانەکان لەکاتی دەرچوونیان هیچ حسابێکیان بۆ هاتنی وەرزی زستان نەکردبوو و کەلوپەل و جلوبەرگ و زەخیرەی زستانیان پێنەبوو، لەلایەکی تریشەوە بەرگرییەکانی رووسیا لە بەرانبەر ئەڵمانیا وردە وردە بەهێزتر دەبوو، هاوکات بەشێوەیەکی گشتیش دۆخی سۆڤیێت رۆژ بە رۆژ باشتر دەبوو بەهۆی یارمەتییەکانی بریتانیا و ئەمەریکاوە، تایبەت دوای رێککەوتنی تەمموزی ١٩٤١ی نێوان هەرسێکیان، هەر بۆیە دوای نزیکەی شەش مانگ، ئیدی وردە وردە شکستی ئەڵمانەکان دەستی پێکرد کە ئەمە دووەم خاڵی گرنگی وەرچەرخانی سەرەکیی بوو لە رەوتی رووداوەکانی جەنگی دووەمی جیهاندا، لێرەشەوە جەنگەکە زیاتر بوو بە جەنگێکی جیهانی گشتگیر و هەر یەکە لە ژاپۆن و ئەمەریکاش هاتنە ناو جەنگەکەوە و پریشکی جەنگەکە رۆژهەڵاتی دووریشی گرتەوە و سەرەتاکانی بەرەو هەرەسهێنانی ئەڵمانیاش دەستی پێکرد.

### هاتنەناوەوەی ئەمەریکا بۆ جەنگی دووەمی جیهان

ئەگەر چی ئەمەریکا لەکاتی دەستپێکردنی جەنگدا سیاسەتی گۆشەگیریی پەیڕەو دەکرد و بڕیاری بێلایەنی خۆی راگەیاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە سەرەتاوە ئەمەریکییەکان لەبەرەی ئەڵمانی دڵنیا نەبوون، ئەوە بوو هەر لەساڵی **١٩٣٧**دا (رۆزفێلد)ی سەرۆکی ئەمەریکا لە گوتارێکدا هێرشی کردە سەریان و بەوەی ناوبردن کە خولقێنەری ترسن و رێز لە یاسا نێودەوڵەتییەکان ناگرن، بەڵام لەکاتی هەڵگیرسانی شەڕدا لە سەرەتادا ئەمەریکا بەبێ

جیاوازی ئابلۆقەی هەناردنی چەکی خستە سەر هەردوو لایەنی شەڕکەر، ئەگەرچی هەر لە سەرەتاوە (رۆزفێلد) مەیلێکی زۆری بەلای هاوپەیماناندا هەبوو، بۆیە ناوە ناوە بۆ گۆڕینی یاسای بێلایەنی هەولّی دەدا، بەجۆرێك كە رێگەبدات بە ناردنی چەك و زەخیرەی سەربازی بە تایبەت بۆ هاوپەیمانان، ئەوە بوو لە **٣**ی تشرینی دووەمی سالّی **١٩٣٩**دا کۆنگرێس ئەم داواکارییەی (رۆزفێلد)ی پەسەند کرد و بەپێی ئەمەش ئەمەریکا کەرەستە جەنگییەکانی بە بریتانیاو فەرەنسا دەفرۆشت بەو مەرجەی پارەکەی بە نەخت بێت و بە کەشتی ئەمەریکیش نەگوازرێتەوە. دوای هەرەسهێنانی فەرەنسا لە حوزەیرانی ١٩٤٠دا و مانەوەی بریتانیا بەتەنیا، مەیلەکانی ئەمەریکا بەلای بریتانیادا زیاتری کرد و لە راگەیاندنێکدا کە (رۆزفێلد) لە ١٠ی حوزەیراندا رایگەیاند، تیایدا هاتبوو ئەمەریکا یارمەتی ئەو ولاّتانە دەدات کە نازییەکان دەستدرێژیان دەکەنە سەر، بەمەش هەر لەو کاتەوە هەولّەکانی (رۆزفێلد) بۆ یارمەتیدانی بریتانیا بەڕوونی دەرکەوت و لێرەوە چەرچلّ چەندین جار داوای یارمەتی لە ئەمەریکا کرد و داواشی لێکرد دژی نازییەکان لەگەلّ بریتانیا بێتە جەنگەوە، ئەگەر چی (رۆزفێلد) سەرەتا رازینەبوو بچێتە ناو جەنگەوە، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا لە ئەیلوولی سالّی ١٩٤٠دا رێککەوتنێکی لەگەلّ بریتانیا مۆرکرد، کە بەپێی ئەو رێککەوتنە چەند پارچە چەکێکی دەریایی گەورەی بە بریتانییەکان بەخشی بەرانبەر بەوەی کە بریتانییەکان چەند دوورگەیەکی خۆیان بەکرێ بدەن بە ئەمەریکا، دوای ئەوەش کۆنگرێس رازیبوو بە یاسای (بەکرێدان و خواستن) لەگەلّ هاوپەیماناندا، کە بەمەش مافی بەخشینی قەرز و یارمەتیدانی کەرەستەی سەربازی دەستەبەرکرد، لێرەوە ئیتر یارمەتییەکانی ئەمەریکا بۆ هاوپەیمانان ئەوەندەی تر زیادی کرد، کە گەیشتە نزیکەی ٥٠ ملیار دۆلار، کە دابووی بە هەریەکە لە چین و بریتانیا و رووسیا.

دوای ئەو کۆبوونەوەیەی کە (چەرچلّ) و (رۆزفێلد) لەسەر کەشتیی جەنگی ئەمەریکی (ئۆگەستا) لە کەناری نیوفاوندلاند لە ئابی ١٩٤١ ئەنجامیان دا، پەیوەندیی نێوان ئەمەریکا و هاوپەیمانان چڕتر بۆوە و لەوێدا گەلاّلەنامەی ئەتلەنتیکیان مۆرکرد، کە لەم گەلاّلەنامەیەدا هاتبوو رێز لە مافەکانی مرۆڤ بگیرێت و بێ رەزامەندی گەلانی خاوەن خاك دەستکاری سنوور نەکرێت و مافی هەر گەلێکە جۆری دەسەلاّتی خۆی هەلّبژێرێت و هەروەها هەموو ولاّتێك مافی هەیە بە یەکسانی کەرەستەی خاوی دەستکەوێت، تەنانەت جەخت لەسەر ئازادیی دەریاوانی و چەندین شتی تریش کرابووەوە، سەرەڕای ئەم گەلاّلەنامەیەش

ئەمەریکا هەر بێلایەن مایەوە، کەواتە وێڕای هەموو ئەو هەوڵانەی چەرچڵ، ئەمەریکا نەهاتە ناو جەنگەوە، بەڵام ئەوەی وایکرد کە ئەمەریکا بێتە ناو جەنگەوە دوژمنەکانی بریتانیا بوون، چونکە دەمێك بوو ژێردەریاییە ئەڵمانییەکان گێچەڵیان بە کەشتیگەلییە ئەمەریکییەکان دەگرت، هەر بۆیە ئەمەریکا رایگەیاند کە بوونی هەر کەشتی و فرۆکە و ژێردەریاییەکی ئەڵمانی یان ئیتالی لە ناوچەکانی ئەمەریکا قەدەغەیە، کە ئەمەش پەیوەندیی نێوان ئەمەریکا و بەرەی ئەڵمانی ئاڵۆزتر کرد، بەڵام هۆکاری راستەقینەی چوونە ناوەوەی ئەمەریکا گۆڕانکارییەکانی رۆژهەڵاتی دوور بوو، بەتایبەتیش تێکچوونی پەیوەندیی نێوان ئەمەریکا و ژاپۆن، چونکە لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٠ەوە ژاپۆنییەکان بەپێی گەڵاڵەنامە سێ قۆڵییەکەی ٢٧ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٠ی نێوان ئەوان و ئەڵمانیا و ئیتالیا دەجوڵایەوە، ئەوەبوو ژاپۆن دانی بە سەروەری ئەڵمانیا و ئیتالیا نا لە ئەورووپا لە بەرانبەریشدا ئەڵمانیا دانی بەسەروەری ژاپۆندا نا لە رۆژهەڵاتی دووردا، رێکیشکەوتن لەسەر ئەوەی لەکاتی جەنگدا هاریکاری یەکتری بکەن، هەربۆیە لە هاوینی ساڵی ١٩٤٠دا ژاپۆن دەستی دایە سیاسەتێکی توندی فراوانخوازی لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا، لە درێژەی ئەم سیاسەتەشدا لە تەممووزی ساڵی ١٩٤١دا ژاپۆن داوای لە حکومەتی فیشی فەرەنسی کرد، رێگەی پێبدات کە بنکەی سەربازی لە هیندی چینی فەرەنسی دابمەزرێنێت و ئەوانیش بەمە رازیبوون، بەڵام ژاپۆنییەکان بەوە نەوەستانەوە و بەرەو ناوچەکانی باکووری هیندی چینی فەرەنساییش رۆیشتن، کە ئەمە ترس بوو لەسەر بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لەو ناوچانەدا، هەروەها ترس بوو لەسەر بوونی ئەمەریکا لە فلیپین، هەر بۆیە ژاپۆن هەوڵی دا پشتیوانی هەریەکە لە ئەمەریکا و ئینگلیز بۆ ئەم مەبەستە بەدەست بهێنێت، ئەوە بوو شاندی تایبەتی بەم مەبەستە ناردە هەر یەکێك لەو وڵاتانە.

لەکاتی کۆبوونەوەکەیشیدا لەگەڵ ئەمەریکییەکان لە واشینگتۆن لە ٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤١دا، فرۆکەکانی ژاپۆن لە بنکەی (بێرل هاربەر) لە زەریای هێمن کەشتیگەلی ئەمەریکیان بۆمباران کرد، کە ئەمە خاڵی دەستپێکی چوونە ناوەوەی ئەمەریکا بوو بۆ جەنگ و رۆژی دواتر هەریەك لە ئەمەریکا و ئینگلیز شەڕیان لە دژی ژاپۆن راگەیاند، هەر لە هەمان رۆژیشدا هەر یەك لە ئەڵمانیا و ئیتالیا شەڕیان لە دژی ئەمەریکا راگەیاند، بەمەش ئەمەریکا هاتە ناو جەنگی دووەمی جیهانەوە و بوو بە یەکێك لە وڵاتانی تری هاوپەیمانان لە

بەرانبەر ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانی، جەنگی جیهانیش لە ئەوروپاوە پەلیهاویشتە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور و بوو بە جەنگێکی گشتگیری جیهانی.

هۆکاری سەرەکیش لە چوونە ناوەوەی ئەمەریکا بۆ جەنگ، لە چەند خاڵێکدا خۆی دەبینێتەوە:

١. ئەمەریکا لەوە دەترسا کە ئەڵمانیا دەست بەسەر هەموو ئەوروپادا بگرێت و بەمەش زیان بە بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی ئەمەریکا بگەیەنێت.

٢. ئەمەریکا پێیوابوو کە لە پاڵ بریتانیا و فەرەنساوە بچێتە جەنگەوە باشترە لەوەی لە داهاتوودا بە تەنها خۆی ئەم جەنگە بکات، دوای ئەوەی ئەڵمانیا بەسەر بریتانیا و فەرەنسادا سەردەکەوێت.

٣. ئەمەریکا گەیشتە ئەو باوەڕەی کە بریتانیا هێڵی بەرگری یەکەمە بۆ ئەو.

٤. ترسی ئەمەریکا لەو سیاسەتە فراوانخوازییەی ژاپۆن کە لە ڕۆژهەڵاتی دوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای گرتبووەوە و بووبووە مایەی هەڕەشە بۆ بەرژەوەندییەکانی.

٥. هەروەها لەبەر ئەوەی سیستەمی حوکمڕانیی بریتانی و فەرەنسی، کە لەسەر بنەمای هەڵبژاردن و دیموکراسی بوو، زیاتر لە سیستەمی دیکتاتۆرییانەی فاشیزمی ئیتالی و نازیزمی ئەڵمانی نزیکتر بوو بۆ ئەمەریکا، کە ئەویش لەسەر بنەمای دیموکراسی بوو.

دوای ئەوەی ژاپۆن چووە جەنگەوە، شکستی هاوپەیمانان تایبەت لەڕووی دەریاوە، وردە وردە دەستی پێکرد، لە کانوونی یەکەمی ١٩٤١دا هێرشی ئاسمانی ژاپۆنی توانی چەند کەشتییەکی جەنگی بریتانی نقوم بکات و لە شوباتی ١٩٤٢شدا کەشتیگەلی ژاپۆن لە دەریای جاوە هێزێکی گەورەی دەریایی هاوپەیمانانی تێك شکاند، بەم جۆرەش ژاپۆن لە زەریای هێمن و ئاوەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا باڵادەستی بەدەست هێنا، ئەمە جگە لەوەی لەڕووی وشکانی و ئاسمانیشەوە توانی بەشی زۆری مەرامەکانی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بەدی بەهێنێت، کە لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ١٩٤٢دا (هۆنگ کۆنگ)ی داگیرکرد و دواتریش دەستی بەسەر (کوالامبۆر) داگرت و لە ١٥ی شوباتی هەمانساڵیشدا بنکەی دەریایی ئینگلیزیی سەنگافورەی گرت، دوای ئەوەش لە چەند هێرشێکی چەند مانگیدا، هێرشی کردە سەر بۆرما و دوورگەکانی هیند و هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندی و فلیپین و بەشی زۆری ڕۆژئاوای زەریای هێمن، مابووەوە ئەوەی هێرشەکانی دواتری بۆ سەر هیندستان و ئوسترالیا بێت، بەو پێیەی کە چاوەڕوان دەکرا، بەڵام هەڵکردنی بای وەرزی بوو بە بەربەستێك لە بەردەم ئەم هەوڵانەیدا، بۆیە

تەنها لەو ناوچانەدا مایەوە کە داگیری کردبوو و هێرشەکانی راگرت. بە گشتی فراوانخوازییەکانی ژاپۆن لە ١٩٤٢دا لەو ناوچانە، گەیشتە لوتکە، بەڵام کۆتایی ئەو ساڵە دەستپێکی گۆڕانی دۆخەکە بوو بەلای ئەمەریکییەکاندا، چونکە ئەمەریکییەکان توانیان گورزی گەورە لە ژاپۆنییەکان بوەشێنن و کەشتیگەلی ئەمەریکی لە شەڕی (مەرجان)دا ئەو هێزە ژاپۆنییەی تێك شکاند کە مەبەستی بوو بەندەری مۆرسیس داگیربکات، ئەمەش بووە هۆی ترس بۆ ژاپۆنییەکان و سەرەتایەك بوو بۆ سەرکەوتنەکانی تری ئەمەریکا بەسەر کەشتیگەلی ژاپۆندا لەو ناوچانەدا و ئەمەریکییەکان توانیان ترسی ژاپۆنی بۆ داگیرکردنی ئوسترالیا بڕەوێننەوە و لێرەشەوە وردە وردە سەرکەوتنەکانیان بەدەست بهێنن.

## گۆڕانی رەوتی رووداوەکانی جەنگ لە بەرژەوەندی هاوپەیمانانندا

وەك پێشتر باس کرا، هەڵوێستی سەربازی بەدرێژایی جەنگ هەر لە دەستپێکردنییەوە لە ئەیلوولی ١٩٣٩دا تا دوادواییەکانی ١٩٤٢ لە بەرژەوەندی ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانیدا بوو، بەڵام ئەم دۆخە لە سەرەتای ١٩٤٣ەوە بەهۆی هاتنەناوەوەی ئەمەریکا و کۆمەڵێك رووداوی ترەوە پێچەوانە کەوتەوە، چونکە لەو کاتەوە هاوپەیمانان دەستیان بە دژە هێرشی گەورە کرد، لە بەشی زۆری بەرەکانی جەنگدا، کە لە میانەی ئەم هێرشانەدا چەند سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا، لەوانە:

## جەنگ لە بەرەی رۆژهەڵات و شکستی ئەڵمانەکان

دوای ئەوەی کە پرۆسەی باربارۆسای ئەڵمانەکان شکستی هێنا و ئەڵمانیا نەیتوانی زۆر بەخێرایی بەسەر سۆڤیێتدا سەرکەوتێت، هەوڵی دا پلانێکی نوێ بۆ ئەم هێرشە دابنێت، ئەویش لە ڕێگەی چڕکردنەوەی هەوڵەکانیان بۆ داگیرکردنی ناوچە باشوورییەکانی سۆڤیێت، کە ناوچەگەلێکی دەوڵەمەند بوون بە بەرووبوومە ئابوورییەکان، ئەڵمانییەکان دەیانویست لە ڕێگەی ئەمەوە کەموکوڕییەکانی خۆیان لەڕووی خۆراك و سوتەمەنییەوە پڕبکەنەوە، کە لە ساڵی ١٩٤١ەوە سەریان هەڵدابوو، ئەو هەلەیان قۆستەوە کە لە ئەوروپا هیچ بەرەیەکی نوێ بەرانبەر بە هێزەکانی ئەوان دەستی پێنەکرد، بۆیە بەشێکی زۆری ئەو سوپایانەی هەیبوو لە ئەوروپا، گواستەوە بۆ یەکێتی سۆڤیێت،لە کۆتایی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٢دا جارێکی تر

ئەڵمانەکان هێرشیان کردەوە سەر سۆڤیێت و چەند ناوچەیەکیان داگیرکرد و تا گەیشتنە دەوروبەری شاری ستالینگراد و لەوێ یەکێك لە گەورەترین جەنگەکانی جەنگی دووەمی جیهانی روویدا، ئەوە بوو سوپای ئەڵمانی بۆ ماوەی چەند مانگێك ئابلۆقەی شارەکەیان دا، بەڵام خۆڕاگری و بەرگریکردنی سۆڤیێتییەکان وایکرد کە ئەڵمانییەکان نەتوانن بچنە ناو شارەکەوە و بەپێچەوانەوە، لە ناوەڕاستی مانگی تشرینی ١٩٤٢دا سۆڤیێتییەکان دەستیان بە دژە هێرش بۆ سەر ئەڵمانەکان کرد و بەشێکی زۆریان لە سوپاکە بە یەکێك لە سەرکردە دیارەکانی سوپاکەوە دەستگیرکرد، دوای چەند مانگێك توانیان بە تەواوی ئەو سوپایەی کە لە ناوچەی ڤۆلگا و ئەو ناوچانە بوو، دەستگیر بکەن، لەلایەکی تریشەوە ئەو سوپا ئەڵمانییەی کە لە ناوچەی کافکاس بوو، لەسەر کەوتن و پێشڕەوی بەردەوام دابوو، لە دوای جەنگی ستالینگرادەوە، وردە وردە ئەو سوپایەش لە پێشڕەوییەکانی وەستا و ئیدی بەهۆی ئەوەی کە بەشێکی زۆری ئەو سوپایە گوازرایەوە بۆ ستالینگراد، ئەم سوپایەش شکستی هێنا و سۆڤیێتییەکان سەرکەوتنی گەورەیان بەدەست هێنا. ئەم سەرکەوتنانەی سۆڤیێتییەکان هاندەرێکی باش بوون بۆ ئەوەی هێرشەکانیان لە دژی ئەڵمانەکان فراوانتر بکەن و سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنن، بەڕادەیەك کە لە ماوەی پێنج مانگدا نزیکەی ٦٠٠-٧٠٠کم لەو خاکە بگێڕنەوە، کە ئەڵمانەکان داگیریان کردبوو، نەك هەرئەوەندە، بەڵکو لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٣دا بەشی هەرە زۆری وڵاتەکەیان لە ژێر دەسەڵاتی ئەڵمانەکان هێنایە دەرێ، بەم جۆرەش شەڕی ستالینگراد و شکستی ئەڵمانەکان لەم شەڕەدا، یەکێکی تر بوو لە خاڵە گرنگەکانی گۆڕانی رەوتی رووداوەکانی جەنگ و ئیدی رووسیا لە ساڵی ١٩٤٤دا تا نزیك خاکی ئەڵمانیا و دەسەڵاتەکانی ناوچەی بالکان پێشڕەوی کرد و لە باکوورەوە گەیشتە ئیستونیا و لە ناوەڕاستەوە تاکو پۆڵەندا رۆیشت و لەباشووریشەوە سنووری رۆمانیای تێپەڕاند، ئەم سەرکەوتنانەی رووسیا لە راستیدا ورەیەکی زۆر گەورەی بە هاوپەیمانان بەخشی و لێرەوە تەرازووی هێز بەلای هاوپەیماناندا کەوت و خودی ئەڵمانیا کەوتە بەر هەڕەشە و ترسی هێرشی هاوپەیمانان.

## نوێبوونەوەی جەنگ لە بەرەی باکووری ئەفریقا و شکستی ئەڵمانی و ئیتالییەکان

دوای ئەو سەرکەوتنانەی کە سوپای ئەڵمانی بە سەرکردایەتی رۆمل لە ناوچەی تەبرك بەدەستی هێنا و پێشڕەوییەکانی بۆ میسر بەردەوام بوو، لە مایسی ١٩٤٢دا سوپای ئەڵمانی و ئیتالی گەیشتنە ناوچەی عەلەمێن، کە ٦٠کم لە رۆژئاوای ئەسکەندەریەیە، بەڵام لە چوونە ناوەوەی ئەو

ناوچەیە شکستیان هێنا، لەو کاتەدا بوو کە چەرچڵی سەرۆکی بریتانیا لە حوزەیرانی ١٩٤٢دا سەردانێکی بۆ ئەمەریکا ئەنجام دابوو و لەوێ لەگەڵ رۆزفێڵدی سەرۆکی ئەمەریکا کۆبووبوونەوە و لەسەر ئەوە رێککەوتبوون کە هێرشێکی بەرفراوان دژی سوپای ئەڵمانی ئیتالی لە باکووری ئەفریقا ئەنجام بدەن، وەك دەروازەیەك بۆ چوونە ناوەوەی بەرەی رۆژئاوایی لە ئەوروپا، سۆڤێتیش زۆر لەسەر کردنەوەی ئەم بەرەیە سووربوو، بۆ کەمکردنەوەی فشاری ئەڵمانیا لە سەر هێزەکانی، هەردوو لا لەسەر ئەوە رێککەوتن کە هێرشێکی هاوبەش بکەنە سەر باکووری ئەفریقا و لەیەك کاتدا لە هەردوو رووی رۆژهەلات و رۆژئاواوە، بەپێی ئەم پلانە سوپای بریتانی لە میسرەوە هێرشەکانی بۆ سەر سوپای ئەڵمانی ئیتالی دەست پێکرد، توانی پێشڕەوییەکانی هێزی ئیتالی ئەڵمانی لە تەمموزی ١٩٤٢دا بووەستێنێت و ئەو دوو سوپایە لە ناوچەی عەلەمێن رووبەڕووی یەك بوونەوە، کە شەڕێکی گەورە بەناوی شەڕی (عەلەمێن)ەوە لە نێوان ئەو دوو سوپایەدا رووی دا و لە ٢٣ی تشرینی یەکەمەوە تا ٤ تشرینی دووەمی ١٩٤٢ی خایاند و بە سەرکەوتنێکی گەورەی بریتانییەکان کۆتایی هات و ژمارەیەکی زۆر لە سوپای ئەڵمانی ئیتالی بەدیل گیران و ئەو سوپایە ناچار کرا لە میسر بکشێتەوە، کە هۆکاری سەرەکیی سەرکەوتنەکانی بریتانیاش بۆ ئەو یارمەتییانە دەگەڕایەوە کە ئەمەریکییەکان لەڕووی چەك و جبەخانە و سوپاوە بۆ بریتانییەکانیان ناردبوو، هاوکات هێرشە ئاسمانییەکانی هاوپەیمانان رۆڵێکی گەورەی لەم سەرکەوتنەدا بینی، کە بە بەردەوامی بۆمبارانی ئەو هێزانەیان دەکرد و چەندین کەشتی ئەڵمانییان تێك شکاند، کە لە دەریای ناوەڕاستەوە هاوکاریان بۆ سوپای ئەڵمانیا دەبرد.

بێگومان جەنگی عەلەمێنیش یەکێکی تر بوو لەو جەنگانەی کە وەرچەرخانێکی گەورەی بەسەر رووداوەکانی جەنگی دووەمی جیهاندا هێنا و کاریگەر بوو لەوەی کە ناوچەکانی میسر و کەناڵی سوێس نەکەونە دەست ئەڵمانیا و ئەو شەڕەش بوو، کە سەرەتای پاشەکشێکانی سوپای ئەڵمانی ئیتالی لە باکووری ئەفریقا مسۆگەر کرد، لەلایەکی تریشەوە سوپای بریتانی ئەمەریکی هان دا بۆ ئەوەی سوپاکانیان لە ناوچەکانی مەراکیش و مەغریب دابەزێنن، لە دوای ئەو جەنگەوە سوپاکەی بریتانیا بە ئاراستەی رۆژئاوا لە پێشڕەوییەکانی بەردەوام بوو و توانی بەندەری تەبرك لە تشرینی ١٩٤٢دا بگێڕێتەوە و دواتریش لە کانوونی دووەمی ١٩٤٣دا دەست بەسەر تەرابلوسدا بگرێت و سوپای ئەڵمانی ئیتالی ناچار بکات بگەڕێنەوە بۆ تونس.

لە ٨ی تشرینی دووەمی ١٩٤٢دا سوپای ئەمەریکی بریتانی لە مەغریب و جەزایر بەسەرکردایەتی (ئەیزنهاوەر)ی ژەنەراڵی ئەمەریکی دابەزین و دەستیان بە هێرشەکانیان کرد،

بەڵام رووبەڕووی هیچ بەرەنگارییەکی ئەوتۆ نەبوونەوە، زۆر بە ئاسانی جەزایر و مەغریبیان داگیرکرد و بەرەو تونس پێشڕەوییان کرد، بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر ئەو سوپا ئەڵمانی ئیتالییەی لەوێدا مابوو، ئیدی ئەم سوپایانە کەوتنە نێوان بەرداشی هێرشی هێرشی بریتانییەکان لە رۆژهەڵاتەوە و سوپاکەی ئەیزنهاوەر لە رۆژئاواوە، ئەوە بوو لە مایسی ١٩٤٣دا هەردوولا، لە یەك کاتدا هێرشێکی گەورەیان کردنە سەر و چوونە ناو تونسەوە، کە نزیکەی ٢٤٨ هەزار لە سوپای ئەڵمانی ئیتالی بەدیل گیران، کە باشترین یەکەکانی ئەو سوپایە بوون، بەم جۆرەش لە باکووری ئەفریقا هاوپەیمانان سەرکەوتن و دەستواڵا بوون لەوەی بەرەو ئیتالیا بڕۆن.

## هێرش بەرەو ئیتالیا

دوای ئەو سەرکەوتنانەی کە هاوپەیمانان بەسەر سوپای ئەڵمانی ئیتالیدا لە باکووری ئەفریقا بەدەستیان هێنا، بە تەواوەتی دەریای ناوەڕاستیان کۆنترۆڵ کرد، لەوێشەوە سوپاکانیان لە ١٠ی تەمموزی ساڵی ١٩٤٣دا لە دوورگەی سقلیە دابەزاند، کە سوپای ئەڵمانی بەرگرییەکی زۆر توندی کرد، بەڵام سوپای ئیتالی بەرگرییەکەی بەو جۆرە نەبوو، ئەمەش زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئیتالییەکان قینیان بەرانبەر ئەڵمانییەکان هەبوو، چونکە هەموو شتێك لە ژێر دەستی ئەواندا بوو، هەر چۆنێك بێت لە ناوەڕاستی ئابی ١٩٤٣دا هاوپەیمانان دەستیان بەسەر سقلیەدا گرت، لەو کاتەشدا رق و کینی ئیتالییەکان بەرانبەر نازییەکان لەلایەك و خودی سیستەمی فاشیزم لەلایەکی تر، وایان کرد کە بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستکارانەی توند لە ناو ئیتالیا دەربکەوێت، فاشیستەکانیش زۆر بە توندی وەڵامیان دایەوە و دەستیان دایە گرتن و لە ناوبردنی بەشێکی زۆری رۆشنبیران و کرێکاران، چەندین رۆژنامەی بەرهەڵستکارەکانیان داخست، لەلایەکی ترەوە لەو کاتەدا بارودۆخی ئابووری لە ئیتالیا لەوپەڕی داتەپین دابوو، لەڕووی ورەشەوە ئیتالییەکان لە دوای لە دەستدانی شاری تەرابلوس بەشێکی زۆریان پێیان وابوو کە ئەوان شەڕیان دۆڕاندووە و تاکە رێگەی رزگاربوونیشیان کۆتاییهێنانە بە هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەڵمانیا، هاوکات کەسایەتی مۆسۆلینیش لای ئیتالییەکان بووبووە جێی رەخنە و توانجی بەشێکی زۆر، تەنانەت بەشێك لە خودی سەرکردە فاشیستەکان پەنجەی رەخنەیان بۆ درێژدەکرد و داواکار بوون کە سنوورێك بۆ دەسەڵاتەکانی دابنرێت، بۆیە لەو کۆبوونەوەیەدا کە ئەنجوومەنی باڵای فاشیستەکان لە تەمموزی ١٩٤٣دا ئەنجامیان دا، بەشی زۆری ئەندامەکان دەنگیان بۆ ئەو پرۆژەیە دا، کە داوای ئەوەی دەکرد مۆسۆلینی لە سەرجەم دەسەڵاتەکانی دابماڵرێت، ئەمەش هاندەرێك بوو بۆ پاشای ئیتالیا

(ڤیکتۆر ئەمانوئێلی سێیەم)، بۆ ئەوەی گورزی خۆی بوەشێنێت، ئەوە بوو لە **٢٥**ی تەمموزی **١٩٤٣**دا مۆسۆلینی بۆ کۆشکەکەی خۆی بانگهێشت کرد و داوای لێکرد دەست لەکار بکێشێتەوە، هەرچەندە مۆسۆلینی بەم داواکارییەی پاشا نیگەران بوو، بەڵام مۆسۆلینی دوورخرایەوە بۆ دوورگەی سەردینیا، دواتریش لەبەر ئەوەی ئەڵمانییەکان رزگاری نەکەن لەوێوە بۆ ناوچەیەکی شاخاوی ئیتالیا گوازرایەوە و دوای دوورخستنەوەی مۆسۆلینیش، حکومەتێکی نوێ بە سەرۆکایەتی (مارشال بادۆلیۆ) لە ئیتالیا دامەزرا، سەرەتای کارەکانیشی بەدەستپێکردنی گفتوگۆیەکی خێرا بە ئامانجی ئاگربەست لەگەڵ هاوپەیماناندا دەست پێکرد، ئەم گفتوگۆیە نزیکەی سێ هەفتەی خایاند، ئەوە بوو لە **٣**ی ئەیلوولی **١٩٤٣**دا واژوو لەسەر ئاگربەست کرا، بەڵام تا ٨ی ئەیلوول رانەگەیەنرا.

گرنگترین مەرجەکانی ئەم ئاگربەستە بریتی بوون لەوەی کە سوپای ئیتالی دەستبەجێ جەنگ رابگرێت و بەبێ هیچ مەرجێك خۆی بدات بەدەستەوە و تەواوی کەشتیگەل دەریایی و هێزی ئاسمانیان رادەستی هاوپەیمانان بکات و بەندەر و فڕۆکەخانەکانیان بخەنە ژێر دەستی هاوپەیمانانەوە. بەبیستنی ئەم هەواڵە، هیتلەر هێزێکی ناردە سەر ئیتالیا و لە ١٠ی ئەیلوولی **١٩٤٣**دا چووە ناو شاری رۆماوە و حکومەتە نوێیەکە ناچار بوو وڵات بەجێبهێڵێت، لێرەشەوە هیتلەر شەڕی لە دژی ئیتالیاش راگەیاند، لەو کاتەشدا بوو کە سوپای هاوپەیمانان هەریەك لە سوپای بریتانی و ئەمەریکی بەرەو ناوچەکانی ئیتالیا لە پێشڕەوی دابوون، ناوچەکانی سقلیە و ناپۆلی و سەردینیا و چەند ناوچەیەکی تریان داگیرکردبوو و تا ناوەڕاستی ئیتالیا هاتبوون، بەڵام لە ناوچە چیاییەکاندا روبەڕووی بەرەنگاری ئەڵمانەکان بوونەوە، بۆیە تا کانوونی دووەمی **١٩٤٤** لە پێشڕەوییەکانیان وەستان، بەڵام لەدوای ئەوەوە جارێکی تر سەرکەوتنەکانیان دەستی پێکردەوە و دوای چەند شەڕێکی توند، توانیان لە ٤ی حوزەیراندا شاری رۆما داگیر بکەن، کە یەکەم پایتەختی ئەوروپی بوو لە ژێر دەستی هیتلەر هێنرایە دەر، دوای ئەوەش وردە وردە دوای چەند مانگێك شارەکانی تری ئیتالیا کەوتنە ژێر دەستی هاوپەیمانان و لە نیسانی **١٩٤٥**دا هاوپەیمانان بڕیاریاندا دوایین هێرش بکەنە سەر ئەڵمانییەکان و لەوکاتەشدا لە ناوەوەی ئیتالیا شۆڕش لە دژی ئەڵمانەکان دەستی پێکرد و بەهاوکاری لەگەڵ هاوپەیماناندا توانیان سەرجەم شارە گرنگەکانی ئیتالیا لەژێر دەستی ئەڵمانەکان دەربێنن.

سەبارەت بە مۆسۆلینیش لە ١٢ی ئەیلوولی **١٩٤٣**دا ئەڵمانەکان توانیان رزگاری بکەن و حکومەتێکی فاشیستی نوێیان لە باکووری ئیتالیا راگەیاند، کەچی لە ئەنجامی شکستەکان،

ناچار بوو بە بەرگی سەربازی ئەڵمانییەوە بەرەو سویسرا هەڵات، بەڵام سوپای شۆڕشگێڕە ئیتالییەکان توانیان لە ٢٧ی نیساندا دەستگیری بکەن و گوللە بارانی بکەن.

سەبارەت بە ئەڵمانیاش دوای ئەوەی زانیان ئەگەری سەرکەوتنیان نەماوە، بۆیە سوپای ئەڵمانی لە ئیتالیا خۆیان دا بەدەستەوە و لە ٢ی مایسی ١٩٤٥ەوە جەنگ لە ئیتالیا کۆتایی پێهات و ئەڵمانیاش زیانێکی لۆجستی و ماددی و سەربازی زۆری بەرکەوت و بەشێکی هەرە زۆر لە سەرباز و ئەفسەرە چالاك ودیارەکانیان لەدەستدا.

## رزگارکردنی فەرەنسا و ناوچەی زەوییە نزمەکان

دوای ئەو سەرکەوتنانەی هاوپەیمانان لە بەرەکانی ئەفریقا و ئیتالیا و رووسیا، هاوپەیمانەکان درکیان بەوەکرد کە کاتی ئەوە هاتووە لە بەرەی رۆژئاواشەوە هێرش بکەنە سەر ئەڵمانەکان بۆ رزگارکردنی ناوچەکانی ئەوروپاش لە ژێر دەسەڵاتی ئەڵمانەکاندا، لەم پێناوەشدا لە ١٩٤٣ بەدواوە هاوپەیمانان جوڵەکانیان بۆ ئەم مەبەستە دەست پێکرد و چەند کۆنگرەیەکیان لە مۆسکۆ و تاران و کۆشکی سپی بەست، لە کۆنگرەی تاراندا بابەتی سەرەکی چۆنێتی هێرشکردن بوو بۆ سەر ئەڵمانیا، ئەوەبوو لەسەر ئەوە رێککەوتن کە بەرەیەکی نوێ لە رۆژئاوا وەك دەستپێکێك بۆ ئەو پرۆسەیە بکرێتەوە، (ژەنەراڵ ئەیزنهاوەر)ی ئەمەریکیش بکرێــت بە سەرکردەی باڵای ئەم سوپایە، دوای ئەمە، هەردوولایان دەستیان بە خۆسازدانێکی گەورە کرد و ئامادەبوون بۆ جەنگ، ئەوە بوو هێزی هاوپەیمانان لە ٦ی حوزەیراندا لە کەنارە باکوورییەکانی فەرەنسا دابەزین و زۆر بە ئاسانی توانیان بەشێك لەناوچەکە بگرن و شوێن پێی خۆیان لە کەنارەکانی فەرەنسا دامەزرێنن و چەند بنکەیەکی دەریایی بکەنەوە، لەوێشەوە سوپای ئەمەریکی توانی لە ٢٦ی حوزەیراندا بچێتە شاری (شلبوك)ەوە، سوپای بریتانیش بەرەو داگیرکردنی شاری (کاین) رۆیشت و دوای یەك مانگ لە شەڕی توندوتیژ، توانیان بچنە ناو شارەکەوە، دوای ئەمەش سوپای هاوپەیمانان گەیشتە سەر وشکانی فەرەنسا و لێرەوە دەستیان بە پێشڕەوییەکانیان لە وشکانیدا کرد و لە هاوینی ١٩٤٤ بەدواوە ئەڵمانیەکان شار لەدوای شار، فەرەنسایان جێدەهێشت و ئەم شارانە بەردەستی هاوپەیمانان دەکەوتن، تەنها چەند میلێك مابوو کە سوپای هاوپەیمانان بگاتە پاریس، لە شەڕی پاریسدا بزووتنەوەی بەرەنگاری فەرەنسی رۆڵێکی سەرەکیی لە ئازادکردنی پاریس بینی، چونکە لە ناوەوەی پاریس راپەڕینێکی گەورەیان ئەنجام دا و فەرەنسییەکان لە بەرانبەر ئەڵمانەکاندا دەستیان دایە چەك و لە ٢٥ی ئابی ١٩٤٤دا شاری پاریسیش رزگارکرا.

لەو کاتەشدا کۆماری فەرەنسای ئازاد بە سەرۆکایەتی (ژەنەرال دیگۆل) کە لە تاراوگە بوو، بووبووە جێ متمانەی گەلی فەرەنسا، گەڕایەوە و حکومەتێکی نوێی لە پاریس دامەزراند و دەستبەجێ لەلایەن ئینگلیز و ئەمەریکاوە دانی پێدانرا، دوای ئەوەش سوپای هاوپەیمانان بەردەوامیان بە هێرشەکانیان دا بۆ رزگارکردنی تەواوی فەرەنسا، بەو رادەیەی کە لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلوولی ١٩٤٤دا بەشی هەرە زۆری خاکی فەرەنسا رزگاربووبوو، تەنها چەند بەندەرێکی زەریای ئەتلەنتی و هەردوو ناوچەی ئەلزاس و لۆرین نەبێت، دوای ئەو سەرکەوتنانە لە فەرەنسا هاوپەیمانان پێشڕەوییەکانیان بەرەو بەلجیکا و هۆڵەندا درێژەپێدا، ئەوە بوو دوای رزگارکردنی فەرەنسا، دەستیان کرد بە پێشڕەوییەکانیان بەرەو ئەو ناوچانە و چوونە ناو ناوچەی ئەمیانەوە و لە رووباری (سو) پەڕینەوە و سنووری بەلجیکایان بەزاند و لە ئەیلوولی ١٩٤٤دا برۆکسل و ئەنتۆربیان رزگار کرد، لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلوولدا سوپای هاوپەیمانان چەند شارێکی تریان لەو ناوچانە رزگار کرد و گەیشتنە باشووری هۆڵەندا و شاری ستراسبۆرگ، لەوێشەوە چوونە سەر سنووری ئەڵمانیای رۆژئاوا و لەوێ کۆتاییان بە پێشڕەوییەکانیان هێنا، بۆ دوایین هێرش بۆ سەر ئەڵمانیا.

### رزگاری ئەوروپای رۆژهەڵات و بالکان دەسەڵاتی ئەڵمانییەکان

بەهاتنی ساڵی ١٩٤٤، ئەڵمانیا لە هەردوو بەرەی رۆژئاوا و رۆژهەڵاتەوە رووبەڕووی هێرشی ترسناك بووبووەوە، لەبەرەی رۆژئاواوە هاوپەیمانان لە باکوور و رۆژهەڵاتەوە پێشڕەوییەکانیان تادەهات دەچوونە پێش و فەرەنسا و بەلجیکا و هۆڵەندایان رزگار کرد، سەبارەت بە بەرەی رۆژهەڵاتیش سوپای رووسی توانیبووی تەواوی خاکی خۆی لەژێر دەسەڵاتی ئەڵمانەکان بهێنێتە دەر و رووی کردبووە ناوچەکانی دەرەوەی سنووری رووسیا و چووبووە ناو خاکی پۆلەندا و رۆمانیا و بولگاریا و یوگسلاڤیا و ئەو ناوچانەی لەژێر دەستی نازییەکان هێنابووە دەر.

رووسەکان لە حوزەیرانی ١٩٤٤دا پێشڕەوییەکانیان بەرەو ناوەڕاستی پۆڵەندا دەست پێکرد و هێندەی نەبرد سوپاکەیان گەیشتە ناوچەکانی بەلتیك و پۆلەندا و شارە سەختەکانی پۆلەندایان یەك لەدوای یەك داگیرکرد، تا گەیشتنە رووباری (ڤیستۆلا) و هێندەیان نەما بگەنە وارشۆی پایتەخت، هەر لەو کاتەشدا بوو کە لە ناوەوەی پۆڵەندا بزووتنەوەیەکی بەرەنگاری لەدژی ئەڵمانەکان دەرکەوت، کە زۆر بەتوندی لەلایەن ئەڵمانەکانەوە سەرکوتکرایەوە، لەلایەکی

تریشەوە سوپای رووسیا لە ناوچەکانی بەلتیك زۆر بەخێرایی پێشڕەوی دەکرد و گەیشتبوونە سنووری پرووسیای رۆژهەلاتی و لەوێدا بۆماوەیەك بەهۆی بەرەنگاری ئەلمانەکانەوە هەلوەستەیان کرد، لە هاوینی ١٩٤٤دا رووسەکان هێرشێکی نوێیان بۆ سەر ئەلمانەکان دەست پێکرد و زۆر بە ئاسانی ئەلمانەکانیان لەوێ وەدەرنا و پێشڕەوییەکانیان بەرەو ناو خاکی رۆمانیا بەردەوام بوو.

رۆمانیاش لەژێر کاریگەری رووسیا شەڕی لە دژی ئەلمانەکان راگەیاند، هاوکات بولگاریاش هەمان هەنگاوی رۆمانیای نا و لەگەلّ رووسیادا رێککەوت و شەڕی لەدژی ئەلمانیا راگەیاند، سەبارەت بە یوگسلاڤیاش تا ئەوکاتیش نەچووبووە ژێر بالّی رووسیاوە. هەرچەندە سوپای رزگاریخوازی نیشتمانی یوگسلاڤی ناوچەیەکی زۆری یوگسلاڤی لەژێر دەستی ئەلمانەکان دەرهێنابوو، کەچی هێزێکی گەورەی ئەلمانەکان تا ئەو کاتیش لەو ولاتەدا مابوونەوە، هەر بۆیە سەرکردایەتی سیاسیی یوگسلاڤیا لە دواجاردا ناچار بوو هاوکاری سوپای رووسی قبولّ بکات و هێرشێکی هاوبەشی سوپای یوگسلاڤی و رووسی و بولگاری دەست پێبکات، بەم هێرشەش توانیان تەواوی خاکی یوگسلاڤی لەژێر دەستی ئەلمانیا رزگار بکەن، کە سەرەنجام ئەو جەنگە ترسی بۆ ئەو ئەلمانیانەش دروستکرد کە لە یۆنان و ئەلبانیادا بوون، بۆیە ئەلمانیا ویستی بەخێرایی ئەو سوپایانە بکشێنێتەوە، بەلام سوپای نیشتمانی بولگاریا و یوگسلاڤیا هێرشیان کردە سەر ئەو سوپایانە و زیانێکی زۆریان لێدان، هەر لەو کاتەشدا بریتانییەکان بەخێرایی سوپایان ناردە یۆنان و بەهاریکاریی ئەم سوپایە، بزووتنەوەی رزگاریخوازی یۆنانی توانی شوێن سوپای پاشەکشەپێکراوی ئەلمانی بکەوێت و لە کۆتایی ١٩٤٤دا بە تەواوەتی یۆنان رزگار بکات.

هەنگاریا دوایین ولاتی ئەوروپای خۆرهەلاتی بوو کە لەژێر دەستی ئەلمانیادا مابووەوە، بەلام مانەوەی بەو جۆرە لەو کاتەدا کارێکی ئەستەم بوو، بەتایبەتی دوای ئازادبوونی رۆمانیا، هەر بۆیە رووسەکان سنووری هەنگاریایان لەلای رۆمانیاوە تێپەڕاند و زۆر بەخێرایی گەیشتنە بوداپێستی پایتەخت، بەلام لەوێدا رووبەڕووی بەرەنگارییەکی توندی هێزی ئەلمانی و هەنگاری بوونەوە، ئەگەرچی بەشێك لە هەنگارییەکان چووبوونە پالّ رووسەکان، بەلام بەشێکیان لە پالّ ئەلمانەکاندا مابوونەوە، هەر چۆنێك بێت سەرباری هەموو ئەو بەرگرییەی ئەلمانیا لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٤٥دا هەنگاریاش خۆی دا بەدەستەوە و ئاگربەستی لەگەلّ رووسەکاندا

واژووکرد، بەم جۆرەش بەر لە کۆتاییهاتنی ساڵی ١٩٤٥، تەواوی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و وڵاتی یۆنان لە داگیرکاری نازییەکان ڕزگاریان بوو.

## داگیرکردنی بەرلین و هەرەسی ئەڵمانیا

هەموو ئەو شکستانەی بەسەر ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانیدا هات لە ناوچەکانی ئەفریقا و بالکان و ئەورووپا، کاریگەرییەکی زۆر خراپیان بەسەر هێزی ئەڵمانییەوە هەبوو، چونکە لە ئەنجامی ئەو دۆڕانانەدا سوپای ئەڵمانی زیانێکی ئێجگار گەورەی لێکەوت، چ لە رووی مادییەوە، چ لە رووی لۆجستییەوە و بووە مایەی لە دەستدانی ژمارەیەکی زۆر لە سوپاکەی و کەرەسەیەکی جەنگی و چەك و جبەخانەیەکیی زۆر، هاوکات لە دەستدانی بەشێکی زۆر لە راوێژکار و شارەزا سەربازییەکانی، ئەمانە هەمووی سەرلێشێواوییەکی سەربازی لێکەوتەوە و سوپای ئەڵمانی بە تەواوی شپرزە بوو، لەلایەکی تریشەوە هەر لە دەستپێکی جەنگەوە ئەڵمانیا لەڕووی ئابوورییەوە ڕۆژ بە ڕۆژ بارودۆخی روو لە خراپی بوو و بۆردومانە ئاسمانییەکان کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر کارگە و بەرهەمهێنانی پیشەسازی ئەڵمانی هەبوو، جگە لەوەی وردە وردە بەروبوومەکانی ئەڵمانیا روو لە کەمبوون بوو، هەموو ئەمانەش لە دواجاردا بارودۆخێکی خراپی لە ناوەوەی ئەڵمانیا خستەوە و دەسەڵاتی هیتلەری رووبەڕووی بەرهەڵستکارییەکی توند کردەوە، وەك بە بەرپرسی یەکەمی ئەو رەوشە خراپەی بەسەر ئەڵمانیادا هاتبوو، دەزانرا، هەر بۆیە هیتلەر چەندین جار رووبەڕووی کرداری تیرۆریستی بووەوە، کە دیارترینیان لە ٢٠ی تەمموزی ١٩٤٤ بوو، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، بووە هۆکاری ئەوەی هیتلەر شاڵاوێکی توندوتیژ لە پاکتاوی جەستەیی دەست پێبکات و بەشێك لە دیارترین سەرکردەکانی نازیزم لە نێوبەرێت. بەمەش هێندەی تر بارودۆخی خودی پارتی نازی و ئەڵمانیا لەرزۆکتر بوو.

لەکاتێکدا کە ئەڵمانیا بەو بارودۆخەدا تێدەپەڕی، سەرکردەکانی ئەمەریکا و بریتانیا و یەکێتی سۆڤێت سەرقاڵی پلانڕێژی بوون بۆ داگیرکردنی ئەڵمانیا و دابەشکردنی لە نێوان خۆیاندا و هەر لە دوای کۆنگرەی تارانی ساڵی ١٩٤٣ەوە سەرەتاکانی ئەو بیرۆکەیە چەکەرەی کرد و وردە وردە لە نێو ئەو سەرکردانەدا تاوتوێ دەکرا، تا دواجار لە کۆنگرەی یاڵتا کە لە ٤ی شوباتی ١٩٤٥دا لە نیمچەدوورگەی قرم بەسترا، سەرکردەی وڵاتانی هاوپەیمانان بە تەواوی لەسەر ئەو پلانە سەربازییە یەکلایی بوونەوە، کە بۆ داگیرکردنی ئەڵمانیا دایان ڕشتبوو، لەوێدا بڕیاریان دا ئەڵمانیا

بەشێوەیەکی هاوبەش لەلایەن ئەمەریکا و بریتانیا و سۆڤێتەوە دابەش بکرێت و هەر یەکێك لەو وڵاتانە ناوچەیەکی داگیرگە وەدەست بێنن، هاوکات فەرەنساش چاودێری ناوچەیەکی تری داگیرگە بکات، واتا ئەڵمانیا بەسەر چوار ناوچەی داگیرکراودا دابەش بکرێت، بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانەش لە ٨ی شوباتی ١٩٤٥ەوە هێرشی هاوپەیمانان دەستی پێکرد و لە کۆتایی هەمان مانگدا توانیان هێڵی بەرگری ئەڵمانییەکان تێك بشکێنن و لە مانگی مارتدا زۆر بە ئاسانی لە رووباری راین بپەڕنەوە، لە ٢٥ی مارتیشدا تەواوی بەرگرییەکانی ئەڵمانیا لە رۆژئاوای رووباری راین کۆتایی پێبهێنن، دوای ئەوەی سوپای هاوپەیمانان لە راین پەڕییەوە، بە سێ ئاراستە بەرەو ناوەوەی ئەڵمانیا رۆیشت، ئەم سوپایانە زۆر بەخێرایی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و وردە وردە بەرەو شاری بەرلین دەڕۆیشتن و سوپای ئەڵمانیش لە هەرەس هێناندا بوو و شارەکانی ئەڵمانیا یەك لەدوای یەك خۆیان بەدەستەوە دەدا.

لە رۆژهەڵاتیشەوە هێزەکانی سۆڤێت بە هاوبەشی لەگەڵ هێزەکانی پۆڵەندا و چیکۆسلۆڤاکیاو بولگاریا و رۆمانیا، لە ١٢ی کانوونی دووەمەوە هێرشەکانیان دەست پێکرد، دوای پێنج رۆژ ئەم هێزانە توانیان وارشۆ داگیربکەن و دواتریش دەست بەسەر بەشێکی فراوانی چیکۆسلۆڤاکیادا بگرن، ئەگەر چی بەهۆی ناردنی سوپای ئەڵمانییەوە بۆ بەرەی سۆڤێتی، تا رادەیەك پێشڕەوییەکانی ئەم هێزە هێور بوونەوە، بەڵام پێشڕەوییەکانیان کۆتایی پێنەهات، جارێکی تر دەستیان بە هێرشەکانیان کردەوە تا لە ١٧ی نیسانی ١٩٤٥دا ڤیەننای پایتەختی نەمسایان داگیرکرد و بەتەواوی دەستیان بەسەر بەشی رۆژهەڵاتی نەمسادا گرت، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە چەند یەکەیەك لە سوپاکانی سۆڤێت گەیشتبوونە رووباری (ئۆدەر) کە ٦٠کم لە رۆژهەڵاتی بەرلین بوو، دوای ئەوەش لە ١٦ی نیساندا ئەم یەکانە هێرشەکانیان بۆ سەر بەرلین دەست پێکرد و وردە وردە لە بەرلین نزیك بوونەوە، هێزەکانی هاوپەیمانان لە رۆژئاواوە و هێزەکانی سۆڤێتیش لە رۆژهەڵاتەوە رۆژ بە رۆژ تەنگیان بە سوپای ئەڵمانی هەڵدەچنی و لە بەرلین نزیك بووبوونەوە، تا ئەو کاتەی لە ٢٧ی نیساندا سوپای سۆڤێتی توانی شەڕ بگەیەنێتە ناو جەرگەی بەرلین و لە ٣٠ی نیسانی ١٩٤٥یشدا پەرلەمانی ئەڵمانی داگیربکەن، ئەوە بوو لە دوای ئەو رۆژەوە ئیدی هیتلەر کۆتایی پێهات و بەپێی هەندێك لە سەرچاوەکان لە کردارێکی خۆکوژیدا

کۆتایی بەخۆی هێناوە و تەرمەکەیشی سووتێنراوە[*]، سەرەنجامیش لە ٢ی مایسی ١٩٤٥دا بەرلین بە تەواوی کەوتە ژێر دەسەڵاتی سوپای سۆڤێتەوە، بەمەش ویستی بریتانییەکان بۆ ئەم کارە شکستی خوارد.

بە کەوتنی بەرلین، ورەی ئەڵمانییەکان لە سەرجەم بەرەکانی ترەوە بە تەواوی تێکشکا و لە هەموو بەرەکانی باکووری رۆژئاوای ئەڵمانیا و هۆڵەندا و دانیمارکدا خۆیان بەدەستەوە دا، لەکاتێکدا کە سوپاکەی باکووری ئیتالیایان لە ٣٠ی نیسانەوە خۆی دابوو بە دەستەوە، لە ٧ی مایسی ١٩٤٥یشدا (ژەنەرال یۆدۆل) سەرۆك ئەرکانی جەنگی ئەڵمانی گەڵاڵەنامەی خۆبەدەستەوەدانی بەبێ هیچ مەرجێك لەگەڵ هاوپەیماناندا واژوو کرد. بەمەش کۆتایی بە ئەڵمانیا هات.

## هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەر ژاپۆن

دوای ئەوەی هاوپەیمانان بەسەر ئەڵمانیا و ئیتالیادا سەرکەوتن، ئاراستەی جەنگ بەرەو ژاپۆن گۆڕا، چونکە ژاپۆن تاکە وڵاتی هاوپەیمانێتییەکەی ئەڵمانیا بوو کە لە جەنگدا مابوو. سوپای هاوپەیمانان هەر لە ساڵی ١٩٤٣ەوە هێرشەکانی لە ناوچەی رۆژهەڵاتی دوور لەدژی ژاپۆن دەست پێکردبوو، ئەوە بوو لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٤٥دا هێزی بریتانیا چەند ناوچەیەکی داگیرکردبوو، دەستی بەسەر (رانجۆن)ی پایتەختی بۆرمادا گرتبوو، دوای ئەمەش هاوپەیمانان ویستیان سوپا لە مەلایۆ دابەزێنن، بەڵام بەر لەوە ژاپۆنییەکان خۆیان دابوو بە دەستەوە، لەڕوویەکی تریشەوە سوپای هاوپەیمانان هەر لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٤٣ەوە لە زەریای هێمنەوە هێرشیان دەست پێکردبوو، چەندین دوورگەی گرنگیان لەو ناوچانە لەژێر دەستی ژاپۆنییەکان دەرهێنابوو و وردە وردە تەنگیان بە سوپای ژاپۆنی هەڵدەچنی، لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٤ بەدواوە ئەمەریکییەکان چەند شەڕێکی دەریایی گرنگیان لەبەرانبەر ژاپۆنییەکان ئەنجام دا و توانیان بە تەواوی فلیپین لە ژێر دەستی ژاپۆنییەکان دەربهێنن، دوای ئەوەش سوپای هاوپەیمانان لە هێرش و بۆمبارانە ئاسمانییەکانیان بەردەوام بوون و سوپای ژاپۆنی تا دەهات زیاتر شکستی دەخوارد و هەڵوێستی لە ناوچەکەدا لاوز دەبوو، بەڵام ئەوەی زیاتر هەڵوێستی ژاپۆنی لاواز کرد، رووخانی ئەڵمانیای هاوپەیمانی بوو، ئەوە بوو کە تەواوی سوپای هاوپەیمانان روویان

---

* پرسی مردنی هیتلەر و چۆنێتی مردنی هیتلەر و لەناوچوونی تا ئێستاش بە تەواوی یەکلایی نەبووەتــەوە و جێی مشتومڕێکی زۆرە.

کردە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی دوور و رووبەڕووی سوپای ژاپۆن بوونەوە، لە تەمووزی **١٩٤٥**یشدا سەرۆکی هەر یەکە لە ئەمەریکا و بریتانیاو سۆڤێت لە بۆتسدام کۆبوونەوە و ئاگادارکردنەوەیەکیان دایە ژاپۆن کە تیایدا داوای خۆبەدەستەوەدانی دەستبەجێی و بەبێ مەرجیان لە ژاپۆن کرد، بەڵام ژاپۆنییەکان بەمە رازینەبوون و هاوپەیمانانیش لەو کاتەدا دەیانویست زۆر بەخێرایی کۆتایی بە جەنگەکە بهێنن، کەچی ژاپۆنییەکان هەر لە بەرگری بەردەوامدا بوون، ئەمەش وایکرد لە ٦ی ئابی **١٩٤٥**دا فرۆکە ئەمەریکییەکان بۆمبای ئەتۆمی بۆ یەکەمجار لە مێژوودا لە شاری (هیرۆشیما) بوەشێنن، دوای ئەوەش بە سێ رۆژ شاری (ناکازاکی) بەر بۆمبای ئەتۆمی بدەن، کە بەم دوو رووداوە توانیان زیانێکی زۆر گەورە بە ژاپۆنییەکان بگەیەنن و تەنها لە (هیرۆشیما) ٨٠ هەزار کوژراو و ١٢٠ هەزار بریندار و ١٠٠ هەزار بێ سەروشوێنی لێکەوتەوە، کە ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی ژاپۆنییەکان لە ١٤ی ئابی **١٩٤٥** خۆیان بدەن بەدەستەوە و بە مەرجەکانی هاوپەیمانان رازیبن، لە **٢**ی ئەیلوولشدا گەلاڵەنامەی خۆبەدەستەوەدان لەگەڵ هاوپەیماناندا مۆربکەن، بەم جۆرەش کۆتایی بە جەنگی دووەم جیهانی هات، کە نزیکەی شەش ساڵی خایاند و تەواوی جیهانی گرتەوە و زەرەرو زیانێکی ماددی و مرۆیی گەورەی لێکەوتەوە.

# بەشی شەشەم

## جیهان لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی

بەخۆبەدەستەوەدانی ژاپۆن کۆتایی بە جەنگی دووەمی جیهان هات و ئەم جەنگەش کۆمەڵێك ئەنجامی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی گەورەی لێکەوتەوە:

## یەکەم: ئەنجامەکانی جەنگی دووەمی جیهانی

بە کۆتاییهاتنی جەنگ کۆتایی بە ترسی ئەڵمانیا و ململانێ سەربازییەکان هات و هەریەکە لە ئەڵمانیا و وڵاتە شەڕکەرەکانی تریش ڕووبەڕووی کاولکارییەکی گەورە لە شار و کێڵگە و کارگە و هێڵەکانی گواستنەوە و پرد و دەزگا پیشەسازییەکانیان بوون و لێرەشەوە زیانێکی ماددی گەورەیان بەرکەوت، هەروەها ئەم جەنگە چەندین کێشەی تری وەك کێشەی دیل و بێکاری و بێوەژنی و هەتیوی خستەوە، ئەمە جگە لەوەی لەو گۆڕانکارییە بنەڕەتییەی کە لە دۆخی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا هێنایە ئاراوە و کۆتایی بە سیستەمی کۆنی باڵادەستی ئەورووپی هێنا و ئەو فرەزلهێزییەی کە پێشتر هەبوو، لەناوی برد و بریتانیای لەسەرجەم پێگە نێودەوڵەتییەکان و سەروەریێتی ئابووری و سیاسیی جیهان هێنایە خوارەوە و لێرەشەوە دوو زلهێزی گەورە لە جیهان دەرکەوتن، کە سۆڤێت و ئەمەریکا بوون.

### ١. ئاوارەبوون

لە ئەنجامی ئەم جەنگەدا تەنها لە ئەورووپا نزیکەی **٢١** ملیۆن کەس ئاوارە و بێ شوێن و جێ کەوتن، ئەمە جگە لەو کەسانەی کە لە سەربازگە نازییەکاندا دەستبەسەر بوون، کە نزیکەی **٥** ملیۆن ڕووسی و ملیۆن و نیوێك پۆڵەندی و ملیۆن و نیوێك فەرەنسی بوون، هەر بۆیە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە هەر لە ساڵی **١٩٤٣**ەوە کۆمەڵەی تایبەت هاتە ئاراوە، کە دواتر لە

ساڵی ١٩٤٧یشدا چەند دەزگایەکی تایبەتی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ هەمان مەبەست دامەزرا.

### ٢. کاولکاری

یەکێکی تر لە ئەنجامەکانی جەنگی دووەمی جیهان، ئەو کاولکارییە بێ ژمارەیە بوو کە ئەم جەنگە بەدوای خۆیدا هێنای و مێژوو بەر لەوە شتی وەهای بەخۆیەوە نەبینیوە، ئەم جەنگە بووە هۆکاری رووخان و کاولبوونی سەدان و بگرە هەزاران ماڵ و خانوو و کارگە و خوێندنگە و نەخۆشخانە و کێڵگەی کشتوکاڵی و رێگە و ئامرازەکانی گواستنەوە لە ئەورووپا و لە چین و لە ژاپۆنیش، تەنها لە پۆڵەندا ٣/١ بیناکان داڕووخابوون، لەو ناوچانەی رووسیاش کە ئەڵمانیا دەستی بەسەردا گرتبوو، کاولکارییەکان زۆر زۆر لەوە زیاتر بوو، هەروەها هەر یەك لە فەرەنسا و بەلجیکا و هۆڵەندا بە رادەیەك دووچاری کاولکاری بوونەوە کە بۆ بیناکردنەوەی، پێویستیان بە داهاتی نەتەوەیی سێ ساڵ هەبوو بەپێی پێوەرەکانی پێش جەنگ، ئەمە جگە لەوەی کە هەر یەکە لە ناکازاکی و هیرۆشیما بە تەواوەتی کاول بووبوون، جگە لە چەندین شاری تری وەکو بەرلین و ناوچەکانی تری ئەورووپا. کاولکارییەکان بە جۆرێك کارگە و ئامێرەکانی گواستنەوەیان گرتبووەوە، کەبەپێی ئاماژەکان چەندین ساڵی دەویست بۆ ئەوەی ئەو وڵاتانە بگەنەوە ئاستی پێش جەنگ، تەنانەت بریتانیاش کە داگیریش نەکرابوو، بەڵام زیانێکی وەهای پێگەیشتبوو بەهۆی بۆمبارانە ئاسمانییەکانەوە، نزیکەی ٣/١ خانووەکانیان رووخابوو و ئەمە جگە لەو زیانەی کە بەر کارگە و رێگەوبان و دامودەزگاکانی تر کەوتبوو.

### ٣. لایەنی دارایی و ئابووری

جەنگی دووەمی جیهانی بە خەرجی و رووداوەکانییەوە، کێشەیەکی ئابووری و دارایی گەورەی خستەوە و بەشێکی زۆری وڵاتانی رووبەڕووی ئایندەیەکی نادیاری ئابووری کردەوە، چونکە ئەو وڵاتانە پێویستیان بە ئابووری و داراییەکی گەورە بوو بۆ باشترکردنەوەی دۆخی ئابووری خۆیان، ئەمە جگە لەوەی بەشێکی زۆری ئەو وڵاتانەوە بەدەست قەرزێکی زۆرەوە دەیانناڵاند، بۆیە هەر لە کاتی رووداوەکانی جەنگدا، چەندین کۆنگرە بە مەبەستی چارەسەرکردنی ئەم کێشانە بەسترا، لەوانە کۆنگرەی (برتین) و (وۆدز)، هەروەها لە ساڵی ١٩٤٤دا سەندوقی دراوی نێودەوڵەتی دامەزرا، کە ئەرکە سەرەکییەکەی دابینکردنی زێڕ و دراوی پێویست بوو بە مەبەستی ئاسانکاری لە بازرگانیدا، هەروەها لەو ماوەیەدا بانکی

بیناسازی دامەزرا بۆ ئەوەی قەرزی پێویست بۆ بیناکردنەوە ببەخشێت، جگە لەوەی کە هەوڵێکی زۆر درا بۆ کەمکردنەوەی گومرگ کە بەربەستێکی گەورە بوو لە بەردەم بازرگانیدا لە نێوان هەردوو جەنگ. لە ساڵی ١٩٤٧یشدا ڕێککەوتنێکی گشتگیر لە نێوان وڵاتە ئەوروپییەکان لەسەر گومرگ و بازرگانی کرایەوە، سەبارەت بە رووسیاش، جەنگ بووە هۆکاری تێکدانی بەشێکی زۆر لەو پێشکەوتنانەی کە لە سییەکاندا بەخۆیەوە بینیبوو و لەپێناو چاککردنەوەی ئەو دۆخە ئابوورییەشدا رووسیا دەیەویست پشت بەخۆی ببەستێت نەك بە دەرەوە، کە ئەمەش جارێکی تر ئەرکە قورسەکەی کەوتەوە سەرشانی خەڵکی رووسیا و لەڕێی قوربانیدانی خەڵکی رووسیاوە وەدەستیان هێنایەوە.

### ٤. تاوانەکانی جەنگ

جەنگی دووەمی جیهان جگە لەوەی، کە بە ملیۆنەها کەسی لەناوبرد و بە ملیۆنەها بریندار و کەمئەندام و بێوەژنی لێکەوتەوە، هاوکات لە ساڵی ١٩٤٥دا چەند رووداوێکی ترسناك رووی دا، لەو ساڵەدا چەندین رووداوی کوشتن و بڕینی گەورە گەورە روویان دا و هاوکات هەر لەو ساڵەدا (هیتلەر) و (مۆسۆلینی) و چەند سەرکردەیەکی تری فاشی و نازی لەناوچوون و ئەوانەشی مابوونەوە لە ڕێگەی ئەو دادگاییەوە کە هاوپەیمانان لە نۆرمبێرگ دایان نابوو، رووبەڕووی دادگایی بوونەوە و بەشێکی زۆریان بە تاوانی جۆراوجۆر دادگایی کران، کە زۆربەی تاوانەکان لە چوارچێوەی تاوانی دژەمرۆیی بوون، ١٢ کەس لەسەرکردە دیارەکانی نازییەکان لەسێدارەدران و بەشێکی زۆریشیان بۆ هەتا هەتا زیندانی کران و بەشێکی تریشیان بە کرداری خۆکوژی خۆیان لەناوبرد. لە ساڵی ١٩٤٦یشدا دادگایەکی هاوشێوە لە رۆژهەڵاتی دوور بۆ سەرکردە ژاپۆنییەکانیش دامەزرا، کە چەندین سەرکردەی باڵای ژاپۆنی تێیدا دادگایی کران و بەشێکیشان لە سێدارەدران، ئەمە جگە لەوەی کە چەندین ساڵ لەدوای جەنگ دادگاییە نێوخۆیی و نیشتمانییەکان لە دادگاییکردنی کەسانی بەشداربوو لە تاوانە نێودەوڵەتییەکان بەردەوام بوون و زیاتر لە ٢ هەزار کەس بەر حوکمی لە سێدارەدان کەوتن.

## دووەم: کۆنگرە و پەیماننامەکانی ئاشتی

### أ. کۆنگرەکان

هەر لە ساڵی ١٩٤٣ەوە چەند کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی لەبارەی جەنگی دووەمی جیهانیەوە بەستران، کە دیارترینیان ئەوەی تاران بوو لە ساڵی ١٩٤٣دا و دوای ئەویش لە شوباتی ١٩٤٥دا لە یالّتا بە هەمان شێوە کۆنگرەیەك لە نێوان سەرکردەکانی وڵاتە هاوپەیمانەکاندا بەسترا، کە تیایدا لەسەر دابەشکردنی ئەڵمانیا و سزادانی تاوانبارانی جەنگ و سەپاندنی قەرەبوو و کۆتاییهێنان بە هێزی سەربازی ئەڵمانیا ڕێککەوتن، ئەم سەرکردانە لەو کۆنگرەیەدا لەسەر ئەوەش ڕێککەوتن کە کۆنگرەیەك لە سان فرانسیسکۆ ببەسترێت بە مەبەستی دامەزراندنی دەزگای نەتەوە یەکگرتووەکان.

بەر لە کۆتاییهێنان بە ژاپۆنیش لە ئابی ١٩٤٥دا هەرسێ سەرکردەی هاوپەیمانان لە بۆتسدام کۆبوونەوە و قسەیان لەسەر سنووری نوێی ئەڵمانیا و پۆلەندا و دابەشکردنی ئەڵمانیا کرد، ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە ئەڵمانیا تەنها وەك یەکەیەکی ئابووری سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، نەك یەکەیەکی سیاسیی. هەروەها بڕیاریان دا کە تەواوی ئەو ئەڵمانیانەی لە هەنگاریا و پۆلەندا و چیکۆسلۆڤاکیا دەژین، بۆ ئەڵمانیا بگوێزنەوە بە مەبەستی دوورکەوتنەوە لە کێشەی کەمینەکان. دوای ماوەیەکیش لە کۆتایهاتنی جەنگ، کۆنگرەیەکی تر لە لەندەن لە نێوان وەزیرانی دەرەوەدا بەسترا، کە لەم کۆنگرەیەدا بە هیچ ڕێککەوتنێك نەگەیشتن، لە ٢٩ی تەمموزی ١٩٤٦یشدا کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس بەسترا کە نوێنەری ٢١ وڵاتی لەخۆدەگرت و ئامانجیش تیایدا بەدواداچوون بوو بۆ پێشنیاری وەزیرانی دەرەوە.

### ب. پەیماننامەکان

لە شوباتی ١٩٤٧دا چەند پەیماننامەیەك لەلایەن هاوپەیمانانەوە بەسەر وڵاتە دۆڕاوەکاندا جگە لە ئەڵمانیا و نەمسا سەپێنرا، سەبارەت بە ژاپۆنیش لەدوای خۆبەدەستەوەدانی، بەشێوەیەکی کاتی کەوتە ژێر دەستی ئەمەریکاوە، بۆیە ئەمەریکییەکان پێیان باشبوو، کێشەی ژاپۆن کەمتر بێننە ناو کێشەکانی ئەوروپا و دواجار بەشێوەیەکی تاکڕەوانە کێشەی ژاپۆن یەکلایی بکەنەوە، سەبارەت بەو هاوپەیمانیانەی کە لەگەڵ وڵاتە دۆڕاوەکاندا مۆرکران، بریتی بوون لە:

### أ. پەیماننامەی پاریسی ١٩٤٧:

ئەم پەیماننامەیە بەسەر ئیتالیا و هەنگاریا و بولگاریا و ڕۆمانیا و فینلاندا سەپینرا، کە تیایدا داوا لە سەرجەم ئەو وڵاتانە کرابوو، ڕێکخراوە فاشییەکانیان هەڵبوەشێننەوە و سوپاکانیان سنووردار بکەن، هەروەها ئەو وڵاتانە ناچارکرابوون، قەرەبوویەکی تایبەت بە رووسیا و یوگسلاڤیا و یۆنان بدەن و ئیتالیاش ناچارکرا قەرەبووی حەبەشەش بداتەوە، بەڵام سەبارەت بە گۆڕانکارییە هەرێمییەکان و گۆڕنکاریی نەخشەی سیاسیی، ئەوا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ نەبوو، تەنها ئەوە نەبێ کە سەرجەم وڵاتە دۆڕاوەکان ناچارکران دەستبەرداری ویستە فراوانخوازییەکانیان ببنەوە، بەم پێیەش ئیتالیا دەستبەرداری داواکارییەکانی بوو لە ئەلبانیا و حەبەشە و ئیمپراتۆرییەکەی ئەمەریکای لاتینیشی لەدەستدا، هەر بۆیە لیبیا بوو بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ و ئەریتیریا و حەبەشە بوون بەیەك و سۆمالی ئیتالیش بوو بەشێك لە کۆماری سۆماڵی سەربەخۆ.

### ب. پەیماننامە پەرتەوازەکان ١٩٤٥:

ئەم پەیماننامانە سۆڤێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی لەگەڵ دراوسێکانیدا سەپاندی، ئەوە بوو بەپێی یەکێك لەو پەیماننامانە پۆلەندا سنووری ڕۆژهەڵاتی خۆی لەگەڵ رووسیا یەکلاییکردەوە، بەشی ڕۆژهەڵاتی چیکۆسلۆڤاکیا کە بە چیك دەناسرا، درا بە رووسیا، هەروەها یەکێتی سۆڤێت خزییە نێو کێشەی نێوان چیکۆسلۆڤاکیا و پۆلەندا لەسەر ناوچەی (تیشن)، کە لە دوا ئەنجامدا ئەو ناوچەیە درا بە چیکۆسلۆڤاکیا، هاوکات یەکێتی سۆڤێت لەگەڵ چیندا پەیماننامەیەکی بەست و بەپێی ئەو پەیماننامەیە لە بری ژاپۆن، مەنشووریا کەوتە ژێر کۆنترۆلی چینی-رووسی بە هاوبەشی.

### ج. پەیماننامەی سان فرانسیسکۆ ١٩٥١:

بەپێی ئەم پەیماننامەیە ژاپۆن لە چین و دوورگەی تایوان خرایە دەرە و ژاپۆن دوورگەکانی زەریای هێمن و چەند دوورگەیەکی تریشی کە لە جەنگی یەکەمی جیهانەوە لە ژێر دەسەڵاتی ئەودابوون، رادەستی ئەمەریکا کرد، بەمەرجێك ئەمەریکا ئەم دوورگانە لەژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەڕێوەبەرێت، سەبارەت بە قەرەبووەکانیش نەگەیشتنە ئەنجامی کۆتایی لەسەر بڕی ئەو قەرەبووەی کە ژاپۆن دەبوو بیدات و ئەمە هێڵرایەوە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ وڵاتە زیانلێکەوتووەکان، لەلایەکی تریشەوە سەرکەوتنی کۆمونیستەکان لەو ماوەیەدا لە چین،

وایکردبوو ئەمەریکا تا رادەیەکی زۆر نەرمی لەبەرانبەر ژاپۆندا بنوێنێت و ناچار بوو رەزامەندی بدات ژاپۆن هاوپەیمانێتی بەرگریکاریانە ببەستێت.

**د. پەیماننامەی نەمسا ١٩٥٥:**

وەکو پێشتر باسکرا، هیتلەر نەمسای کرد بە بەشێك لە ئەڵمانیا، بەڵام دوای شکستی ئەڵمانیا، لە کۆنگرەی بۆتسدامدا، هاوپەیمانان رێککەوتن لەسەر دابەشکردنی نەمسا بۆسەر چوار ناوچەی داگیرکراو، لەساڵی ١٩٤٥یشدا رێگە بە نەمسا درا حکومەتێکی مەدەنی هەڵبژێرێت، بەڵام هێزی داگیرکەری هەر تێدا مابوو، سەبارەت بە پەیماننامەش لەگەڵ نەمسادا، بەهۆی ناکۆکی نێوان وڵاتانی هاوپەیمانان، کە ئەمەریکا، بریتانیا، فەرەنسا لەلایەك بوون، سۆڤێتیش لەلایەکی تر، رێککەوتنەکە تا ساڵی ١٩٥٥ دواکەوت، چونکە ئەم وڵاتانە لەسەر سنووری نەمسا و بڕی قەرەبووەکان رێك نەدەکەوتن، بەڵام لە ساڵی ١٩٥٥دا پەیماننامەیەکیان بەسەر نەمسادا سەپاند، کە بەپێی ئەم پەیماننامەیە نەمسا دەبوو لە ململانێی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بێلایەن بێت و سنووری نەمساش بۆ سنووری ساڵی ١٩٣٧ گەڕێنرایەوە و یەکگرتنەوەیشی لەگەڵ ئەڵمانیا لێ قەدەغەکرا، هەروەها سوپای سەربازیی نەمساش بە رادەیەکی بەرچاو کەمکرایەوە، لە پەیماننامەکەشدا هەندێك ماف لە نەوتی نەمسا درا بە یەکێتی سۆڤێت، هەروەهای ئەو مافەی پێدرا کە داوای قەرەبوویەکی گونجاو لە نەمسا بکات.

بەم جۆرەش نەمسا بوو بە دەوڵەتێکی بێلایەن، دواتریش لەرێی هەڵبژاردنێکی ئازادەوە، توانی وڵاتێکی دیموکراتی جێگیر دروست بکات، ئەگەر چی زۆربەی جار کابینەکان ئیئتیلافیش بوون. لە ماوەی دوای جەنگدا نەمسا گەشەسەندنێکی پیشەسازی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، بووژانەوەیەکی هەمەلایەنە گرتییەوە.

## سێیەم: کێشەی ئەڵمانیا

یەکێك لە کێشە گرنگەکانی دوای جەنگ کێشەی ئەڵمانیا بوو، کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك بەبێ چارەسەر مایەوە و بوو بە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی ناکۆکی نێوان رۆژئاوا و یەکێتی سۆڤێت، وەك پێشتر باس کرا، هاوپەیمانان لە هەردوو رێککەوتننامەی یالتا و

بۆتسدامدا، ئەڵمانیایان بۆ چوار ناوچەی داگیرکراو دابەش کردبوو، بەپێی ئەم دابەشکارییە تەواوی ئەو ناوچانەی دەکەوتنە رۆژهەڵاتی ئەو هێڵەی کە بە رووباری ئۆدەر و نیسدا تێدەپەڕی، بەر یەکێتی سۆڤێت کەوتبوو و شاری بەرلینیش لەناو قوڵایی ئەم بەشەدا بوو، بەڵام شاری بەرلینیش هەر وەك ئەڵمانیا بۆ چوار پارچەی بچووك دابەش کرا. دوای دابەشکردنی ئەڵمانیا ئەنجوومەنی هاوپەیمانی دروست کرا کە نوێنەری هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی تێدا بوو بۆ بەڕێوەبردنی ئەڵمانیا، بەڵام کێشە ئایدیۆلۆژی و ناکۆکییەکانی نێوان هاوپەیمانان، بەتایبەتیش ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێت، زۆر بەخێرایی رەنگدانەوەی بەسەر لایەنی سیاسیی و ئابووری ناوچە جیاجیاکانی ئەڵمانیاوە هەبوو، کە سەرەنجام بووە هۆکاری دروستبوونی دوو دەوڵەتی جیا لە ئەڵمانیا، یەکێکیان لە بەشە رۆژئاواییەکەی بوو، کە هەر لە ساڵی ١٩٤٨ەوە ئەنجوومەنێکی بنەڕەتی تێدا دامەزرا و دەستوورێکی نوێی بۆ ئەڵمانیای رۆژئاوا دانا، دواتریش کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی دامەزراند. لە ساڵی ١٩٥٥یشدا سەربەخۆ بوو، ئەوی تریشیان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی رووسیا بوو، کە هاوتەریب لەگەڵ ئەو رووداوانەی لە رۆژئاوادا رووی دەدا، لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٩دا کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی دامەزراند و لە ساڵی ١٩٥٥یشدا بە هەمان شێوە سەربەخۆیی خۆی وەرگرت، کەواتە ئەڵمانیا بوو بە دوو لەتی جیاوازەوە، کە بەشێکیان کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوو بوو و لەسەر بنەمای سیستەمی دیموکراتی رۆژئاوایی و ئابووری سەرمایەداری دەڕۆیشت، ئەوی تریشیان کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی بوو، کە لەڕووی سیاسیی و ئابوورییەوە سیستەمێکی سۆسیالیستی پیادە دەکرد، سەبارەت بە شاری بەرلینیش بە هەمان شێوە کرا بە دووبەشی رۆژئاوایی و رۆژهەڵاتییەوە.

## چوارەم: دەزگای نەتەوە یەکگرتووەکان (UN)

دوای شکستی کۆمەڵەی گەلان لە ڕووبەڕووبوونەوەی سیستەمە دیکتاتۆرییەکانی نێوان هەردوو جەنگدا، لە دوای جەنگی دووەمی جیهانەوە، جیهان پێویستی بە دەزگایەکی نێودەوڵەتیی نوێ هەبوو، بۆ ئەەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان رێکبخات و لە دەزگای کۆمەڵەی گەلان پێشکەوتووتر و کاراتر بێت، ئەم بابەتە لە سەردەمی جەنگدا چەندین جار تاوتوێ کراوە و گفتوگۆی لەبارەوە کراوە و لە چەندین کۆنگرەی نێودەوڵەتیدا خراوەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە،

لەوانە لە کۆنگرەی (واشینگتۆن)ی ساڵی ١٩٤٢دا و لە کۆنگرەی (دۆمباتۆن ئەرکسی) ساڵی ١٩٤٤دا و کۆنگرەی (یالْتا)ی ١٩٤٥یشدا، دواجاریش لە کۆنگرەی (سان فرانسیسکۆ)، کە لەوێدا بە تەواوی دانوستانەکان لەبارەی دامەزراندنی ئەم دەزگایە نێودەوڵەتییە نوێیەوە کۆتایی پێهات و گەڵاڵەنامەیەك دارێژرا، کە لە ١١١ بەند پێکدەهات و لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥دا بە تەواوی راگەیەنرا، جیاوازیی ئەم رێکخراوەیەش لە کۆمەڵەی گەلان ئەوە بوو کە ئەم رێکخراوەیە بەشێك نەبوو لە پەیماننامەی ئاشتی بۆ ئەوەی وەك کۆمەڵەی گەلان ببێتە ئامرازی سزادان بەسەر وڵاتە دۆڕاوەکاندا، بەڵکو رێکخراوەیەکی سەربەخۆ بوو، ئەم رێکخراوە لە سەرەتادا لە ٥٠ وڵات پێکدەهات، لە ساڵی ١٩٦٠دا ژمارەی ئەندامەکانی بوو بە ١٠٠ ئەندام، لە ساڵی ١٩٧٦یشدا خۆی لە ١٥٠ ئەندام دەدا. بەپێی بەندەکانی ئەم رێکخراوەیە ئامانجەکانی لە چەند خاڵێکی سەرەکیدا خۆیان دەبینییەوە، ئەوانیش بریتی بوون:

١. پاراستنی ئاسایش و ئاشتی نێودەوڵەتی، کە ئەمانە بە ئەرکی یەکەمی رێکخراوەکە دادەنران و لە بەندی یەکەمی گەڵاڵەنامەکەدا هاتبوون، لەو گەڵاڵەنامەیەدا ئەو بنەمایانە روون کرابوونەوە، کە بۆ پاراستنی ئاسایش و ئاشتی نێودەوڵەتی بەکاردەهات.

٢. گەشەپێدانی پەیوەندی دۆستانەی نێوان وڵاتان، کە تیایدا ئەو بنەمایانە روون کرابوونەوە کە بە مەبەستی دروستکردنی پەیوەندیی دۆستانەی نێودەوڵەتی دەبوو بگیرێتەبەر، لەوانە رێزگرتن لە مافی گەلان و مافی چارەی خۆنووسین بۆ هەر نەتەوەیەك و چەندینی تر.

٣. بەدیهێنانی هەرەوەزی نێودەوڵەتی لە کێشە ئابووری و مرۆییەکاندا، یەکێکی تر لە ئامانجە سەرەکییەکانی ئەم رێکخراوەیە بەدیهێنانی هەروەزی نێودەوڵەتی بوو بۆ چارەسەرکردنی کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و مرۆییەکان، هەروەها رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکانیان بەبێ جیاوازی رەگەز و زمان و ئایین.

٤. رێکخستنی پەیوەندیی نێو ئەندامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پێناو ئامانجە هاوبەشەکان، لە بڕگەی چواری ماددەی یەکەمی گەڵاڵەنامەکەدا هاتبوو، کە نەتەوە یەکگرتووەکان ببێت بە خاڵی بنەڕەتی بۆ هەماهەنگی نێودەوڵەتی و ئاراستەکردنی، بەوجۆرەی کە لە خزمەت کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا بێت.

## دەزگا سەرەکییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان

### یەکەم: کۆمەڵەی گشتی

ئەم کۆمەڵەیە لە سەرجەم ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان پێکدێت و بە شێوەیەکی یەکسان کاردەکات، هەموو دەوڵەتێك لەو دەوڵەتانەی ئەندامن، یەك دەنگیان هەیە بەبێ ڕەچاوکردنی قەبارە و دەوڵەمەندیان، ئەم کۆمەڵەیە ساڵانە یەکجار لە مانگی ئەیلوولدا کۆدەبێتەوە، بەڵام دەکرێت کۆبوونەوەی تری نائاسایی بەپێی پێویستی ئەنجام بدات، گرنگترین ئەرکەکانی ئەم کۆمەڵەیە بریتین لە:

١. تاوتوێکردنی ئەو کێشانەی دەبنە هەڕەشە بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی.

٢. بڕیاردان بۆ چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییانەی کە پەیوەندییە دۆستانە نێودەوڵەتییەکان دەشێوێنن.

٣. بڕیاردان لەسەر بودجەی نەتەوە یەکگرتووەکان.

٤. پەسەندکردنی ئەندامی نوێ.

٥. هەڵبژاردنی ئەندامە کاتییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش و ئەندامەکانی ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

لەم کۆمەڵەیەدا دەنگدان لەسەر کێشە گرنگەکان بە زۆرینەی دوو لەسەر سێیە، بەڵام لە کێشە سادەکاندا بە زۆرینەیەکی ئاساییە.

### دووەم: ئەنجوومەنی ئاسایش

ئەم ئەنجوومەنە لە ١٥ ئەندام پێکدێت، پێنج لەو ئەندامانە ئەندامی هەمیشەیین، کە چواریان لە ساڵی ١٩٤٥ەوە ئەندامن، ئەوانیش ئەمەریکا و سۆڤێت و فەرەنسا و بریتانیا، پێنجەمیشیان چینە، کە لە ساڵی ١٩٧١ەوە بووە بە ئەندامی هەمیشەیی. لە ئەنجوومەنی ئاسایشدا هەڵبژاردن بە دەنگی، لانی کەم نۆ ئەندام دەبێت، بەڵام سەبارەت بە کێشە گرنگەکان

پێویستە وڵاتە گەورەکان لە سەری کۆك بن، و هەر یەك لەو پێنج ئەندامە مافی ڤیتۆیان هەیە، واتا ئەگەر لەبارەی کێشەیەکەوە رەزامەند نەبن، دەتوانن هەڵیبوەشێننەوە.

### گرنگترین ئەرکەکانی ئەم ئەنجوومەنە بریتین لە:

١. پارێزگارێکردن لە ئاسایش و ئاشتیی نێودەوڵەتی.

٢. بەدواداچوون لەو کێشە و ناکۆکییە نێودەوڵەتییانەی، کە ئەگەری ئەوەیان هەیە ببنە هۆکاری پێکدادانی نێودەوڵەتی.

٣. بانگهێشتکردنی ئەندامان بۆ کۆبوونەوە بە مەبەستی دانای سزای ئابووری لەپێناو روونەدانی جەنگ یان وەستاندنی جەنگ.

٤. بڕیاردانی جەنگ لەدژی وڵاتە دەستدرێژیکارەکان.

### سێیەم: سکرتاریەت

لەناو نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەپێی داواکاریی ئەنجوومەنی ئاسایش، سکرتێرێك لەلایەن کۆمەڵەی گشتییەوە بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێت، کە زیاتر ئەم سکرتێرە لە وڵاتە بێدەسەڵات و بچووکەکان دەبێت، ئەرکی ئەم دەزگایە زیاتر بەڕێوەبردنی رێکخراوەکەیە و ئەرکی سکرتێری گشتیش ئەوەیە ساڵانە راپۆرتێك بدات بە کۆمەڵەی گشتی و تیایدا چالاکییەکانی رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لەو ساڵەدا روون بکاتەوە، هەروەها ئەرکێکی تری ئەم دەزگایەش ئەوەیە کە ئەنجوومەنی ئاسایش لەو کێشانە ئاگادار بکاتەوە کە دەبنە ترس لەسەر ئاشتی نێودەوڵەتی.

### چوارەم: دادگای دادی نێودەوڵەتی

ئەم دادگایە بارەگاکەی لە لاهایە لە هۆڵەندا و لە ١٥ دادوەر پێکدێت، کە ئەو دادوەرانە لەلایەن ئەنجوومەنی ئاسایش و کۆمەڵەی گشتییەوە بە هاوبەشی هەڵدەبژێردرێن و هەر سێ ساڵ جارێك یەك لەسەر سێیان بە دادوەری نوێ دەگۆڕدرێن.

**پێنجەم: ئەنجوومەنی راسپاردن**

ئەم ئەنجوومەنە ئەرکی سازدانی داگیرگەکان بوو بەر لە قۆناغی سەربەخۆیی بۆ سەربەخۆبوون.

**شەشەم: ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی**

ئەم ئەنجوومەنە لە ٢٧ ئەندام پێکدێت کە لەلایەن کۆمەڵەی گشتییەوە هەڵدەبژێردرێن و ساڵانە یەك لەسەر سێیان بە ئەندامی نوێ دەگۆڕدرێن، ئەرکی ئەم ئەنجوومەنە بریتییە لەوەی چاودێری ئەو کارانەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات کە پەیوەستن بە لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەییەوە، هەروەها کاری ئەو بریکارییە تایبەتمەندانە رێکدەخات کە سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانن، وەك رێکخراوەی کاری نێودەوڵەتی و رێکخراوەی تەندروستی نێودەوڵەتی و هتد.

لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا کۆمەڵێك دەزگا و بریکاریی تایبەت بە چەند لایەنێکی جۆراوجۆر هەیە، لەوانە یەکێتی پۆستەی نێودەوڵەتی، یەکێتی گەیاندنی بە تەل و بێتەلی نێودەوڵەتی، رێکخراوەی فرۆکەوانی مەدەنی نێودەوڵەتی، رێکخراوەی بازرگانی، رێکخراوەی خۆراکی نێودەوڵەتی، رێکخراوەی کشتوکاڵی نێودەوڵەتی، رێکخراوەی بانکی نێودەوڵەتی و هەروەها رێکخراوەی پەروەردە و فێرکاری (یونیسکۆ، یونیسێف) و چەندین رێکخراوەی تر، کە لە راستیدا نەتەوە یەکگرتووەکان زیاتر لەم بوارانەدا توانیویەتی ئەرکی سەرەکی خۆی ببینێت.

# بەشی حەوتەم

## جەنگی سارد و دەرکەوتنی دوو جەمسەری لە جیهاندا*

### یەکەم: پێناس و هۆکارەکانی جەنگی سارد

لەدوای جەنگی دووەمی جیهان، بەتایبەتی لەدوای ساڵی ١٩٤٧ەوە زۆر بەڕوونی دوو جەمسەری سەرەکی لە جیهان دەرکەوتن، کە ئەم دوو جەمسەرە جیاوازییەکی فراوانیان لەڕووی سیستەمی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی و بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییەکانیاندا هەبوو، لێرەوە بە تەواوی سیستەمی دووجەمسەری شوێنی سیستەمی فرەجەمسەری گرتەوە، کە مەڵبەندەکەی لە ئەوروپا بوو، لەم سیستەمە نوێیەدا مەڵبەندی جەمسەرەکان گواسترایەوە بۆ ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێت، کە سەرەنجام ململانێ و ناکۆکییەکی درێژخایەن لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەدا دروست بوو، کە لە مێژوودا بە جەنگی سارد ناسراوە.

لەم جەنگەدا ململانێیەکی زۆر قورس و ناکۆکییەکی زۆر توند هەبوو، بەڵام لەڕێگەی دەزگاکانی راگەیاندن و پرۆپاگەندە و سیخوڕی و ململانێی ئابووری و بەستنی هاوپەیمانێتییەوە بوو، نەك لەڕووی سەربازییەوە، پەیوەندی نێوان ئەم دوو جەمسەرە زۆر جار دەبووە مایەی قەیرانێکی توندی نێودەوڵەتی، بەڵام لە ترسی بەکارهێنانی چەکە پێشکەوتووەکان و دووبارەبوونەوەی جەنگی نێودەوڵەتی و روودانی جەنگی سێیەمی جیهانی، دانیان بەخۆیاندا دەگرت و پەنایان بۆ چەك نەدەبرد، هەر بۆیە بە جەنگی ساردیش ناسرا، واتا ئەو جەنگەی کە جیاواز لە جەنگە ترادیسیۆنییەکانی پێشتر چەکی تێدا بەکارنەهاتووە. مەودای مێژوویی ئەم جەنگەش لە ساڵی ١٩٤٥ەوە دەست پێدەکات و لە ساڵی ١٩٩١ کۆتایی پێدێت، لەم ماوەیەدا

* بۆ یەکەمجار دەستەواژەی جەنگی سارد لەلایەن سیاسەتمەداری ئەمەیکی باروخ (Baruch)ەوە بەکارهاتووە.

لەڕووی ئابووری و هزری سیاسیی و ئایدیۆلۆژیی و کۆمەڵایەتییەوە و بەشی هەرە زۆری جیهان بەسەر دوو بلۆکی جیاوازدا دابەش بووبوو، بلۆکێکیان بلۆکی رۆژهەڵاتی بوو، بەسەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤێت و ئەم بەرەیە لەڕووی ئابوورییەوە، سەر بە سیستەمی سۆسیالیستی بوو و ئایدیۆلۆژییەکەیشی مارکسیزم بوو و سیستەمی حوکمیش لەم بەرەیەدا لەسەر بنەمای تاك حزبی و تۆتالیتاریستی بەڕێوە دەچوو، کە زیاتر رووسیا و ئەورووپای رۆژهەڵات و هەروەها چەند وڵاتێکی تر لە کیشوەرەکانی ئەمەریکای لاتین و ئاسیا و ئەفریقا لە لە چوارچێوەی ئەم بلۆکەدا بوون، بلۆکی دووەمیش، کە بە بەرەی رۆژئاوا ناسراوە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سەرۆکایەتی دەکرد، ئەم بلۆکەیان لەڕووی ئابوورییەوە سەرمایەداری بوو و سیستەمی حوکمیشی دیموکراسی بوو و ئایدیۆلۆژییەکەیشی لیبرالی بوو، بۆیە بنەمای جەنگ لە نێوان ئەم دوو سیستەمەدا لەسەر بنەمایەکی نوێ دامەزرابوو، کە بنەمای ئایدیۆلۆژیی و سیستەمی ئابووریی و سیاسیی جیاواز بوو، ئەم جیاوازییانەش، کە هۆکارێکی سەرەکیی جەنگەکە بوون، هەر لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ۱۹۱۷ی رووسیاوە دەرکەوتبوون و هەر لەو کاتەشەوە گرژی و جیاوازییەکانی نێوان ئەم دوو بەرەیە چەکەرەیان کردبوو، بۆیە لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانیشەوە، زلهێزەکانی خۆرئاوا هەر بە چاوی گومانەوە دەیانڕوانییە یەکێتی سۆڤێت و بە ترسەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژیش لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا بایکۆتیان کردبوو، کە ئەمەش وای لە بەشێك لە مێژوونووسان کردووە دەستپێکی جەنگی سارد بگەڕێننەوە بۆ ساڵی ۱۹۱۷ و دامەزراندنی یەکێتی سۆڤێت و راگەیاندنی هەوڵەکانی رزگارکردنی گەلانی ژێردەستە لە ساڵی ۱۹۱۹. هەرچەندە ئەوە راستە کە جیاوازی و ململانێکان لەوێوە دەرکەوتن، بەڵام راستی ئەوەیە، کە ئەو جەنگەی پێیدەگوترێت جەنگی سارد، لەدوای جەنگی دووەمی جیهانەوە دەستی پێکرد، چونکە لەدوای جەنگی دووەمی جیهانەوە ئەو جۆرە جەنگە لە نێوان ئەم دوو بلۆکەدا دەرکەوت کە چەکی تێدا بەکارنەهاتووە، کە خودی جەنگەکەش لەو کێشانەوە دەست پێدەکات کە لەدوای جەنگی دووەمی جیهانەوە لە نێوان وڵاتە سەرمایەدارییەکانی رۆژئاواو سۆڤێتەوە دەرکەوتن، لەو کاتەدا کە هاوپەیمانی یەکدی بوون لە جەنگی دووەمی جیهاندا. لە گرنگترین ئەو کێشانەش، کێشەی ئەڵمانیا بوو، کە سەرەتای راستەقینەی زەقبوونەوەی جیاوازییەکانی نێوان ئەم دوو جەمسەرە لەوێوە دەرکەوتن، لە هەردوو کۆنگرەی یالتا و بۆتسدامدا باس لە دابەشکردنی ئەڵمانیا کرا لە نێوان هاوپەیماناندا، جیاوازی بۆچوون و بەرژەوەندی ئەو وڵاتانە وایکردبوو کە بە هیچ ئاکامێکی یەکلاییکەرەوە نەگەن،

ئەمەش وردە وردە کێشەکانی قوڵتر کرد و بریتانیا و فەرەنسا و ئەمەریکای لێکنزیك کردەوە و بەو رادەیەی لە بەرانبەر سۆڤێتدا پارچەکانی خۆیان لە ئەڵمانیا یەك بخەن و ئەڵمانیا بەسەر رۆژهەڵات و رۆژئاوادا دابەش ببێت، ئەم دابەشبوونەی ئەڵمانیا بەسەر ناوچەی رۆژهەڵاتی سۆڤێتی و رۆژئاوای سەرمایەداری، لە راستیدا سەرەتای چەکەرەکردنی ئەو ململانێیە بوو، کە جەنگی ساردی لێکەوتەوە.

کێشەی ئێران یەکێکی تر بوو لەو کێشانەی، کە زیاتر درزی جیاوازی و ململانێکانی نێوان ئەو دوو بەرەیەی فراوانتر کرد، ئەویش بە هەمان شێوە یەکێك بوو لە کێشەکانی سەردەمی هاوپەیمانێتی ئەو وڵاتانە لە جەنگی دووەمی جیهاندا، چونکە لەکاتی جەنگی دووەمی جیهاندا، بەپێی رێککەوتننامەی تاران، ئێران بەسەر سێ ناوچەدا دابەشکرابوو، بەشی باکوور بەر سۆڤێت و باشووریش بۆ بریتانیاو ناوەڕاستیش سەربەخۆ بوو، کاتێك کە جەنگ تەواو بوو، دەوڵەتی ئێرانی داوای لە هاوپەیمانان کرد، خاکی ئێران چۆڵ بکەن، هەرچەندە ئەمەریکا و بریتانیا سوپای خۆیان کشاندەوە، بەڵام سۆڤێت ئامادە نەبوو خاکی ئێران چۆڵ بکات، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو هەوڵی دا زیاتر لەرێگەی ئازەربایجان و کوردستانەوە، بەرژەوەندییەکانی خۆی لە ئێران جێگیرتر بکات، کە ئەمەش بووە مایەی نیگەرانی و ترسێکی زۆری ئەمەریکاو بریتانیا، لێرەشەوە نیازەکانی سۆڤێتیان بە تەواوی بۆ روون بووەوە و ئەوەندەی تر سۆڤێتیان لا گوماناوی و ترسناك بوو.

کێشەی یۆنان و تورکیا یەکێکی تر بوو لەو کێشانەی کە پەیوەندیی نێوان ئەم دووجەمسەری ئاڵۆزتر کرد، چونکە بەپێی رێککەوتنی چەرچڵ و ستالین لە مۆسکۆ، یۆنان بەر رۆژئاواییەکان کەوتبوو، بەڵام دوای کۆتاییهاتن بە جەنگ، هەردوو جەمسەرەکە خۆیان بۆ ئەوە ساز دەدا کە حکومەتێکی لە رەنگ خۆیان بۆ یۆنان دابمەزرێنن، بەتایبەتی بریتانییەکان کە دەیانویست دەسەڵاتی (جۆرجی دووەم)ی هەڵاتوو بۆ یۆنان بگێڕنەوە، ئەوە بوو لە سەرەنجامی ئەو هەڵبژاردنەی کە لە مارتی ١٩٤٦دا لەژێر چاودێر خۆیاندا بەڕێوەچوو، هەر ئەمەیان هێنایە ئاراوە و جۆرجی پاشایان گەڕاندەوە، ئەمەش مایەی نیگەرانی بوو بۆ کۆمونیستەکان، چونکە ئەوان پێیان وابوو یۆنان بە یارمەتی سۆڤێت لە دەستی نازییەکان رزگاری بووە، بۆیە بەم دۆخە قایل نەبوون و ئیدی ململانێکان لەوێشدا لە نێوان ئەو دوو بەرەیە زیاتر قوڵ بووەوە و تا دواجار بووە هۆی ئەوەی جەنگێکی نێوخۆیی لە یۆناندا بکەوێتەوە و لەم جەنگەشدا کۆمونیستەکان

پشتیوانی بەرهەڵستکارەکانی ئەو حکومەتەیان دەکرد و سەرمایەدارەکانیش پشتیوانی حکومەتەکە بوون، کەئەمەش هێندەی تر کێشەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای قوڵتر کردەوە.

سەبارەت بە تورکیاش ئەوە بوو کە لەدوای جەنگی دووەمی جیهاندا سۆڤێت دەیەویست تورکیا پێداچوونەوەیەك بە ڕێککەوتنی مۆنترۆی ١٩٣٦دا بکات، کە لەبارەی بەندەر و ڕێگا ئاوییەکانییەوە بوو، بەمەش دەیەویست پێگەی خۆی لە گەرووەکانی فۆسفۆر و دەردەنیل بەهێزتر بکات، بەڵام تورکیا بەمە ڕازینەبوو، ڕۆژئاواییەکانیش لە بەرانبەر ترسی سۆڤێتدا، بەتایبەت ئەمەریکا پشتیوانییەکی گەورەیان لە تورکەکان کرد و لەڕێی پرەنسیپی ترومانەوە یارمەتییەکی زۆری تورکیایان دا بۆ ئەوەی بتوانێت لە بەرانبەر ڕووسیادا خۆی ڕابگرێت.

جگە لەو کێشانە، هاوکات کێشەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاش یەکێکی تر بوو لەو کێشانەی کە جەنگی ساردی نێوان ئەو دوو جەمسەرەی خستەوە، چونکە لە کۆنگرەی پۆتسدامدا (ستالین) ڕازینەبوو بەوەی لەو وڵاتانەدا هەڵبژاردن ئەنجام بدرێت، لەبەر ئەوەی لەوە دەترسا نەیارەکانی سەرکەوتوو بن، کە ئەمەش پێچەوانەی بەندەکانی کۆنگرەی یاڵتا بوو، کە بەپێی ئەو بەندەی لە کۆنگرەی یاڵتادا هاتبوو، دەبوو ئەو وڵاتانە لەڕێی هەڵبژاردنێکی ئازادەوە حکومەتی خۆیان هەڵبژێرن، بەتایبەتیش لە پۆڵەندا، چونکە ڕۆژئاواییەکان داوای ئەوەیان دەکرد  لە پۆڵەندا بەبەشداری ئەو حکومەتەی لە لەندەن بوو کە سەر بە ڕۆژئاوا بوو، هەڵبژاردن ئەنجام بدرێت، بەڵام سۆڤێت بێ ڕەزامەندی ئەوان حکومەتێکی دەستکردی خۆی لە وارشۆ دامەزراند، ئەمە جگە لەوەی کە هەر لە ژێر فشاری سۆڤێتدا بەشێکی زۆر لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، لەوانە چیکۆسلۆڤاکیا و یوگسلاڤیا و هەنگاریا حکومەتەکانیان بووبون بە کۆمونیستی، کە ئەم پەلهاویشتنەی سۆڤێتیش بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا ترسێکی گەورەی بۆ ڕۆژئاواییەکان دروست کردبوو و ئەوان زۆر لەو پەلهاوێژییەی سۆڤێت دەترسان.

هەموو ئەو کێشانەی باس کران هۆکاری گرنگی دەرکەوتنی سەرەتاکانی جەنگی سارد بوون، بۆیە بۆچوونی زۆرینە پێیوایە کە سەرەتا ڕاستەقینەکانی ئەم جەنگە لە ساڵی ١٩٤٥ەوە دەرکەوت، بەتایبەتیش لە کۆنگرەی یاڵتا و دوای ئەویش پۆتسدامەوە، واتا هەرچەندە جیاوازییەکان لە نێوان سۆڤێت و وڵاتە سەرمایەدارەکان هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی حوکمی کۆمونیستییەوە لە سۆڤێت دەرکەوتبوون، بەڵام جەنگی سارد بەو مانایەی کە هەیەتی، لەدوای جەنگی دووەمی جیهانەوە دەست پێدەکات.

## دووەم: چۆنێتی بەڕێوەچوونی جەنگی سارد و ڕووداوەکانی

دوای ئەوەی هەر یەك لە ئەمەریکا و سۆڤێت لە مەرامەکانی یەکدی گەیشتن و بە تەواوەتی لەو راستییە گەیشتن کە پێکهاتنیان کارێکی ئەستەمە و ململانێی بەرژەوەندییەکانیان لەوە چووەتەدەر چارەسەر بکرێت، ئیدی دەستیان بە هەنگاوەکانیان کرد بۆ بردنەوەی ئەم جەنگە نوێیە، لەم پێناوەشدا تەواوی رێگاکانیان گرتەبەر، یەکێك لەو رێگایانە کە لەسەرەتای جەنگەکەوە دەرکەوت، سیاسەتی گەمارۆدان یان ئیحتیواکردن بوو، کە ئەم سیاسەتەش زیاتر بە پرەنسیپەکەی (هاری ترومان) دەستی پێکرد.

لەدوای جەنگی دووەمی جیهان، یەکێك لە کێشەکان لاوازی ئابووری بوو، ئەم لاوازییە ئابوورییە بووبووە کێشەیەکی گەورە بۆ بەشێکی زۆر لەو وڵاتانەی کە ترسی بڵاوبوونەوەی کۆمونیستی لێدەکرا، بۆ نموونە یۆنان لەو کاتەدا لەژێر فشارێکی زۆری سۆڤێت دابوو، بریتانیاش لە یارمەتیدانی یۆنان رووبەڕووی دۆخێکی ئابووریی زۆر خراپ بووەوە، بۆیە هانای بۆ ئەمەریکا برد، لە لایەکی تریشەوە، بەهۆی لاوازی ئابوورییەوە لە تورکیا، تورکیا تا دەهات زیاتر دەکەوتە ژێر هەڕەشەی بڵاوبوونەوەی کۆمونیستییەوە، لەولاشەوە سەرکەوتنی کۆمونیستەکان لە پۆلەندا، ئەمانە هەمووی وایان لە ئەمەریکا کرد کە هەوڵ بدات بەر بە تەوژمی بڵاوبوونەوە و پەلهاویشتنی کۆمونیزم بگرێت، یەکێك لەو رێگایانەش کە بۆ ئەم مەبەستە گرتییە بەر، بەشێك بوو لە جەنگی سارد، پرەنسیپەکەی (ترومان) بوو، ترومان لە بەرانبەر کۆنگرێسدا گوتارێکی پێشکەش کرد و تیایدا داوای لە کۆنگرێسی ئەمەریکی کرد یارمەتی ماددی پێشکەش بە یۆنان و تورکیا بکرێت بۆ ئەوەی لەدەست نەچن، ئەوە بوو لە ژێر رەزامەندیی کۆنگرێس، بڕی ٢٥٠ ملیۆن دۆلار بۆ یۆنان تەرخان کرا و ١٥٠ ملیۆن دۆلاریش بۆ تورکیا، بەمەش وردە وردە ئابووری ئەو وڵاتانە بووژایەوە و ترسی بڵاوبوونەوەی کۆمونیستی رەوییەوە، هاوکات لەڕێی ئەو بەخشینانەوە، ئەم دوو وڵاتە هاتنە چوارچێوەی فەلەکی ئەمەریکییەوە، کەواتە لێرەوە جەنگی نفوز و گەمارۆدان دەستی پێکرد، واتا پلانەکەی (ترومان)، کە بریتی بوو لە یارمەتیدانی ماددی، ئەو وڵاتانەی لەژێر مەترسی فراوانخوازی سۆڤێتیدا بوو، هەنگاوی یەکەم بوو، بەڵام ئەم هەنگاوە هەموو شتێك نەبوو بۆ رووبەڕووبوونەوە بەرانبەر تەوژمی کۆمونیستی، کە تادەهات، لە وڵاتە هەژارەکاندا دەرفەتی بڵاوبوونەوەی زیاتر دەبوو، تایبەت دوای ئەوەی کە بە کردەوە

ئەمە لە هەڵبژاردنەکانی وڵاتانی رۆژئاوا لە ئەوروپاش دەرکەوت و پارتە کۆمونیستەکان دەستکەوتی باشیان بەدەست دەهێنا، هەربۆیە (جۆرج مارشاڵ)ی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکاش پلانێکی تری پێشکەش کرد، ئەویش بریتی بوو لە یارمەتیدانی ئەو وڵاتانەی دەیانەوێت خۆیان لەڕووی ئابوورییەوە رێك بخەنەوە، کە لە بنەڕەتدا ئەمە بەشێك بوو لە ململانێکان و هەوڵدان دژی تەوژمی کۆمونیستی، بەڵام بەڕێگەیەکی ئابوورییەوە، کە لەڕێی ئەم پرۆژەیەوە ئەمەریکا نزیکەی ٢٠ ملیار دۆلاری وەك یارمەتی بەخشییە وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵات بە مەبەستی بەهێزکردنیان لە بەرانبەر پەلهاویژی سۆڤێتدا، بۆیە یەکێك لەو ئامراز و رێگایانەی کە لەم جەنگەدا بەکاردەهات، رێگەی چەکی ئابووری بوو، کە دواتر سۆڤێتیش هانای بۆ هەمان چەك برد و هەمان سیاسەتی بەکارهێنا، تایبەت لە وڵاتانی جیهانی سێدا، کە یارمەتییەکی زۆری بەشێکی هەرە زۆری جوڵانەوە رزگاریخوازەکانی ئەو وڵاتانەی دا لە دژی دەسەڵاتە سەرمایەدارییەکان و حکومەتە سەرمایەدارییەکان دەجەنگان.

یەکێکی تر لە رێگاکانی ئەم جەنگە سیاسەتی هاوپەیمانیبەستن بوو لەلایەن وڵاتانی رۆژئاوا و رۆژهەڵاتەوە، ئەوە بوو هەر یەکێك لەم دوو جەمسەرە لەپێناو خۆڕێکخستنەوە و بەرەنگاربوونەوەی جەمسەرەکەی بەرانبەردا چەند هاوپەیمانێتی و رێککەوتننامەیەکی سیاسیی و سەربازییان بەست، لەوانە لە ساڵی ١٩٤٨دا وڵاتانی رۆژئاوای ئەوروپا بۆ یەکخستنەوەی ریزەکانیان پەیمانی (برۆکسل)یان بەست، دوای ئەویش لە ساڵی ١٩٤٩ پەیمانی باکووری (ئەتڵەسی NATO) لە نێوان ئەمەریکا و بریتانیا و ئیتالیا و هۆڵەندا و بەلجیکا و نەرویژ و دانیمارك و فەرەنسا و کەنەدا و پۆرتوگاڵ و ئایسلاندا بەسترا، کە دواتریش هەر یەك لە تورکیا و ژاپۆنیش دوای ئەوەی بۆ جەمسەری رۆژئاوایی یەکلایی بوونەوە، چونە ناو ئەم پەیمانەوە. لە ساڵی ١٩٥٣یش هاوپەیمانێتییەك لە نێوان ژاپۆن و کۆریا بەسترا، ئەمە جگە لە چەندین وردە رێککەوتنی تر بەپێی هەلومەرج و بارودۆخ. لەبەرانبەر ئەمانەشدا بلۆکی رۆژهەڵاتی هەمان ئەو هەنگاوانەی گرتەبەر، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٤٧دا کۆمنفۆرمی راگەیاند، واتا نووسینگەی راگەیاندنی پارتە کۆمونیستییەکان، کە مەبەستیان لە هاوکاریکردنی پارتە کۆمونیستییەکانی جیهان بوو، کە ئەمە زیاتر لەبەرانبەر پرۆژەی مارشاڵدا هاتە ئاراوە، هەروەها لە ساڵی ١٩٥٥دا وڵاتە کۆمونیستییەکان لە بەرانبەر (ناتۆ)دا پەیمانی (وارشۆ)یان راگەیاند، کە پەیمانێك بوو لە نێوان سۆڤێت و پۆڵەندا و رۆمانیا و هەنگاریا و چیکۆسلۆڤاکیا و بارەگاکەی لە وارشۆ بوو، لە

لایەکی تریشەوە، سۆڤیێت هاوکاری تەواوی پارتە کۆمونیستییەکانی بزووتنەوە بەرهەڵستکاری و رزگاریخوازەکانی دەکرد بەتایبەتی لە ئاسیا و ئەفریقا و باکووری ئەمەریکاوئەمریکای لاتینی.

### - کێشە و قەیرانە گرنگەکانی ئەم جەنگە

لە ئەنجامی ئەم ململانێیەدا زۆرجار ناکۆکی و ململانێکان دەگەیشتنە ئەو شوێنەی کە قەیرانێکی سیاسیی گەورە و هەندێکجاریش تا ڕادەی بەکارهێنانی چەك بخاتەوە، بەڵام لە ترسی چەکە قورسەکان هەر یەك لە ئەمەریکا و سۆڤیێت خۆیان لە جەنگی راستەوخۆ دەپاراست، بۆیە زۆرجار ئەو کێشانەی کە لە ئەنجامی پێکداهەڵپژانی بەرژەوەندیی ئەم دوو جەمسەرە دەکەوتەوە، لە چەند ناوچەیەکی تردا دەردەکەوت.

یەکێك لە گرنگترین ئەو کێشانە، کێشەی کۆریا بوو، ناوچەکانی کۆریا کە لەکاتی جەنگی دووەمی جیهاندا لەژێر دەستی ژاپۆن بوون، دوای جەنگ لەلایەن هاوپەیمانانەوە ئەم ناوچانە لەژێر دەسەڵاتی ژاپۆن دەرکران و بە هەمان شێوەی ناوچەکانی تر وەك ئەڵمانیا و رۆژهەڵاتی ئەوروپا، کۆریاش بەسەر دوو لەتدا دابەش کرا، باشوورەکەی بەر ئەمەریکا کەوت و باکوورەکەیشی بەر سۆڤیێت، ئەوە بوو دوای مشتومڕ و بێنەوبەرەیەکی زۆر، ئەم دوو لەتە نەیانتوانی یەکبگرنەوە و بەپێی بڕیارێکی نەتەوە یەکگرتووەکان دوو دەوڵەت دروستکرا، یەکێکیان کۆریای باکوور کە لەژێر سایەی سۆڤیێتدا بوو، ئەویتریشیان کۆریای باشوور کە لە فەلەکی ئەمەریکیدا دەخولایەوە، ئەم دوو وڵاتە لە ئەنجامی کێشەکانیان نەیانتوانی بەیەکەوە هەڵبکەن، بۆیە لە ساڵی ١٩٤٩دا شەڕ لە نێوانیاندا دروست بوو، هەر لەو ساڵەشدا بوو کە کۆماری چینی میللی دامەزرا، ئەمە زیاتر لە خزمەت بەرژەوەندییەکانی سۆڤیێت و کۆریای باکوور بوو، هەر بۆیە بەهۆی یارمەتییەکانی (ستالین) و (ماوتسی تۆنگ)ەوە، هێزەکانی کۆریای باکوور توانیان بچنە ناو خاکی کۆریای باشوورەوە، ئەو شکستەی کۆریای باشوور مانای شکستی ئەمەریکاش بوو، چونکە کۆریای باشوور بایەخێکی زۆری بۆ ئەمەریکا هەبوو، بەمەش بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لە رۆژهەڵاتی دوور کەوتنە ژێر هەڕەشە و مەترسی چین و سۆڤیێتەوە، بۆیە بە ناچاری ئەمەریکا هێزی خۆی نارده ناوچەکە و جەنگ لەو ناوچانەدا بە پشتیوانی هەر یەك لە ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤیێت و چین تا ساڵی ١٩٥٣ بەردەوام بوو، کە جەنگەکە هێندە قورس بوو تا ئەو رادەیەی ئاراستەیەك لە ناو ئەمەریکییەکان دەرکەوتبوو داوای وەشاندنی چەکی ئەتۆمی دەکرد

لە بەرانبەر چین، کەواتە ئەمە یەکێك بوو لەو پێکداهەڵپژانانەی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا و سۆڤێت و رووداوەکانی جەنگی سارد.

رووداوەکانی جەنگی سارد و ململانێکانی رۆژ بە ڕۆژ توندتر و فراوانتر دەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی بیستەمەوە تا ناوەڕاستی شەستەکان، چەند گۆڕانکارییەك روویان دا کە تا رادەیەك گرژییەکانیان کەم کردەوە، لەوانە مەرگی ستالین لە ساڵی ١٩٥٣دا کە تاڕادەیەکی زۆر گۆڕانکاریی بەسەر سیاسەتی سۆڤێتدا هات و ساردییەك ململانێکانی گرتەوە و هەریەکە لە (خرۆشۆڤ) و (بۆلکاتین) جارێکی تر چوونەوە ناو پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و لەو ماوەیەشدا بەهۆی ئەو سیاسەتەوە یەکێتی سۆڤێت پەیوەندیی دیپلۆماسی لەگەڵ ئیسرائیل دامەزراند و لە ساڵی ١٩٥٥یشدا بە دامەزراندنی نەمسای سەربەخۆ رازیبوو و هەر لەو ساڵەشدا بەشداری لە کۆنفرانسی چەکداماڵینی ژنێف کرد، کە ئەمەریکاش لەو کۆنفرانسەدا بەشدار بوو، ئەمە جگە لەوەی لە کۆنگرەی ٢٠ی پارتی کۆمونیستی سۆڤێتیدا، کە لە ساڵی ١٩٥٦دا بەسترا، رەخنەیەکی توند ئاراستەی خودی ستالین و کارەکانی کرا و جەخت لەوە کرایەوە کە ژیان لەگەڵ وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا پێویستە، لە بەرانبەر ئەم هەنگاوانەی سۆڤێتیشدا هەر لەو ماوەیەدا لە ئەمەریکاش سەرۆك (ئەیزنهاوەر) هاتە سەر حوکم کە تا رادەیەك سیاسەتێکی نەرمتری بەرانبەر سۆڤێت دەنواند.

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە رووداوەکانی جەنگی سارد بە تەواوی وەستابن، یان بەرەو نەمان چووبن، چونکە لە ساڵی ١٩٥٧ بەدواوە جارێکی تر گرژی کەوتەوە نێو پەیوەندییەکانی ئەم دوو لایەنە و لەو ساڵەدا بوو (خرۆشۆڤ) رایگەیاند کە سۆڤێت دەستی بە دروستکردنی موشەکێکی نوێ کردووە کە دەتوانێت بە هەزاران کیلۆمەتر ئەتۆم بهاوێت، هەر لە هەمان ساڵیشدا بوو سۆڤێت، یەکەم مانگی دەستکردی خۆی ناردە ئاسمان، ئەم کارانەی سۆڤێـتیش ترسێکی گەورەی لای ئەمەریکا دروستکرد و جارێکی تر هەنگاوەکانی ئەمەریکا بۆ ململانێکردنی سۆڤێت دەستی پێکردەوە، بەڵام ئەمجارەیان ململانێی ئەتۆمی بوو، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٥٨دا ئەمەریکاش یەکەم مانگی دەستکردی خۆی ناردە بۆشاییەکان و ململانێکان تا دەهات توندتر دەبوو.

لە سەروبەدی چڕبوونەوەی ململانێکانیشدا بوو جارێکی تر سۆڤێت کێشەی بەرلینی زیندووکردەوە، کە لە ساڵێ ١٩٥٨ەوە جارێکی تر سۆڤێت هەوڵی دا ئەو کێشانەی کە لەسەر شاری بەرلین هەبوون، بوروژێنێتەوە، ئەویش زیاتر لەبەر ئەوەی کە شێوازی ژیان و رادەی بژێوی

سله بەشە رۆژئاواکەی بەرلیندا باشتر بوو لەچاو بەشە رۆژهەڵاتییەکەی ژێر دەسەڵاتی لایەنگرانی سۆڤێتی، هەر بۆیە بەشێکی زۆری دانیشتوانی بەشە رۆژهەڵاتییەکە وردە وردە بەرەو بەشە رۆژئاواییەکە کۆچیان دەکرد و لاوازی دەسەڵاتی رۆژهەڵاتییەکان دەردەکەوت، ئەمەش سەرانی بەرەی رۆژهەڵاتی نیگەران دەکرد و وای لێکردن کە جارێکی تر کێشەی ئەو شارە بوروژێنەوە، ئەوە بوو رایانگەیاند کە رۆژئاواییەکان بە چەکدارکردنی بەشی رۆژئاوای ئەڵمانیا، سەرپێچی بەندەکانی کۆنگرەی بۆتسدام دەکەن، بۆیە هیچ مافێکیان بە بەرلینەوە نەماوە و پێویستە شاری بەرلین یەکبخرێت و بکرێتە پایتەختی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتی، ئەم بارودۆخە رۆژ بە رۆژ توندتر و ئاڵۆزتر دەبوو، بەتایبەتی لە تشرینی دووەمی ١٩٥٨دا دۆخەکە بەیەکجاری تەقییەوە، دوای ئەوەی (خرۆشۆڤ)ی سەرۆکی رووسیا بە فەرمی پشتیوانی خۆی بۆ ئەڵمانیای رۆژهەڵاتی دەربڕی و بارودۆخەکەش بە ئاقاری هەڕەشەکردنی بەکارهێنانی هێزدا رۆیشت، ئەمەش بووە هۆکاری قەیرانێکی سیاسیی گەورە کە دوای زنجیرەیەکی دوور و درێژ لە کۆبوونەوە و کۆنگرەی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٦١دا کۆتایی بەم کێشەیە هات، بەڵام هەر لەو ساڵەشدا بوو کە دیواری بەرلین لە نێوان هەردوو بەرەکەدا لەلایەن ئەڵمانیای رۆژهەڵاتییەوە دروست کرا.

هەر لەو ماوەیەشدا بوو کە کێشەی کوبا وەك بەشێك لە ململانێکانی نێوان ئەم دوو جەمسەرە دەستی پێکرد، لەو سەروبەندەدا کە سۆڤێت سەرقاڵی تاقیکردنەوە ئەتۆمییەکانی بوو، لە ساڵی ١٩٥٩دا (فیدل کاسترۆ) توانیبووی پاتێستای سەربە سەرمایەدارەکان لە کوبا وەدەرنێت، (پاتێستا) دەمێك بوو ناوە ناوە حوکمی کوبای دەگرتە دەست و یەکێك لە سیاسییە راستڕەوە دیارەکانی کوبا بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٥٢ەوە لە کوبا شۆڕشێکی چەکدارییانەی بە سەرکردایەتی پارێزەر (کاسترۆ)ەوە لە دژی ئەم دەسەڵاتە راگەیەنرابوو و لە ساڵی ١٩٥٨دا دوای شەڕێکی دوور و درێژ، ئەو شۆڕشە توانی بە رادەیەکی زۆر حکومەتەکەی پاتێستا لاواز بکات و لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٩ەوە سەرکەوتنی تەواو بەدەست بهێنێت. هەرچەندە کاسترۆ لە سەرەتادا کۆمونیستێکی تەواو نەبوو، بەڵام لەگەڵ رەوتی رووداوەکاندا وردە وردە بەرژەوەندییەکانی بەلای سۆڤێتدا کەوتەوە و توانی پشتیوانی سۆڤێت بە تەواوی بەدەست بهێنێت و ببێتە نەیاری بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لەو ناوچەیە، لێرەشەوە جەنگێکی گەورە لە نێوان لایەنگرانی کۆمونیستی بە پشتیوانی سۆڤێت و پارێزگارەکان بە پشتیوانی ئەمەریکا لە کوبا کەوتەوە، کە تا ناوەڕاستی شەستەکانی خایاند و لەوێوە وردە وردە بەرەو هێوربوونەوە چوو.

لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە چەند ڕووداوێکی تر دەرکەوتن کە بوونە هۆکاری گۆڕانکاری گەورە بەسەر ڕەوتی ڕوداوەکانی جەنگی سارددا، لەوانەش دەرکەوتنی (کۆمەڵەی وڵاتانی بێلایەن) لە جیهانی سێیەمدا و بووژانەوەی هەستی نەتەوەیی لە ڕۆژئاوای ئەوروپا و زیادبوونی کاریگەریی چین و ژاپۆن بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، لەلایەکەوە دەرکەوتنی کۆمەڵەی وڵاتانی بێلایەن، ئەو کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩٦١دا بە فەرمی لە بەلگراد ڕاگەیەنرا و تەنها ئەو وڵاتانەی دەگرتەوە، کە سەر بە هیچ بەرەیەك لە دوو بەرەکە نەبوون، واتا نە سەر بە ئەمەریکا بوون و نە سەر بە سۆڤیێت، ئەوە بوو لە ماوەی کارەکانیادا چەندین کۆنگرەیان لە قاهیرە و لۆساکا و جەزایر و کۆلۆمبۆ و کوبا ئەنجام دا، بە گشتی ئەو کۆمەڵەیە نزیکەی ٨٦ ئەندامی لە وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتین و ئەوروپا هەبوو. دەرکەوتنی ئەو کۆمەڵەیە، بەجۆرێك لە جۆرەکان کاریگەر بوو لە کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئەو دوو زلهێزە لە جیهانی سێیەمدا، چونکە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە ڕایان دەگەیاند کە ئەوان نە سەر بە ڕۆژئاوان و نە سەر بە ڕۆژهەڵاتن، بەڵکو سەربەخۆن، کە ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر کاریگەر بوو لەسەر کەمکردنەوەی کاریگەریی ئەو دوو جەمسەرە لە ڕەنگڕێژکردنی سیاسەتی جیهان، چونکە بەشی هەرە زۆری ململانێکانیان لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا بوون.

لەلایەکی تریشەوە وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا کە بەر لە جەنگ خاوەن دەسەڵات و نفوزێکی ئابووریی و سیاسیی گەورە بوون لە جیهاندا، بەڵام لە دوای جەنگی دووەمی جیهانەوە بە دەرکەوتنی ئەو دوو زلهێزە و لە ئەنجامی ماندوبوون و شەکەتیان لە جەنگ، تەواوی ئەو پێگە سیاسیی و ئابوورییەی هەیانبوو، لەدەستیان دا، بۆیە هەمیشە چاویان لە گەڕانەوەی ئەو شکۆمەندییەی خۆیان بوو و لە هەوڵی ئەوەدا بوون جارێکی ڕۆڵ لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا پەیدا بکەنەوە، چونکە بەهۆی کاریگەریی ئەو دوو جەمسەرە کاریگەریی ئەو وڵاتانە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا زۆر کەم بووبوو، لەم پێناوەشدا دوای چەند هەنگاوێك لە ساڵی ١٩٥٧دا لە ڕۆژئاوای ئەوروپا بازاڕی هاوبەشی ئەوروپییان ڕاگەیاند، کە ئەمەش سەرەتای دەرکەوتنەوەیان بوو وەك هێزێك، کە زیاتر هێزێکی نێوەندی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ڕادەیەك کاریگەر بوو لە کەمکردنەوەی کاریگەری ئەو دوو جەمسەرە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا.

لەولاشەوە دەرکەوتنی چەند دەسەڵاتێك لە ئاسیا کە ڕۆژ بە ڕۆژ لە پێشکەوتن و برەوسەندندا بوون، ڕۆڵی گەورەیان هەبوو لە کەمکردنەوەی هەژموونی سیاسییانەی ئەم دوو

جەمسەرە لە ناوچەکەدا، ئەم دوو وڵاتە کە ژاپۆن و چین بوون، یەکێکیان وەك هێزێکی سیاسیی گەورە و ئەویتریشیان وەك هێزێکی ئابووری گەورە، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لە ناوچەکانی خۆیاندا کاریگەریی ئەو دوو جەمسەرەیان کەمتر دەکردەوە، چین کە لە ساڵی ١٩٤٩دا بە سەرکردایەتی (ماوتسی تۆنگ) توانی دەسەڵاتێکی سۆسیالیستی دابمەزرێنێت، تا ساڵی ١٩٥٧ یەکێك بوو لە هاوپەیمانە بەهێزەکانی سۆڤێت و یارمەتیدەرێکی گەورەی زانستی و ئابووری و هونەری بوو بۆ ئەو، بەڵام دواتر لەو هاوپەیمانێتییە کشایەوە، ئەمەش کاریگەریی هەبوو لە لاوازکردنی هەردوو جەمسەرەکەی جەنگی سارد، چونکە بە ڕوویەکدا کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر سۆڤێت هەبوو و بەڕوویەکی تریشدا بووە هۆکاری ئەوەی کە لە شەستەکانەوە چین زیاتر بەلای وڵاتانی جیهانی سێیەمدا بشکێتەوە، دەسەڵات لە نێوەندە ڕزگاریخوازەکاندا پەیدا بکات و زیاتر وەك هەڵگری ئاڵای خەباتی دژە ئەمەریکی بناسرێت و لە سەرەتای حەفتاکاندا دیپلۆماسیەتی چین ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر بێت و ئەو ڕاستییە بسەلمێنێت کە ئەو هەژموونی دوو جەمسەرەکەی قبوڵ نییە. کەواتە بە ڕادەیەکی زۆر لە پێگە و نفوزی سۆڤێت کەم بکاتەوە و دژایەتییەکی قورسی ئەمەریکاش بکات.

لەولاشەوە ژاپۆن بەپێشکەوتنە ئابوورییەکانییەوە، توانیبووی وەك جەمسەرێکی ئابووری گەورە خۆی بسەپێنێت و لە شەستەکان بەدواوە بگاتە ئاستی ئەو جۆرە وڵاتانەی کە کاریگەری گەورەی هەبێت لە کەمکردنەوەی ڕۆڵی هەر یەکە لەو دوو جەمسەرە.

گرنگترین کێشەکانی ئەو ماوەیەی جەنگی ساردیش شەڕی ڤێتنام بوو، کە بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا و ڕۆژهەڵاتییەکان لەوێشدا وردە وردە دەبوونە مایەی دەرکەوتنی یەکێکی تر لە ناوچەی ململانێکانی جەنگی سارد، کە ئەویش ڤێتنام بوو. لە ڤێتنامدا هەر لە ساڵی ١٩٤٥ەوە شۆڕشێکی ڕزگاریخوازی بە سەرۆکایەتی (هۆشی مینا)ی سەرۆکی پارتی کۆمونیستی ڤێتنامەوە لە دژی داگیرکاری فەرەنسا دەرکەوتبوو، ئەم شۆڕشە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەچووە پێش، بەتایبەتی دوای ئەوەی کۆمونیستەکان لە چین سەرکەوتن و لەوێشەوە یارمەتییەکی زۆریان پێگەیشت و ئەم جوڵانەوەیە ئەوەندەی تر چووە پێش و تەنگی بە فەرەنسییەکان هەڵچنی و لە سەرکەوتنی بەردەوامدا بوو، ئەم سەرکەوتنانەی ڕزگاریخوازانی ڤێتنام کە لەلایەن کۆمونیستەکانی چین و سۆڤێتەوە پشتیوانی دەکرا، نیگەرانییەکی گەورە بوو بۆ ئەمەریکا و بەرژەوەندییەکانی لەوێدا بە تەواوی خستە مەترسییەوە، هەر بۆیە ئەمەریکاش بڕیاری دا یارمەتی فەرەنسییەکان بدات، بەو پێیەی کە ئەو شەڕە لەوێ دژی بلۆکی ڕۆژهەڵاتییە واتا چین و سۆڤێت، ئیدی ئەمەریکا دەستی

بە ناردنی پارە و چەك و سەرباز کرد بۆ ناوچەکە و شەڕێکی یەکجار توندوتیژ لە ڤێتنام کەوتەوە بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٦٦ بەدواوە.

لە کۆتایی حەفتاکان و بەدرێژایی هەشتاکانیش، جەنگی سارد پێی نایە قۆناغێکی نوێوە کە قۆناغی سەرەتای لێکهەڵوەشانەوەی بلۆکی سۆڤێت بوو، ئەم قۆناغەش لەوێوە دەستی پێکرد کە هێزەکانی سۆڤێت روویان کردە ئەفغانستان و تا ساڵی ١٩٨٥ی خایاند، گرنگترین دیاردەکانی ئەم قۆناغە بریتییە لە کێشە موشەکییەکان و شەڕی ئەستێرەکان، چونکە لەگەڵ توندتربوونی ململانێ و ناکۆکییەکاندا تایبەت لەدوای جەنگی ڤێتنامیشەوە، بەرهەمهێنانی موشەکە کیشوەربڕەکان لە هەردوو جەمسەری رۆژهەڵات و رۆژئاوادا تا دەهات زیاتر دەبوو، بۆ نموونە لە سەردەمی (ئایزنهاوەر)دا ئەمەریکا نزیکەی ٢٠٠ موشەکی کیشوەربڕی هەبوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٧دا ژمارەی موشەکەکانی گەیشتنە ١٠٠٠ موشەك، کە ئەمیش زیاتر لە ترسی موشەکە کیشوەربڕ و مانگە دەستکردەکانی سۆڤێت بوو. بە گشتی ئەم ململانێیە لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەدا دەرکەوت و رۆژ بە رۆژ لەبرەوسەندندا بوو و بودجەیەکی زۆر و توانایەکی زانستی ئێجگار گەورەی لە هەردوو جەمسەرەکەدا بۆ تەرخان کرابوو، بە رادەیەك ساڵانە بە ملیار دۆلار لەم کێبەڕکێیەدا خەرج دەکران و لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٧ بەدواوە ئیدی هەریەکێك لەم دوو جەمسەرە خاوەن نوێترین جۆرەکانی موشەك و کڵاوەی ئەتۆمی و مانگە دەستکردەکان بوون. گرنگترین کێشەکانی ئەو سەردەمەش، کێشەی ململانێیە لەسەر فراوانکردنی نفوزی هەر یەك لەم دوو جەمسەرە لە جیهانی سێیەمدا، لەو ماوەیەدا چەندین کێشە دەرکەوتن کە بەرژەوەندییەکانی ئەم دوو جەمسەرە تیایدا رۆڵی گەورەیان بوو و زۆرجار پێکداهەڵپژانەکانیان تا ئاقاری جەنگ دەڕۆیشت، لەوانە کێشەی عەرەب -ئیسرائیل لە ١٩٧١دا.

کێشەی عەرەب_ ئیسرائیل یەکێك بوو لەو کێشانەی کە هەر لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی رابوردووەوە تا ناوەڕاستی حەفتاکان بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕی و هەستیاری کێشەکە و گرنگی ناوچەکەش وایکردبوو کە هەر یەکێك لەو دوو جەمسەرە بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان هاوکاری لانێك لە لایەنەکان بکەن، بۆ ئەوەی بەر بە باڵادەستی جەمسەری بەرانبەر بدات، بۆیە ئەم دوو جەمسەرە لەم کێشەیەدا بە شێوەی جۆراوجۆر بەشداربوون، بۆ نموونە لە شەڕی عەرەب — ئیسرائیلی ١٩٥٦دا سۆڤێت راستەوخۆ بە چەك و یارمەتییە چەکسازییەکان لەپاڵ عەرەبەکانەوە بەشدار بوو.

یەکێکی تر لەو کێشانەی لەو کاتەدا ئەم دوو جەمسەرە ڕۆڵی گەورەیان تێدا بینی، کێشەی دەسەڵات و حکومەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و یەکلاییکردنەوەی لە بەرژەوەندی خۆیان بوو، بۆ ئەم مەبەستەش ئەم دوو جەمسەرە بە تەواوی هاتبوونە ناو ئەو کێشانەوە، لەوانەش کێشەی هاتنی قەزافی بۆ سەر حوکمی لیبیا لە ساڵی ١٩٦٧ و بەعسییەکان لە عیراق و حافز ئەسەد لە سوریا ساڵی ١٩٦٨ و تەنانەت لە میسریش لە سەرەتای سەردەمی ساداتەوە تا ساڵی ١٩٧٣، لەم کێشانەدا بە شێوەیەکی گشتی نفوز و دەسەڵاتی سۆڤێت ڕوو لە زیادبوون بوو و یارمەتییەکانی لەڕووی چەکەوە بەردەوام بوو، تا ئەو ڕادەیەی کە ئەم کردارانەی رووسیا ئەمەریکای زۆر نیگەران کردبوو، چونکە هەر یەکە لە سۆڤێت و ئەمەریکا هەوڵیان دەدا بەهۆی شوێنە ستراتیژی و هەستیارەکانیانەوە ئەو حکومەتانەی لەو ناوچانەدا دێنەسەرکار، لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی ئەواندا بخولێنەوە، بۆیە زۆرجار لەو پێناوەدا کێشەکان تا ئاقاری بەکارهێنانی چەك دەڕۆیشتن، لە سەرەنجامی ئەم کێشانەشدا لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرەتا سۆڤێت ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو، بەڵام دواتر وردە وردە ئەمەریکا توانی ئەو دەسەڵاتانە بهێنێـتەوە ناو چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی خۆی و لە حەفتاکانی سەدەی ڕابوردووەوە لە بەشی زۆری وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چەند دەسەڵاتێکی تاکڕەو و دیکتاتۆرییانە دروست بکات و بە هەموو جۆرێك پشتیوانی لە مانەوەیان بکات، ئەویش لە ترسی دروستنەبوونی کێشە لە ناوچەکە و دزە نەکردنەوەی سۆڤێت بۆ ناو کێشەکان و قۆستنەوەیان لە بەرژەوەندی خۆیان، هەر ئەمەش وایکرد کە لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە تا ناوەڕاستی هەشتاکان تەواوی دەسەڵاتەکانی عیراق و سووریا و بەشی هەرە زۆری وڵاتانی تری ناوچەکە بە ئێرانیشەوە (هەرچەندە دواتر ئێران زۆر خێرا سیاسەتی نە ڕۆژهەڵاتی و نە ڕۆژئاوایی بەرزکردەوە) بەوجۆرە دروست بن، کە لە بەرژەوەندی ئەواندا بێت، کە کورد و کێشەکەیشی یەکێك بوون لە قوربانیانی ئەم سیاسەتە.

ئەمە جگە لەوەی لە ئەفریقاش ئەم کێشانە هەر بەردەوام بوون، بۆ نموونە لە ئەنگۆلا کە دوو بەرەی نێوخۆیی هەبوو، یەکێکیان سەر بە سۆڤێـت بوو (NPLA)، ئەویتریشیان سەر بە ئەمەریکا بوو (UNITA)، ئەم دوو بەرەیە لە ململانێی بەردەوامدا بوون، سەرەنجام شەڕێکی درێژخایەنیش لە نێوانیاندا کەوتەوە، کە ئەم شەڕەی ئەنگۆلا نموونەیەکی زۆر بچووکراوەی پێکداهەڵپژانی ئەمەریکا و رووسیا بوو.

کێشەکانی جەنگی سارد هەر بەردەوام بوون و تا دەهات فرەڕەهەند و قوڵتر دەبوو، لە پاڵ هەموو ئەمانەدا سۆڤێت لەڕێی هەوڵدانەوە بۆ هێنانە سەرحوکمی ڕژێمی کۆمونیستی، چ بەهۆی

بوونی پارتی کۆمونیستییەوە بێت بۆ نموونە لە ئەفغانستان، یان بزووتنەوەی رزگاریخوازییەوە بێت بۆ نموونە ئەنگۆلا، هەوڵی دەدا پێگەی سۆسیالیزم لە جیهان و بە تایبەتیش لە ناوچە هەستیارەکان فراوانتر بکات، کە ئەمەریکاش بە هەموو جۆرێك رێگری لەم هەنگاوانەی سۆڤیێت دەکرد و لە بەرانبەردا هەوڵی دەدا ئەو دەسەڵاتانە بهێنێتە سەر حوکم کە لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی خۆیدا بوون، هەر لەو پێناوەشدا کێبەڕکێ و پێشبڕکێیەکی چەکسازیی گەورە لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەدا رووی دا، وەك موشەکی درێژخایەن و چەکی ئەتۆمی و شەڕی ئەستێرەکان.

لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە ئەم کێشانە و زۆری ململانێکان و ناکۆکییەکان وردە وردە ئەم دوو هێزەی بەرەو شەکەتبوون برد و سەرەنجام پردەکانی لێکنزیکبوونەوەی نێوان ئەم دوو هێزە زیاتر بوو، کە لە سەرەتاوە بە قۆناغی کەمکردنەوەی گرژی و دەستپێکردنەوەی دانوستان لەسەر کەمکردنەوەی چەك و رێککەوتننامە دەستی پێکرد، کە لەم بوارەدا رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان رۆڵی گەورەیان بینی، لە ناوەڕاستی هەشتاکان بەدواوە وردە وردە بەیەکگەیشتن و کۆبوونەوەکانی نێوان رێبەرانی ئەمەریکا و سۆڤیێت لە زیادبووندا بوو، ئەوە بوو لە نێوان ساڵی ١٩٨٥-١٩٨٩ سەرۆك (ریگان)ی ئەمەریکی و سەرۆك (گۆرباچۆڤ)ی رووسی دووجار بەیەکەوە دانیشتن.

## سێیەم: بارودۆخی ناوخۆیی ئەمەریکا لە سەردەمی جەنگی سارددا

لەدوای جەنگی دووەمی جیهانەوە بووژانەوەیەکی گەورە بەسەر ئابووری ئەمەریکادا هات و جارێکی تر ئابووری ئاشتی شوێنی ئابووری جەنگی گرتەوە و ملیۆنەها سەرباز گەڕانەوە بۆ بوارەکانی کار و بەرهەمهێنان، لەم ماوەیەدا (هاری ترومان) لە دوای مردنی رۆزفێلد هاتە سەر حوکم، بە هاتنی ئەو، وردە وردە بارودۆخی ئابووری لە ئەمەریکا پێشکەوت، یەکێك لەو سیاسەتانەی کە (هاری ترومان) دەریکرد، (ڤیزدل) بوو، واتا یاسای دادپەروەری، کە تیایدا بە رادەیەکی زۆر هەوڵدرا بژێوی کرێکاران باشتر بکرێت، بەم جۆرە لە نێوان ساڵی ١٩٤٥-١٩٤٧ داهاتی ئەمەریکا زیاتر لە ١٥ ملیار دۆلار زیادی کردبوو و ژیانی ئابووریش لە پێشکەوتنێکی بەردەوامدا بوو. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو پێشکەوتنانەدا، یەکێك لە کێشەکانی حکومەتی ترومان کێشەی بێکاری بوو، کە بووبووە مایەی ناڕەزاییەکی زۆری سەندیکاکان و حکومەتی ناچارکردبوو جارێکی تر دەست لە کاروباری ئابووری وەربداتەوە و چەند یاسایەك بە مەبەستی چاککردنی ئەم بارودۆخە داڕێژێتەوە.

کێشەیەکی تری ئەو سەردەمە، کێشەی هەڵبژاردنی سەرۆکی وڵات بوو بەو جۆرەی کە سەرۆکی هەڵبژێردراو خاوەن زۆرینەی کۆنگرێسیش بێت، چونکە بەپێی یاسا کۆنەکە زۆرجار سەرۆکی وڵات لەناو کۆنگرێسدا زۆرینەی دەنگەکانی نەبوو، بۆیە ئەمە گرفتێکی گەورە بوو لەبەردەم ئەو یاسایانەی دەری دەکرد، لەوانە هەریەکە لە ترومان و ئایزنهاوەر ئەم کێشەیەیان هەبوو، چونکە ئەوان سەرۆکی وڵات بوون، بەڵام زۆرینەی کۆنگرێس لە پارتەکەی ئەوان نەبوو، بۆ نموونە ترومان کە سەر بە کۆمارییەکان بوو، جێگری رۆزفێلدی دیموکراتی بوو، دوای مردنی رۆزفێلد هاتە سەر حوکم، دواتریش لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٥دا لە هەڵبژاردنەکاندا زۆرینەی بەدەست هێنا، بەڵام زۆرینەی کۆنگرێس لە پارتەکەی ئەو نەبوون، بۆیە کارکرا بۆ باشکردنی ئەم کێشەیە.

یەکێکی تر لە کێشەکانی سەردەمی ترومان، ئەوە بوو کە ئەم سەردەمە سەردەمی دوای جەنگ بوو، لەدوای جەنگیشدا چەندین کێشەی وەك دابەزینی بەهای دۆلار و کێشەی هاریکاریی وڵاتانی ژێر هەڕەشەی کۆمونیستی و دابینکردنی خەرجییەکانی پرۆژەی مارشال، هەروەها کێشەی کوبای رووبەڕوو بووبووەوە، کە ئەمانە تا رادەیەکی زۆر کاریگەر بوون لە کەمکردنەوەی هەیبەت و دەستەڵاتی ترومان و قەیراناویکردنی سەردەمەکەی. هەر لەو کاتەدا چەندین کێشەی تری وەك قەڵاچۆکردنی کۆمونیستەکانی ناوەوەی وڵات و کێشەی بەرلین و سەرکەوتنی (ماوتسی تۆنگ) لە چین و چەندین کێشەی تریش رووبەڕووی بووبوونەوە. هەموو ئەمانە بە تەواوی ئەو حکومەتەی ترومانیان شەکەت کردبوو، بۆیە هەرچەندە کۆنگرێس یاسای مافی دووبارە هەڵبژاردنەوەی پەسەند کردبوو، بەڵام ترومان بۆ جاری دووەم خۆی هەڵنەبژاردەوە و لە شوێنی خۆیدا کەسێکی بەناوی (ستیڤن سۆن)ەوە کاندید کرد، بەڵام لەو هەڵبژاردنەدا (ئەیزنهاوەر) سەرکەوتوو بوو، کە ئەوکات سەرکردەی گشتی هێزەکانی ناتۆ بوو.

هاتنەسەر حوکمی (ئایزنهاوەر) لەکاتێکدا بوو، کە کێشەی کۆریا کۆتایی هاتبوو، بۆیە تارادەیەك وڵات لەڕووی ئابوورییەوە، لە بووژانەوەی ئابووری و فراوانبووندا بوو، ئەمەش وایکرد لە هەڵبژاردنی دووەمی ساڵی ١٩٥٦یشدا (ئایزنهاوەر) زۆرینە بەدەست بهێنێتەوە، بەڵام لە ماوەی دووەمی حوکمکردنیدا، یەکێك لە کێشە سەرەکییەکان، کێشەی رەشپێستەکان بوو، ئەم کێشەیە هەرچەندە رەگ و ریشەیەکی قوڵی هەبوو، کە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی سەربەخۆیی ئەمەریکا، بەڵام لە سەردەمی ئایزنهاوەردا زۆر بەخێرایی تەشەنەی کرد و بوو بە یەکێك لە کێشە زۆر ئاڵۆزەکانی ناوەوەی حکومەت و بە رادەیەکی زۆر حکومەتی سەرقاڵ کرد و ناچاری کرد

هەوڵ بدات چەند هەنگاوێك بۆ کەمکردنەوەی جیاوازییەکان بنێت، بەڵام بەربەرەکانی سپیپێستەکان دەبوونە کێشە بۆ حکومەت.

لەڕووی ئابووریشەوە، کێشەی هەرە سەرەکی سەردەمی ئایزنهاوەر زیادبوونی بەروبوومی کشتوکاڵی بوو بەهۆی بەکارهێنانی ئامێری نوێ و شێوازی نوێ لە بەپیتکردنی زەوی و زار، کە ئەمەش بووە هۆکاری زیادبوونێکی لە رادەبەدەری بەروبوومە کشتوکاڵییەکان و کەمبوونەوەی بازاڕیان و دروستکردنی قەیران بۆ ئەم کەرتەی ئابووری لە ناو ئەمەریکا، بۆیە حکومەت بە ناچاری دەستی وەردایە چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە و هێورکردنەوەی.

دەرکەوتنی موشەکی بەهێزی سۆڤێتی و مانگە دەستکردەکانی، یەکێکی تر بوو لە کێشەکانی حکومەتی ئەمەریکی لەو کاتەدا، چونکە لەو کاتەدا موشەکەکانی سۆڤێت باڵادەستی ئەمەریکای لەڕووی موشەك و چەکەوە لە جیهاندا خستبووە مەترسییەوە، بۆیە ئەمەریکییەکان خەرجییەکی زۆریان بۆ ئەم مەبەستە بۆ توێژینەوە لە بواری موشەك و بۆشایی تەرخان کرد.

لە هەڵبژاردنەکانی ۱۹٦۰دا جارێکی تر دیموکراتەکان سەرکەوتنەوە و (جۆن کێنەدی) هاتە سەر حوکم، گرنگترین کارەکانی سەردەمی ئەم سەرۆکەی ئەمەریکا چەند بڕیارێك بوو بۆ نەهێشتنی جیاوازیی رەگەزی لە نێوان سپیپێست و رەشپێستەکانی ئەمەریکا و توانی تا رادەیەکی زۆر ئەم کێشەیە لە ئەمەریکا کەم بکاتەوە، هەر لە سەردەمی ئەویشدا بوو کە توانی رووسەکان والێبکات موشەکە کیشوەربڕەکانیان لە کوبا بکشێننەوە، کە ئەمەش کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر پێگەی (جۆن کێنەدی) هەبوو، بەڵام لە ۲۲ی تشرینی دووەمی ۱۹٦۳دا لە دالاس ئەم سەرۆکە تیرۆرکرا، دوای مردنی ئەویش، (لیندن جۆنسن)ی جێگری هاتە سەر حوکم، کە ئەمیش هەمان رێگاکانی ئەوی لەبواری نەهێشتنی جیاوازی و رەگەزی و پێشکەوتنی ئابووریی وکۆمەڵایەتی گرتەبەر، لە هەڵبژاردنی ۱۹٦٤یشدا (جۆنسن) توانی زۆرینەی دەنگەکان بەدەست بهێنێت، لە سەردەمی حوکمی جۆنسندا زۆرترین کۆمەڵە بڕیار لە ناوەوەی ئەمەریکا لە بواری تەندروستی و هاریکاریی نیشتەجێبوون و یاساکانی بواری فێرکاری و بواری پیشەیی و بیمە کۆمەڵایەتییەکان دەرکران، بەڵام جارێکی تر ململانێکانی جەنگ سارد تایبەت شەڕی ڤێتنام ئەم هەنگاوانەی بەرەو سستی بردەوە، چونکە ئەو شەڕە بودجەیەکی یەکجار زۆری وڵاتی بۆ تەرخان کرا و وڵاتی دووچاری گرفت کرد.

بە شێوەیەکی گشتی لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە ئەمەریکا بوو بە وڵاتی هەرە گەورەی جیهان، ژمارەی دانیشتوانەکەی چووە سەرووی ۲۰۰ ملیۆن کەس و بوو بە گەورەترین

بەرهەمهێنەر و بەکاربەری جیهان و گەورەترین هێزی سەربازیی جیهان، لەڕووی ناوخۆییشەوە سیستەمی لیبرالی و ململانێی دوو حزبی و ئازادی ئابووریی پیادەدەکرد، لەو ماوەیەشدا رای گشتی ئەمەریکییەکان بە تەواوی لە سیاسەتی گۆشەگیری دوورکەوتەوە، ئەویش بەهۆی ترسی کۆمیونستییەوە، دوای جۆنسن لە حەفتاکاندا (ریچارد نیکسۆن) هاتە سەر حوکمی ئەمەریکا، بەڵام بەهۆی کێشەیەکی ئیدارییەوە نەیتوانی ماوەی حوکمکردنەکەی تەواو بکات.

یەکێك لە کێشە سەرەکییەکانی سەردەمی حەفتاکان لە ئەمەریکا، دابەزینی بەهای دۆلار و بێکاری و دەرکەوتنی ترسی ژاپۆن و ئەوروپییەکان لەسەر بازرگانی ئەمەریکی بوو، لەلایەکی تریشەوە کێشەیەکی تریان تەشەنەکردنی کۆمونیستی و دەرکەوتنی کۆمونیستەکان بوو لە شوێنە هەستیارەکانی ناو حکومەت. هاوکات لەو سەردەمەشدا بارقورسییەکانی پیادەکردنی جەنگی موشەکی و ململانێکانی تر لەگەڵ سۆڤێت، رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبوو و هەر یەکە لە حکومەتەکانی (کەیسەنجەر) و (رۆنالد ریگان)یان ١٩٨٠-١٩٨٨ ناچار کردبوو کە خەرجییەکی زۆر بۆ ئەم لایەنە تەرخان بکەن و وردە وردە لە ناوەوەی ئەمەریکا روو لە شەکەتی بەرن، کەواتە ئەمەریکاش لە دۆخێکی زۆر باشدا نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەریکا توانی لە جەنگی سارددا خۆی رابگرێت و وردە وردە بلۆکی رۆژهەڵاتی بەرەو هەڵدێر بەرێت.

## چوارەم: هەنگاوەکانی سۆڤێت بەرەو هەڵوەشانەوە و کۆتایی جەنگی سارد

هۆکارەکانی بەرەو هەڵوەشانەوە چوونی بلۆکی سۆسیالیستی دەمێك بوو چەکەرەیان کردبوو و لەگەڵ رەوتی رووداوەکاندا گەشەیان دەکرد و لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا گەیشتە لوتکە و وردە وردە ئەم جەمسەرەیان بەرەو هەرەس دەبرد.

یەکێك لە دیارترین ئەو هۆکارانە، ئەو قەیرانە ئابوورییە بوو کە لە کۆتایی حەفتاکاندا لە سۆڤێت دەرکەوت و رۆژ بە رۆژ زیاتر پەرەی دەسەند. هۆکارەکانی ئەم قەیرانەش هەر لە دەستپێکی دامەزراندنی سۆڤێتەوە لە ئارادا بوو، چونکە وەك پێشتر باس کرا، حکومەتی نوێی سۆڤێت لەسەر دار و پەردووی رووسیای قەیسەری دامەزرا، کە لەو کاتەدا یەکێك بوو لە وڵاتە هەرە لاوازەکانی ئەوروپا لەڕووی ئابوورییەوە و جەنگی یەکەمی جیهان بە تەواوی پەکی خستبوو، هاوکات دوای جەنگ و بە هاتنەسەر حوکمی کۆمونیستەکانیش، رووسیا دووچاری ئەو جەنگە نێوخۆییە سێ ساڵییە بووەوە، کە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر لایەنی ئابووری

سۆڤیێت. ئەگەرچی لە نێوان هەردوو جەنگدا یەکێتی سۆڤیێت توانی لەڕووی ئابوورییەوە تا ڕادەیەك پێشکەوتن بەخۆیەوە ببینێت، بەڵام جارێکی تر ڕووداوەکانی جەنگی دووەمی جیهان گورزێکی گەورەیان لە ژیانی ئابووریی ئەو وڵاتە وەشاند و دووچاری قەیرانێکی ئابوورییان کردەوە، هەموو ئەمانەش لەکاتێکدا بوو کە ئەمەریکا وەك پێشتر باس کرا، قازانجێکی ئابووری گەورەی لە هەردوو جەنگی یەکەمی جیهان و دووەم بەدەست هێنا، کەواتە هەر لە سەرەتاوە لەڕووی ئابوورییەوە نابەرابەرییەك لەنێوان ئەم دوو جەمسەرەدا هەبوو.

جگە لەو هۆکارانەی باس کران، سیاسەتی ئابوورییانەی سۆڤێتیش، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر بەرەو قەیرانبردنی لایەنی ئابووری ئەم جەمسەرە، چونکە لەوێدا بەپێی سیستەمی سۆسیالیزم تەواوی ئابووری وڵات لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتدا چڕ بووبووەوە و بە تێپەڕبوونی کاتیش دەوڵەت و هێزی ئابووریی وڵات لەژێر دەستی توێژێکی دیاریکراو لەسەرانی دیاری ناو پارتی کۆمونیست کۆبوونەوە. پیادەکردنی سیاسەتی سۆسیالیستانە وردە وردە ژیانی ئابووریی سۆڤێتی بە ئاقاری قەیراندا برد، چونکە بەهۆی ئەم سیاسەتەوە گیانی کێبڕکێ و ململانێ ئابوورییەکان لەناوچوون و بەرهەمهێنان لە پێناو بازاڕدا نەما و وردە وردە بەرهەمهێنەرەکان، کە کرێکاران بوون، دەگەیشتنە ئەو باوەڕەی کە هیچ قازانجێك لە زیادبوونی بەرهەمدا نابیننەوە. ئەمە جگە لەوەی سەرانی سۆڤیێت هەر لە دەستپێکی جەنگی سارددا کەمتر بایەخیان بە نوێکردنەوەی تەکنۆلۆژییای بەرهەمهێنان دەدا، بەتایبەتیش لە بواری کشتوکاڵی و پیشەسازیدا، بەڵکو تەواوی کەرتە ئابوورییەکانی وڵاتیان کردبووە قوربانی لایەنی سەربازی و بەشی هەرە زۆی توانای ئابووری و زانستی وڵاتیان بۆ بواری چەك و چەکسازی و موشەکە کیشوەربڕەکان تەرخان کردبوو، کە ئەمەش کاریگەرییەکی زۆر خراپی بەسەر ئابووری سۆڤیێت و پێگەیەوە لە بازرگانی جیهانیدا هەبوو، بە ڕادەیەك لە کۆتایی هەشتاکاندا تەنها ٨٪ی بەرهەمە پیشەسازییەکانی سۆڤیێت دەچوونە ململانێ بازرگانییە جیهانییەکانەوە، سەرباری ئەوەش، کە لەڕووی کشتوکاڵییەوە ئەم وڵاتە لە دۆخێکی زۆر خراپدا بوو و ئەم کەرتەی ژیانی ئابووری بە تەواوی پشتگوێ خرابوو، بەو ڕادەیەی کە لەگەڵ ئەوەشدا، سۆڤیێت خاوەن گەورەترین ڕووبەری بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و گەنم بوو، کەچی لە ساڵی ١٩٨٥دا بڕی ١٢ ملیار دۆلاری بۆ هاوردەکردنی بەرهەمە خۆراکییەکان لەپێناو کەمکردنەوەی کەموکوڕییەکانی لەم بوارەدا تەرخان کردبوو، کەواتە بەڕادەیەك ئەم لایەنە پشتگوێ خرابوو، کە تەنانەت سۆڤیێت نەیدەتوانی ئاسایشی خۆراکی خۆی دابین بکات و

بەمەش دەکەوتە ژێرباری وڵاتە سەرمایەدارەکانەوە، کە ئەمە هۆکارێکی گرنگی لاوازی هەڵوێستی یەکێتی سۆڤێت بوو.

لەلایەکی ترەوە هەموو ئەو هاندان و هاریکارییە ئابوورییانەی کە سۆڤێت بۆ وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمەریکای لاتینی دەنارد، لە چوارچێوەی رووبەڕووبوونەوەی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا، دواجار بارێکی قورسیان خستە سەر لایەنی ئابووری لە سۆڤێت، چونکە سۆڤێت لە ماوەی جەنگی سارددا، هاوکارییەکی ماددی و ئابووری ئێجگار گەورەی بەم وڵاتانە دەبەخشی، چ لەڕێگەی هاوکاری بە دراوەوە ببووایە یان بە چەك یان بە مەشق و پێگەیاندنی کادر و رەخساندنی بواری خوێندن و زانستی، کە هەموو ئەمانە لەدواجاردا فشارێکی گەورە دەبوون لەسەر ئابووری ئەو وڵاتە، بۆ نموونە لە راپۆرتێکی (CIA) دەزگای هەواڵگری ئەمەریکادا هاتووە، کە لە ماوەی ٢٣ ساڵدا سۆڤێت لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە، بڕی ٣٣ ملیار دۆلاری وەك هاوکاری بە ٦٨ وڵاتی تازە پێگەیشتوو بەخشیوە و هەر لەو ماوەیەشدا نزیکەی ٥٠ هەزار خوێندکاری ئەو وڵاتانە لە یەکێتی سۆڤێتدا بوون بۆ خوێندن، هاوکات ٦٧ هەزار سەربازی ئەو وڵاتانەش لە سۆڤێتدا مەشق و راهێنانیان پێکراوە، ئەمە وێڕای ئەوەی کە لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی رابوردووەوە سۆڤێت چەند رێککەوتننامەیەکی ئابووریی لەگەڵ بەشێك لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا بەستووە و بەپێی ئەم رێککەوتننامانەش هاوکارییەکی ماددی زۆر گەورەی ئەو وڵاتانەی کردووە، بۆ نموونە دروستکردنی بەنداوێکی گەورە لەسەر رووباری فورات لە ساڵی ١٩٥٧ لە سوریا، هەروەها بەنداوێك لەسەر رووباری نیل لە میسر، هاوکات هەموو ئەو هاوکارییە ئابوورییانەی کە بۆ کوبا دەیناردن، ئەمە وێڕای سەرجەم ئەو هاریکارییانەی کە لە شەڕی عەرەب-ئیسرائیلدا بە عەرەبەکانی دەبەخشی و لە شەستەکانیشدا هاوکارییەکی زۆری سوریا و عیراق و میسر و گەلی ڤێتنامیشی کرد، کە هەموو ئەمانە لە دوا ئەنجامدا بەسەر ژیانی ئابووریی رووسیاوە دەشکانەوە و وردە وردە ئابووریی ئەو وڵاتەیان بەرەو قەیران دەبرد، کە سەرباری هەموو ئەمانەش، هەر لە سەرەتاوە سۆڤێت لە گەندەڵییەکی گەورەدا دەژیا و ئابووری وڵات بە تەواوی لەلایەن ئەندامە باڵاکانی پارتی کۆمونیستەوە قۆرخ کرابوو.

جگە لەلایەنی ئابووریی، لایەنی سیاسییش یەکێکی تر بوو لەو هۆکارانەی کە رۆڵی هەبوو لە بەرەوهەڵوەشانەوەبردنی جەمسەری رۆژهەڵات. ئەم جەمسەرە ئەگەرچی بانگەشەی سۆسیالیستی و یەکسانی و پاراستنی مافی مرۆڤ و ئازادی تاك و ئازادی بیروڕا و مافی گەلان و

کۆمەڵگەی بێ چینی دەکرد، بەڵام لە پراکتیکدا سیاسەتێکی تەواو پێچەوانەی پیادە دەکرد و لەو وڵاتەدا دەوڵەت لەژێر دەستی گروپێکی زۆر کەمی کۆمەڵگاوە بوو، کە ئەندامە باڵاکانی پارتی کۆمونیست بوون و بە بیانووی دەسەڵاتی پرۆلیتاریاوە، تەواوی جومگەکانی دەسەڵاتیان قۆرخ کردبوو، کەئەمەش لەسەر حسابی ئازادییەکانی تاك و ئازادی گوتن و دەربڕین و ئازادییەکانی تری کۆمەڵگاوە بوو. لە پێناو مانەوەیشیان تەواوی ڕێگاکانی سەرکوتکردنیان دەگرتەبەر و یەکێك لە سیاسەتەکانیان سیاسەتی توندوتیژی و سەپاندنی بێدەنگی بوو، کە هەر لە سەرەتاوە ئەم سیاسەتەیان پیادە دەکردد و لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکاندا پەرەیان پێدەدا، بەتایبەتیش لەسەردەمی (ستالینەوە ١٩٢٤-١٩٥٣*)، کە بە توندترین شێواز نەیارانی خۆی سەرکوت دەکرد و سیاسەت و بڕیارەکانی خۆی دەسەپاند، ئەمە وێڕای ئەوەی کە دەربڕینی بچووکترین نارەزایی و نیگەرانی لە حکومەت، گەورەترین سزای لێدەکەوتەوە، لەم پێناوەشدا بە دەیان شاعیر و نووسەر و خەڵکی نارازی زیندانی کران و لە وڵات وەدەر نران، لەلایەکی تریشەوە کێشەیەکی تری ئەم سیستەمە تێکەڵبوونێکی لەرادەبەدەر بوو لە نێوان پارت و حکومەت، کە ئەمە بوو بە هۆکارێك بۆ ئەوەی هەل بۆ هاتنەپێشەوەی بێ توانا و کەم ئەزموونەکان بڕەخسێت و بتوانن بە هەموو ڕێگەیەك پۆست و شوێنە گرنگەکانی حکومەت و دەوڵەت وەربگرن و لێرەشەوە رەنگدانەوەیان بەسەر کۆی دەسەڵاتەوە هەبێت و تەواوی سیستەمەکە بەرەو لاوازی بەرن، هاوکات یەکێکی تر لە کێشەکانی ئەم حکومەتە گرفتی چۆنێتی مامەڵەکردنیان بوو لەگەڵ ئایین و نەتەوە جیاجیاکانی ژێر دەسەڵاتیان، کە خراپی مامەڵەکردنیان لەم رووەوە، بووبووە مایەی نارەزایەتییەکی گەورە لەم سیستەمە. هەموو ئەم هۆکارانەی باس کران لە دواجاردا وایان کرد لە ناوخۆدا سیستەمی سۆسیالیستی بەتێپەڕبوونی کات بکەوێتە تەنگژەیەکی گەورەوە و لە قەیرانێکی نێوخۆیی درێژخایەندا بژیت.

---

* سیستەمی حوکمکردن لە رووسیا بەوجۆرە بوو، کە هەر سەرۆکێك هاتبایە سەر حوکم تا مردن حوکمی دەکرد و لە ماوەی حوکمی سۆڤێتیشدا چەند سەرۆکێك حوکمیان کردووە بەم جۆرە: ڤلادیمیر لینین ١٩١٧-١٩٢٤، جۆزێف ستالین ١٩٢٤-١٩٥٣، نیکیتا خرۆشرڤ ١٩٥٣-١٩٦٤، لیۆنید بێرجنیڤ ١٩٦٤-١٩٨٢، یۆری ئەندریۆڤ ١٩٨٢-١٩٨٤، کۆستانتین چرنینکۆ ١٩٨٤-١٩٨٥، دوای ئەویش میخائیل گۆرباچۆڤ تا کەوتنی سۆڤێت.

لەپاڵ ئەم هۆکارە ناوخۆییانەدا، چەند هۆکارێکی دەرەکیش هەبوون کە رۆڵێکی گەورەیان لە لاوازکردن و بەرەوهەڵوەشاندنەوەبردنی بلۆکی سۆسیالیستی گێڕا، چونکە سەرەڕای نابەرابەری ململانێکە لە نێوان سۆڤێت و ئەمەریکا و ئەو فشارە زۆرەی کە لەلایەن ئەمەریکاوە دەخرایە سەر سۆڤێت لە هەموو رووەکانەوە، هاوکات چەند کێشەیەکی دەرەکی دەرکەوتن، کە بە شێنەیی بلۆکی سۆڤێتیان بەرەو رووخان برد، سەرەتای ئەم کێشانەش بە تێکچوونی پەیوەندیی نێوان چین و سۆڤێتەوە دەست پێدەکات، (ماوتسی تۆنگ) ئەگەر چی لەڕێی هاوکارییەکانی یەکێتی سۆڤێتەوە توانی بەسەر (چان کای چیك)ی دوژمنیدا سەربکەوێت و لە ساڵی ١٩٥١یشەوە بوو بە هاوپەیمانی سۆڤێت، کە ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری لە بەهێزکردنی هەڵوێستی سۆڤێت لە رۆژهەڵاتی دوور هەبوو، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت بەهۆی جیاوازییە فکرییەکانیان لەبارەی خوێندنەوەی مارکسیزم و کێشە سنوورییەکانی نێوانیانەوە، ئەم پەیوەندییە وردە وردە بەرەو لێکترازان رۆیشت و لە ساڵی ١٩٥٦ەوە گرفتەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتە تا دەهات قوڵتر و ئاڵۆزتر دەبوو و سەرەتای تۆمەتبارکردنەکانی یەکتر لەبارەی لادانیان لە مارکسی و لینینەوە وردە وردە زیاتر دەبوو، تا ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩٥٩دا سۆڤێت رێککەوتننامەی ئەتۆمی نێوان هەردوولای هەڵوەشاندنەوە، لە ساڵی ١٩٦٠دا ئەم دوو وڵاتە بەتەواوی کەوتنە شەڕی راگەیاندنەوە و هەر لەو ساڵەشدا سۆڤێت تەواوی شارەزا و پسپۆڕ و زاناکانی خۆی لە چین کشاندەوە، ئەم کێشەیە زیاتر لە دوای ساڵی ١٩٦١-١٩٦٢ەوە بەهۆی گرفتی سنووری نێوان هەردوولا ئاڵۆزتر بوو تا سەرەنجام لە ناوەڕاستی شەستەکاندا ئەم دوو وڵاتە بە تەواوی نێوانیان تێکچوو و بەرەی کۆمونیستی بوو بە دوو لەتەوە، لەتێکیان لە پەکین و ئەویتریشیان لە مۆسکۆ، کە ئەمە کاریگەرییەکی نەرێنی زۆر گەورەی بەسەر هەڵوێستی سۆڤێتەوە هەبوو.

کێشەیەکی تری سۆڤێت لەڕووی دەرەکییەوە، کشانەوەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئەوروپا بوو لە هاوپەیمانێتیان لەگەڵ سۆڤێت، بەتایبەتی دوای گرژبوونی پەیوەندی نێوان مۆسکۆ و پەکین، کە سەرەتای ئەم هەنگاوانەش لە رۆمانیاوە دەستی پێکرد. رۆمانیا هەر لە ساڵی ١٩٦٢ەوە لە یەکێك لەو کۆبوونەوانەی کە لیژنە ئابوورییەکانی وڵاتە کۆمونیستەکان دەیان کرد، پشتیوانی خۆی بۆ سەربەخۆیی ئابووری و سیادەی نیشتمانی دەربڕی، دوای ئەویش خۆی یەکلا کردەوە، کە بێلایەن بێت لە کێشەی نێوان پەکین و مۆسکۆ و دواتریش بازرگانییەکان لەگەڵ چین و ئەلبانیای هاوپەیمانی چین دەست پێکرد و لە نیسانی ساڵی ١٩٦٤یشدا پارتی کۆمونیستی

رایگەیاند، هەر وڵاتێك مافی خۆیەتی کە ئەو شێوە سیاسییە هەڵبژێرێت کە خۆی دەیەوێت و باوی پارتی باوك و پارتی کوڕ نەماوە، لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە رۆمانیا بە تەواوی لە سۆڤێت جیابووەوە و لە ساڵی ١٩٦٨یشدا هەر یەکە لە دیگۆلی سەرۆکی فەرەنسا و نیکسۆنی سەرۆکی ئەمەریکا سەردانی رۆمانیایان کرد. جگە لە رۆمانیا، لە ساڵی ١٩٦٧ەوە لە چیکۆسلۆڤاکیاش کە گەورەترین وڵاتی سەر بە سۆڤێت بوو، بزووتنەوەیەکی توند لە نێو خودی پارتی کۆمونیستی ئەو وڵاتەدا دەرکەوت و ئەو پارتەی کرد بە دوو لەتەوە، کە لەتێکیان داوای ئازادی و دیموکراسی و فرەیيان دەکرد، سەرەنجامیش ئەم باڵە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و چیکۆسلۆڤاکیاش لە هاوپەیمانێتی سۆڤێت کشایەوە.

هاوکات هەر یەکە لە هەنگاریا و پۆلەنداش، جوڵەکانیان بۆ کشانەوە لە سۆڤێت دەرکەوتن و هەر لە ناوەڕاستی شەستەکان هەنگاریا دەستی کرد بە پیادەکردنی سیاسەتێکی ئابووری تەواو جیاواز لەوەی سۆڤێت و وردە وردە هەنگاوەکانی بۆ دەرچوون لە ژێر رکێفی سۆڤێت خێراتر دەبوو، هەر لەو سەروحەدەشدا بوو، کە پۆلەندا سەرپێچی سیاسەتی ئابووری سۆڤێتی دەکرد و لە ساڵی ١٩٧٠شدا بە تەواوی پەیوەندییەکانی لەگەڵ سۆڤێتدا پچڕاند.

بەجۆرەش وردە وردە یەکێتی سۆڤێت هاوپەیمانەکانی لەدەست دەدا و ئەمانەش دەبوونە مایەی لاوازی پێگە و هەیبەتی یەکێتی سۆڤێت لە جیهاندا، سەرەڕای ئەمانەش لەو کاتە هەستیارەدا کە سۆڤێت رۆژ بە رۆژ بەرەو لاوازی دەچوو، سەرانی سۆڤێت کێشەیەکی دەرەکی تریان بۆ بلۆکی سۆسیالیستی نایەوە، کە دواجار ئەم کێشەیەش بوو بە یەکێك لە هۆکارە دەرەکییەکانی لەبەریەکهەڵوەشانەوەی جەمسەرەکە، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٧٩دا بە بیانووی پاراستنی رژێمی کۆمونیستی هێرشی سەربازییان بۆسەر ئەفغانستان ئەنجام دا و داگیریان کرد، ئەم هەنگاوەی سۆڤێت وایکرد کە ئەمەریکا بە قورساییەکی گەورەوە بکەوێتە ناو کێشەکەوە و هاوکارییەکی ئێجگار گەورەی رەوتە ئیسلامییەکانی ئەو ناوچەیە لە دژی سۆڤێت بکات و لێرەشەوە سۆڤێت رووبەڕووی شەڕێکی درێژخایەن و زۆر توندوتیژ بکاتەوە، کە زیانێکی گیانی و ماددی ئێجگار گەورەی لەبەرەی سۆڤێت دا و ناچاری کرد خاکی ئەفغانستان جێبهێڵێت، کە ئەمە جگە لە زیانە ماددی و گیانییە گەورەکەی، هاوکات کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر شکۆ و نفوزی سۆڤێتدا دانا و هێندەی تر هەنگاوەکانی بۆ هەرەسهێنان خێراترکرد.

## گۆرباچۆڤ و رووخانی بلۆکی سۆسیالیستی

لەسەروبەندی خراپی دۆخی سۆڤێتدا لە ناوەڕاستی هەشتاکان، (چێرنینکۆ)ی سەرۆکی یەکێتی سۆڤێت مرد و لە شوێنی ئەودا (میخائیل گۆرباچۆڤ) ١٩٨٥-١٩٩١ هاتە سەر حوکم، هاتنە سەر حوکمی گۆرباچۆڤ لەکاتێکدا بوو کە سۆڤێت بە قورسترین قۆناغەکانیدا تێدەپەڕی و گیرۆدەی گەورەترین قەیرانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی بوو. بەڕوویەکدا حکومەت تەواو گەندەڵ و شپرزە بوو، پارتی کۆمونیستی لە لوتکەی گەندەڵیدا بوو و بە تەواوی باربوو بەسەر شانی کۆمەڵگەوە، حکومەتەکەی بە جۆرێك پەکی کەوتبوو، کە توانای دابینکردنی سەرەتاییترین خزمەتگوزارییەکانی بۆ کۆمەڵگا لەدەستدابوو، بەڕوویەکی تریشدا سۆڤێت لەو ماوەیەدا لە قەیرانێکی دەرەکی گەورەدا بوو، رۆژئاواییەکان رۆژ بە رۆژ فشاریان دەخستە سەر و تەنگیان پێهەڵدەچنی، بۆیە (گۆرباچۆڤ) کە هاتە سەر حوکم، هەستی بەوە کرد کە بارودۆخەکە پێویستی بە چارەسەرێکی خێرا هەیە، هەر ئەمەش وایکرد کارەکانی گۆرباچۆڤ بە هەردوو بەرنامەی (پیرۆسترۆیکا) و (گلاسنۆست) دەست پێبکات، واتا (دووبارە بونیادنانەوە و شەفافیەت)، گۆرباچۆڤ دەیەویست لەڕێگەی ئەم دوو بەرنامەیەوە، دووبارە وڵات لەڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە بونیاد بنێت و لەم پێناوەشدا بانگەشەی بۆ چاکسازی لە کەرت و جومگە جیاجیاکان دەکرد و هاوکات لە بەرنامەی دووەمیشیدا داوای شەفافیەت و ئاشکراکردنی دۆخی رووسیای کردبوو، بەڵام ئەم سیاسەتەی گۆرباچۆڤ نەك هیچ ئاکامێکی بەدەستەوە نەدا، بەڵکو دۆخەکەی هێندەی تر ئاڵۆز کرد، چونکە لەلایەکەوە راگەیاندنی ئەم سیاسەتانە بووە مایەی پەستی و نیگەرانی بەشێکی زۆر لە ئەندامانی پارت و بەرهەڵستکاری ئەم بەرنامەیەیان دەکرد، لەلایەکی تریشەوە دەنگە نارازییەکانی لە سیستەمی تاك پارتی و ئەو دۆخە بەرز کردەوە و داواکارییەکانی فرەیی و بازاڕی ئازادی زیاتر کرد، هاوکات گلاسنۆستیش ئەوەندەی تر کۆمەڵگەی رووسی لە گەندەڵی و کارە بێ جێییەکانی سەرانی سۆڤێت وریا کردەوە و داواکارییەکانیانی زیاترکرد، کەواتە سۆڤێت کەوتە دۆخێکی تەواو قەیراناویترەوە.

لەڕووی دەرەوەش گۆرباچۆڤ هەر لە سەرەتای هاتنییەوە هەوڵی دا گۆڕانکارییەك لە چۆنێتی بەڕێوەچوونی سیاسەتی دەرەکییەوە ئەنجام بدات، ئەوە بوو لە کۆنگرەی ٢٧ی پارتی کۆمونیستیدا لە ساڵی ١٩٨٦ لەبەردەم ئەندامانی کۆنگرەدا رایگەیاند کە پێویستە تێڕوانینی نوێیان بۆ ئاسایشی نەتەوەیی هەبێت کە جیاواز بێت لەوانی پێشوو، واتا بەڕوونی ویستەکانی

بۆ پاشگەزبوونەوە لە ململانێ دەرەکییەکان دەربڕی و هەر لەو ساڵەشدا ئەم نیازانەی خۆی ئاشکرا کرد و ئامادەیی خۆی بۆ ڕێگریکردن و قەدەغەکردنی چەکی ئەتۆمی ڕاگەیاند و لە ساڵی ١٩٨٧یشدا بڕیاری سنووردارکردنی سیستەمی موشەکی دەرکرد و دوای ئەوەش لە ساڵی ١٩٨٨-١٩٨٩ تەواوی هێزەکانی سۆڤێتی لە ئەفغانستان کشاندەوە.

جگە لەمانە، (گۆرباچۆڤ) رایگەیاند کە پێویستە هەر وڵاتێك خۆی چارەسەری گونجاوی خۆی بۆ کێشەکانی بدۆزێتەوە، لە راگەیاندنی کۆتایی هاوپەیمانێتی وارشۆشدا راشکاوانە رایگەیاند، کە هەر گەلێك مافی هەڵبژاردنی سیستەمی سیاسیی و کۆمەڵایەتی و ئابووری خۆی هەیە، کە ئەوانەش کاریگەربوون لەوەی وردە وردە یەکێتی سۆڤێت لەبەریەك هەڵوەشێتەوە و هەر وڵاتێکی سۆسیالیستی سەرپشك بێت لە هەڵبژاردنی ئەو سیستەمە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەی کە خۆی دەیەوێت و لێرەشەوە بەشێکی زۆر لەو وڵاتانە هەنگاوەکانیان بەرەو سیستەمی سەرمایەداری دەستی پێکرد، ئەمە جگە لەوەی لەبارەی کێشەی ئەڵمانیاشەوە گۆرباچۆڤ هەر لە هاتنییەوە وردە وردە دەستی لە کاروباری ئەو ناوچانەش کێشایەوە و هەنگاو بە هەنگاو هەردوو لەتی ئەڵمانیا لەیەکبوون نزیك بوونەوە، تا لە ٣ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٠دا ئەڵمانیا بە تەواوی یەکیگرتەوە و سەربەخۆیی راگەیەنرا.

شانبەشانی ئەو بەرەو پێشچوونانەی کە لە بواری نەهێشتنی گرژییەکان و چەکداماڵین و کەمکردنەوەی پێکداهەڵپژانەکان بەڕێوە دەچوو، هاوکات دیدار و دیدەنی سەرانی هەردوو بەرەکە لە هەشتاکان بەم لاوە تا دەهات زیاتر دەبوو، بەڕادەیەك لەدوای هاتنی گۆرباچۆڤەوە لە ماوەی چوار ساڵدا چوار جار سەرۆك ریگانی ئەمەریکی و سەرۆك گۆرباچۆڤی سۆڤێتی کۆبوونەوە و هەنگاوەکانیان بەرەو رێککەوتن خێراتر دەبوو، تا لە سەرەنجامدا لە ساڵی ١٩٩١دا گۆرباچۆڤ بە فەرمی هەڵوەشاندنەوەی سۆڤێتی راگەیاند. بەمەش کۆتایی بە جەنگی سارد هات و سیستەمی یەکجەمسەری ئەمەریکا و نەزمی نوێی جیهان دەستی پێکرد.

## یەکەم: بە زمانی عەرەبی:


١. د. ابراهيم خليل احمد وعوني عبدالرحمن سبعاوي: تاريخ العالم الثالث الحديث، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، جامعة الموصل، ١٩٨٩.

٢. د. احمد نوري النعيمي: تركيا وحلف شمال الاطلسي، المطبعة الوطنية، عمان، ١٩٨١.

٣. ئيدوارد هالد كار: ثورة البلاشفة ١٩١٧–١٩٢٣، ترجمة عبدالكريم احمد، الجزء الاول، دار الكتاب العربي للطباعة والنشر، القاهرة، دون تاريخ.

٤. ادونيس العكرة: من الادبلوماسية الى الاستراتيجية، دار الطليعة، بيروت، ١٩٨٠.

٥. انتون رابتكر: الوجهة الاقتصادي لاوروبا، ترجمة د. جابر عمر، دار المعرفة، بغداد، ١٩٥٥.

٦. الان بالمر: موسوعة تاريخ الحديث، ترجمة سوسن فيصل السامر و يوسف محمد امين، الجزء الاول، دار المأمون للترجمة والنشر، بغداد، ١٩٩٢.

٧. اندرو باسيفيتش: الامبراطورية الامريكية (حقائق وعواقب الدبلوماسية)، دار العربية للعلوم، ٢٠٠٢.

٨. بافل تريتياكوف: مساعدة الاتحاد السوفيتي للاقطار المتخلفة الاقتصادية، مطبة رابطة، بغداد، ١٩٦٠.

٩. ج. م. روبرتس: موجز تاريخ العالم، ترجمة فارس قطان، الجزء الثاني، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ٢٠٠٤.

١٠. جورج سكولوف: روسيا بين ١٨١٥–١٩٩١، ترجمة انطوان حمسي، الجزء الثاني (القسم الاول)، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٩٩.

١١. حسن شكري: عاصفة الجليد (امريكا ونهاية الاتحاد السوفيتي)، متكبة مدبولي للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٩٢.

١٢. د. حسن شريف: ينابيع المعرفة في السياسية الدولية المعاصرة، الجزء الاول والثالث والرابع، مطابع هيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ٢٠٠٣.

١٣. د. خليل حسين: قضايا دولية معاصرة، دار المنهل اللبناني، بيروت ٢٠٠٧.

١٤. د. خليل علي مراد وآخرون: دراسات في تاريخ الاوروبي الحديث والمعاصر، وزارة تعليم العالي والبحث العلمي، جامعة الموصل، ١٩٨٨.

١٥. سميح عبدالفتاح: انهيار الامبراطورية السوفياتية، دار الشروق للنشر والتوزيع، عمان، ١٩٩٦.

١٦. د. صلاح احمد هريدي: دراسات في تاريخ امريكا، دار وفاء للدنيا الطباعة والنشر، الاسكندرية، ٢٠٠٠.

١٧. د. صلاح احمد هريدي: تاريخ اوروبا الحديث والمعاصر ١٧٨٩-١٩١٤، دار وفاء للدنيا الطباعة والنشر، الاسكندرية، ٢٠٠٣.

١٨. د. عبدالعزيز سليمان نوار و د. عبدالمجيد نعنعي: تاريخ المعاصر (اوروبا من الثورة الفرنسية الى الحرب العالمية الثانية)، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، دون تاريخ.

١٩. د. رمضان عبدالعظيم: تاريخ اوروبا والعالم الحديث، الجزء الثالث، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٩٧.

٢٠. د. عبدالقادر يوسف الجبوري: التاريخ الاقتصادي، وزارة تعليم العالي والبحث العلمي، جامعة الموصل، ١٩٨٠.

٢١. عبدالفتاح حسن ابو عليه: تاريخ اوروبا الحديث والمعاصر، دار المريخ للنشر، سعودية، ٢٠٠٧.

٢٢. د. عبدالوهاب القيسي وآخرون: تاريخ العالم الحديث ١٩١٤-١٩٤٥، من مطبوعات وزارة تعليم العالي والبحث العلمي، جامعة الموصل، ١٩٨٣.

٢٣. علي حيدر سليمان: تاريخ المدنية الاوروبية الحديثة، بغداد، دون تاريخ.

٢٤. د. عمر عبدالعزيز و د. محمد علي القوزي: دراسات في تاريخ اوروبا الحديث والمعاصر، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٩٩.

٢٥. د. فاضل حسين و كاظم هاشم نعمة: التاريخ الاوروبي الحديث ١٨١٥-١٩٣٩، وزارة تعليم العالي والبحث العلمي، بغداد، ١٩٨٢.

٢٦. د. فرغلي علي تسن: تاريخ اوروبا الحديث والمعاصر، دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر، الاسكندرية، ٢٠٠٢.

٢٧. ليون تروتسكي: تاريخ الثورة الروسية، ترجمة اكرم ديري و الهيثم الايوبي، مؤسسة العربية للدراسات والنشر، الطبعة الثانية، ١٩٧٨.

٢٨. مايكل جي هوغان: نهاية حرب الباردة، ترجمة محمد اسامة قتلي، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٩٨.

٢٩. محمد محمد صالح و آخرون: الدول الكبري بين الحربين العالميتين ١٩١٤-١٩٤٥، وزارة تعليم العالي والبحث العلمي، جامعة بغداد، دون تاريخ.

٣٠. هـ. أ. فيشر: تاريخ اوروبا في العصر الحديث ١٧٨٩–١٩٥٠، تعريب احمد نجيب هاشم و ديع الضبع، القاهرة، ١٩٥٨.

٣١. هـ. ج. ويلز: موجز تاريخ العالم، ترجمة عبدالعزيز جاويد، القاهرة، ١٩٥٨.

٣٢. هينري ل. روبرتس: روسيا و امريكا، ترجمة شكري علاوي، المؤسسة الاهلية للطباعة والنشر، بيروت، دون تاريخ.


## دووەم: بە زمانی کوردی:


١. د. ئەحمەد نەقیب زادە: مێژووی دیپلۆماسی و پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان، وەرگێڕانی مستەفا مەعرووفی، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨.

٢. مایکل ماندلبووم: ئەو ئایدیایانەی دەستیان بەسەر جیهاندا گرت، وەرگێڕانی گۆران سەباح غەفوور، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٦.

٣. محەمەد ئیحسان: ململانێ نێودەوڵەتییەکان لە سەدەی بیستەمدا، وەرگێڕانی ئاسۆ کەریم و کامەران ئەحمەد، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠١.

## سێیەم: بە زمانی ئینگلیزی:

1. A. J. Grant: Outlines of European History, London & New York, 1981.
2. Arthur P. Watts: A History of Western Civilazation, vol.II, Hol and INC, New York, 1940.
3. Carlton J. H. Hayes: A Political and Cultural History of Modern Europe since 1830, vol.II, the MacMillan Copmany, New York, 1943.
4. Carlton J. H. Hayes and Charles Wolse Cole: History of Euorpe since 1500 to present day, Third Edition, MacMillan Company, New York, 1958.
5. Chales More: The Industrial Age 1750-1995, Second Edition, Longman, 1997.
6. Christopher Hollis: European History 1815-1914, London, 1929.
7. Ferdinand Schevills: A History of Europe from the Reformation to the Present day, New York, 1946.
8. Herman Ausubel: The Making of Modern Euorpe, New York, 1958.
9. J. A. R. Marriott: The Evolution of Modern 1453-1939, Third Edition, London, 1948.
10. John Spenser Bassett: A History of United Sates 1492-1938, Third Edition, the MacMillan Company, New York, 1954.
11. Wallace K. Ferguson and Geoffrey Bruun: A Sorvey of European Civilazation, New York, 1962.

**ولیامی دووەمی ئەڵمانیا**

**کوشتنی فێردیناند بەدەستی گەڤەرلۆ پرەنسیپ لە سەرایڤۆ، ١٩١٤**

ئۆرلاندۆی سەرۆك وەزیرانی ئیتالیا لەكاتی كۆنگرەی ئاشتیدا

وینستۆن چەرچڵ

هێرشـــــی فرۆکـــــە جەنگییەکانی هاوپـەیمانان بۆ سەر ئەڵمانیا

**وێرانکردنی بەرلین**

**بەدەستی هاوپەیمانان**

**لەسێدارەدانی سەرکردە دیارەکانی نازیزم لەلایەن سۆڤێتەوە**

نەخشەی ئەوروپا لە ساڵی ١٩١٤ و پێش جەنگی یەکەمی جیهانی

**نەخشەی ئەوروپا دوای جەنگی یەکەم ۱۹۱۹-۱۹۲۹**

**نەخشەی ئەوروپا ۱۹۲۲**

**نەخشەی دابەشکردنی ئەڵمانیا بەسەر رۆئاوا و رۆژهەلاتدا لە ساڵی ١٩٤٥**

**نەخشەی سەردەمی جەنگی سارد**

## نەخشەی سەردەمی جەنگی سارد لە ساڵی ١٩٦٢